# دووپشك

ئەنتۆنی هورویتس

وەرگێڕان: محەمەد شەهدی

ئەلێکس رایدر ٩٠ خوولەک کاتی لەبەردەستە
بۆئەوەی دونیا رزگار بکات

ناوی کتێب: **دووپشك**
نووسینی: **ئەنتۆنی هورویتس**
وەرگێڕان: **محەمەد شەهدی**
تایپ: **ئەوین شەهدی**
دەرهێنانی هونەری ناوەوە : خەلیل هیدایەت مام شێخ
بەرگ : ئاکار جەلیل کاکەوەیس
شوێنی چاپ : چاپخانەی رۆژهەلآت/هەولێر
نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم : ٢٠١١
نرخ (٥٠٠٠) دینار
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارەی سپاردن( ١١٧٨) ساڵی ٢٠١١

**لە بلآوکراوەکانی کتێبخانەی ئاوێر- ژمارە ( ٧٣ )**

# پیرست

## دووپشک

ئەنتۆنی هورویتس[1] لە پێنجەمین ئەرکی پێسپێردراوی پڕ لە کێشە و سەرسووڕهێنەری ئەلێکس رایدەردا[2] دەنووسێت:

– ئەم کتێبە زۆر لە بابەت و نادیارییەکان لەبارەی رابردووی ئەلێکس رایدەردا روون دەکاتەوە و چەند سەرسووڕمانی گەورە پێك دێت....
وەکوو هەمیشە لێکدانەوەکانی ئەنتۆنی بیٚ وێنەن.

– لە کتێبی دووپشکدا، سیلاحێك بەناوی شەمشێری نامەرئی[3] هەیە کە سەیروسەمەرە دێتەبەرچاو، بەلآم تا ئەو جێگەیەی کە من دەزانم ئەم تەکنەلۆژیایە بوونی هەیە و دەتوانیٚ لە هەر کاتێکدا کەڵکی لێوەربگیرێت. من ئەمەم لەخۆمەوە دروست نەکردووە، هەربۆیەشە کە زۆر مەترسیدار دێتەبەرچاو.

---

[1] - Anthony Horwitz

[2] - Alex Rider

[3] - مەبەست لە سیلاح یا چەکێکە کە نادیار و شاراوەیە و جگە لەو کەسەی کە بەکاری دێنیٚ، کەس لە بوون و چۆنییەتی ئاگادار نییە. (نادیار و شاراوە) لەم کتێبەدا بە شەمشێری نادیار ناوی دەبەین.

## هەوڵی بەر چاو

دوو دز کە سواری مۆتۆری ڤێسپا[٤] ٢٠٠ ببوون، لە کادانیان دابوو، نە قوربانییەکی باشیان هەڵبژاردبوو، نە شوێنێکی باش و نە بەیانی یەکشەممەیەکی باش لە مانگی سێپتەمبەردا.
واپێدەچوو هەموو ژیان لە پیازا ئێسمرالدا[٥]، لە مەودای چەند مایلی شاری ڤێنیز[٦]، کورت کراوەتەوە و پێکهاتووە. ڕێوڕەسمی کەنیسە ماوەیەکی کەم بوو کۆتایی پێهاتبوو و بنەماڵەکان بە یەکەوە لە ژێر خۆری روون بە هێواشی و دەست راوەشاندنەوە بەرێدا دەڕۆیشتن: دایەگەورەکان بە جلی رەش و کچ و کورەکان بە باشترین جلەکانیان کە هەیانبوو.
کافەتریاکان و مۆتەفرۆشەکان کرابوونەوە، مشتەرییەکانیان لە شەقام و پێش دوکانەکان کۆببونەوە. فەوارەیەکی زۆر گەورە ئاوی ساردی بەملاوبەولادا دەپرژاند. بۆتکەچییەکان خەریکی فرۆشتنی گوڵە وشککراوەکان و دەبدەبە و وێنەکانی سەردەمی کۆن و کاتژمێری قورمیشی و کیسەی دانەوێڵە بۆ سەدان کۆتر بوون کە گۆڕەپانیان پڕ کردبوو.
لەنێوانی ئەمانەدا، دە دوازدە منداڵی قووتابخانەیەکی ئینگلیزی دەبینران. دزەکان چەندە بێ شانس بوون کە یەکێ لەم منداڵانە ئەلێکس رایدەر بوو.

---

[4] - Vespa Scooter.
[5] - Piazza Esmeralda
[6] - Venice

سەرەتای سیپتەمبەر بوو. کەمتر لە مانگێک لە ڕووبەڕووبوونەوەی دواییـنجاری ئەلێکس لەگەڵ دامیان کرای[۷] لە فڕۆکەی سەرۆک کۆماری ئەمریکا تێدەپەڕی. ئەوە تەواوی ئەو بەسەرهاتە بوو کە ئەوی بۆ پاریس[۸] و ئەمستردام و لە کۆتاییدا بۆ فڕۆکەخانەی هیترۆ[۹] هێنابوو و بیست و پێنج موشەکی ناوەکی بەرەو لەناوبردنی جیهان هاویشتبوو. ئەلێکس توانیبووی ئەم موشەکانە لەناو ببات. کاتێک کرای مرد، ئەو لەناو فڕۆکەدا بوو و لە کۆتاییدا بە جەستە و ڕەشەهەڵگەڕاو و برینی جۆراوجۆر بۆ ماڵەوە ڕۆیشتبۆوە تا لەگەڵ دەم و چاوی ناخۆش و پڕ لە غەزەبی جەک ستاربرایت[۱۰] ڕووبەڕوو بێتەوە. جەک ماڵدار بوو و هەروەها ئاگاداری لەئەو دەکرد. وەکوو هەمیشە جەک نیگەرانی حاڵی ئەلێکس بوو.

– ناتوانی لەم بارودۆخەدا بەردەوام بی، ئەلێکس. تۆ هیچکات لە قووتابخانە نی. نیوەی وانەکانی هاوینەت لەدەست داوە، زۆربەی ڕۆژەکانی بەهاریش نەچوویتە قووتابخانە سەبارەت بەوەیکە لە کورنوال[۱۱] بووی و دوایـیش ئەم ئەکادمییە مەترسیدارەی پوینت بلانک[۱۲]. ئەگەر لەم ئیشەت بەردەوام بی، لە گشت وانەکان دەکەوی. ئەوکات دەتەوێ چی بکەی؟

– بەڵام خەتا لە من نییە .

جەک قسەکانی بڕی:

---

7 - Damian Cray
8 - Paris
9 - Amstertam
10 - Heathrow Airport
11 - Jack Starbright
12 - Cornwall

– دەزانم کە خەتا لە تۆ نییە، بەڵام منیش ئەرکی خۆم هەیە. بڕیارم داوە مامۆستایەکی تایبەتیت بۆ ماڵەوە بگرم بۆئەوەی باقی هاوین وانەکانت بخوێنی.
– بێشك سۆحبەتم لەگەڵ دەکەی!
– نا، بەهیچشێوەیەك سۆحبەتت لەگەڵ ناکەم. هێشتا ماوەیەك لە پشووی هاوینە ماوە. دەتوانی هەر لە ئێستاوە دەست پێبکەی.
ئەلێکس ناڕەزایەتی خۆی دەربڕی:
– مامۆستای ماڵەوەم ناوێ _
– ئەلێکس، بڕیار نییە کە تۆ هەڵیبژێری. بۆشم گرنگ نییە کە چ بیانویەك دێنیتەوە، ڕێگەی ڕاکردنیشت نییە!
ئەلێکس دەیویست قسەی لەگەڵ بکات، بەڵام لە دڵەوە دەیزانی کە حەق بە ئەوە. (ئێم ئای٦)[١٣] بۆ دیارنەمانە دورودرێژ و بەماوەکانی لە قووتابخانە ڕێگەنامەی پزیشکی پێدابوو، بەڵام مامۆستایانی قووتابخانە کەم و زۆر لێی دڵسارد ببوون. دوایین ڕاپۆرتی وانەیی قووتابخانە هەموو شتێکی تێدا شی کرابۆوە:
***ئەلێکس هێشتاش زۆربەی کاتەکانی لە دەرەوەی قووتابخانە دەگوزەرێنێت. ئەگەر بەردەوام بێت، ئەو دەبێ لە خێری دواناوەندی بگوزەرێ. لەگەڵ ئەوەیکە بواری پزیشکی ڕێگەی بۆ هاتنی قووتابخانە دەگرێت. ئەگەر زیاتر لەوە بەدوا کەوێ، ترسم لەوەیە کە بۆ هەمیشە لە خێری قووتابخانە بگوزەرێ.***
بەڵێ، بوارەکە ئەمە بوو. ئەلێکس پێشی لەوە گرتبوو کە گۆرانیبێژێکی شێتی مۆڵتی ملیۆنەر نیوەی جیهان وێران بکات و ئێستاش لە بەرامبەردا چی بەگیر کەوتووە؟ کاری بەردەوام و زیادە!
بە ورەیەکی خراپ دەستی بە وانە خوێندن کردبوو. بە تایبەت کە مامۆستای سەرماڵ کە جەك بۆی پەیدا کردبوو، یەکێ لە مامۆستایانی

---

13 - MI6

قووتابخانەی خۆی، یانی بروکلەند[١٤] بوو. هەڵبەت ئەلێکس راستەوخۆ لە پۆلی ئەودا نەیدەخوێند، بەمحاڵەشەوە هۆی شەرمەزاری بوو و حەزی نەدەکرد کەس ئاگاداری ئەم راستییە بێت. بەمحاڵەشەوە دەیوت کە مامۆستا چارلی گرێی[١٥] لە کاری خۆیدا لێهاتوو و مامۆستایەکی بەرچاوە. چارلی گرێی پیاوێکی گەنج و شایستە بوو. بە پایسکل دەهات و پاشتەرکی پایسکلەکەی پڕ لە کتێب بوو. ئەو لە بنەڕەتدا مامۆستای زانستی مرۆیی بوو، بەلاّم واپێدەچوو کە تێگەیشتوویی لەگشت وانەکاندا هەیە.

– چەند هەفتە زیاتر کاتمان نییە، بەلاّم ئەگەر بە باشی وانەکانت بخوێنی، لە پێشکەوتنت تووشی سەرسووڕمان دەبی. رۆژانە حەوت کاتژمێر وانەت پێدەڵێم. جگە لەمانە، ئەرکیماڵەوەشت دەبێت. تا کۆتایی پشووی هاوینە رەنگە رقت لە من بێت و لێم بێزار بی، بەلاّم لانیکەم ساڵی تازەی خوێندن لەگەڵ هاوپۆلەکانت دەست پێدەکەی.

ئەلێکس لە چارلی گرێی بێزار نەبوو. ئەوان بەخێرا و بێدەنگ دەستیان پێکرد. لە وانەی بیرکاری بەرەو مێژوو و لەوێ بۆ زانست و دوایی وانەکانی دیکە. لە رۆژانی پشووی کۆتایی هەفتەدا، مامۆستا گرێی پرسیاری تاقی کردنەوەی بە ئەلێکس دەدا و ئەلێکس هەستی بەوە کرد کە هەر رۆژە نمرەی باشتر وەردەگرێت. تا ئەوەیکە مامۆستا گرێی بە قسەکانی، ئەلێکسی تووشی سەرسووڕمان کرد.

– کار و توانات بەرچاو بووە، ئەلێکس. نەمدەویست ئەمەت پێبڵێم، بەلاّم دەمهەویّ ئەمە بزانم کە ئایا حەز دەکەی بۆ گەشتێك بێی کە قووتابییەکانی دیکەش لەگەڵمانن؟

– بۆکویّ دەچن؟

---

[14] - Brookland.

[15] - Charlie Grey.

- پارساڵ بۆ پاریس چووین، ساڵی پێشووتریش بۆ رۆما[١٦] چووبووین. دەچین و سەردانی مۆزەکان، کەنیسەکان و شوێنە دێرینەکان دەکەین. بەڵام دەمانەوێ ئەمساڵ بۆ ڤێنیز بچین. حەز دەکەی لەگەڵمان بێی؟
ڤێنیز.
ماوەیەکی زۆر بوو ئەلێکس بیری لە ڤێنیز دەکردەوە. رێک لەو کاتەوە کە دامیان کاری مردبوو. یاسین گرگورووڤیچ[١٧] لەوێ بوو. هەمان پیاوکوژە رووسییە کە پەردەی لەسەر زۆربەی بوارەکانی ژیانی ئەلێکس هەڵگرتبوو. یاسین بەرەو مەوت دەچوو. گوللەیەکی بە سینگی کەوتبوو، بەڵام رێک لە کاتی پێش مردنی نهێنییەکی بۆ ئەلێکس ئاشکرا کردبوو کە بۆ ماوەی چواردە ساڵ لە خۆیدا هێشتبوویەوە.
باوک و دایکی ئەلێکس ماوەیەکی کەم دوای لەدایک بوونی ئەلێکس مردبوون. مامی، ئیان رایدەر[١٨] ئەرکی گەورەکردنی ئەوی بەئەستۆوە گرتبوو. لە سەرەتای هەمان ساڵدا مامیشی بەهۆی رووداوێکی شوفێری مردبوو. ئەلێکس لەوەیکە زانیبووی مامی سیخوڕ و مەئمورێکی شاراوە بووە و لە مەئمورەیەتێک لە کورنوال کوژراوە، تووشی سەرسوورمان ببوو. لەمکاتە دابوو کە "ئیم ئای٦" هاتە ئاراوە. ئەوان لە رێگەیەکەوە توانیبویان ئەلێکس رایدەر بۆ لای خۆیان رابکێشن و بیکەن بە پیاوی خۆیان و لەم رۆژە بەدواوە ئەلێکس رایدەر ئیشی بۆ دەکردن.
ئەلێکس زانیارییەکی زۆری لەبارەی باوک و دایکی، جۆن[١٩] و هێلێن[٢٠] رایدەر نەبوو. بەڵام وێنەیەکی دایک و باوکی لە ژوورەکەی هەڵواسیبوو. باوکی مووی سەری کوورت بوو و لە تەنیشت دایکی بە بزەیەکی سەر لێوانی، وەستابوو. باوکی ئەلێکس لە سوپادا خزمەتی دەکرد و هێشتاش

---

16 - Rome
17 - Yassen Gregorovich
18 - Ian Rider
19 - John
20 - Helen

شێوە و قەڵافەتی وەکوو سەربازەکان بوو. دایکی ئەلێکس نێرس بوو و لە رادیۆلۆژییەکدا ئیشی دەکرد. بەڵام ئەوان بۆ ئەلێکس غەریبە بوون، هیچ شتێکیانی وەبیر نەدەهاتەوە. ئەو هێشتا منداڵێکی بچووك بوو کە باوك و دایکی مردبوون. ئەوان لە ڕووداوێکی فڕۆکەدا گیانی خۆیان لەدەست دابوو و لانیکەم ئەمەیان بۆ ئەلێکس گێڕابۆوە.

بەڵام ئێستا ئەلێکس دەیزانی کە بوارەکە شتێکی دیکە بووە.

ڕووداوی هەوایی بەم رادەیە درۆ بوو کە پێیان وتبوو مامی لە ڕووداوێکی ئوتۆمبێلدا گیانی لەدەست داوە. یاسین گرگورویچ لەناو فڕۆکەی ئایر فۆرس وان[21] هەموو شتێکی پێ وتبوو. باوکی ئەلێکس پیاوکوژێکی پیشەگەر بوو، رێك وەکوو یاسین. ئەم دووە بەیەکەوە کاریان دەکرد. جۆن رایدەر جارێك گیانی یاسینی رزگار کردبوو، بەڵام دواتر خۆی بەدەست پیاوانی (ئێم ئای٦) کوژرابوو – هەمان ئەو کەسانەی کە سێ جار ئەلێکس رایدەریان ناچار کردبوو ئیشیان بۆ بکات، یانی ئەمانەی کە درۆیان لەگەڵ کردبوو، دەسەڵاتیان بەسەر ئەلێکسدا پەیدا کردبوو و کاتێك کە کارەکەیان تەواو بوو، ئەویان وەلا نابوو. ئیتر باوەڕکردنی دژوار بوو، بەڵام یاسین ڕێگەیەکی پێ پێشنیار کردبوو بۆئەوەی ڕاستییەکان بدۆزێتەوە.

*بۆ ڤێنیز بچوو و دووپشك بدۆزەوە. ئەوکات چارەنووسی خۆت دەدۆزییەوە....*

ئەلێکس دەبوایە بزانێ کە چواردە ساڵ پێش چی ڕوویداوە. ئاشکرابوونی راستییەکان لەبارەی جۆن رایدەر بە مانای دۆزینەوەی ڕاستییەکان لەبارەی خۆیشیدا بوو. چونکە ئەگەر باوکی بەهۆی بەدەستهێنانی پارە خەڵکی دەکوشت، دەیتوانی چ جۆرە مرۆڤێك بێت. ئەلێکس توورە، نارەحەت و تێکچوو بوو. دەبوایە ئەم دووپشکە

21 - Air Force One

بدۆزێـــتەوە هــەر کەســێك بێــت. دوویشــك دەبوایــە هەرشــتێك لــەبارەی بنەماڵەکەی دەزانێت، ئەوا پێی بڵێت.
گەشتی قووتابخانەیی بۆ ڤێنیز لەمە باشتر نەدەبوو. جەکیش ڕێگەی لە ڕۆیشتنی نەگرت. لە ڕاستیدا، تەنانەت ئەوی بۆ ڕۆیشتن بۆ ئەم گەشتە هانیش دا.
– ئەمە ڕێك ئەم شتەیە کە پێویستیت پێیە، ئەلێکس. هەلێکی باشە کە لەگەڵ هاوڕێکانت بی، ڕێك وەکوو قووتابییەکی ڕاستەقینە.
ئەلێکس هیچی نەوت، ئەو لەوەیکە درۆ لەگەڵ جەك بکات بێزار بوو، بەڵام بەهیچشێوە نەیدەتوانی ڕاستییەکانی پێ بڵێت. جەك هیچکات باوکی نەدیتبوو. ئەم بەسەرهاتە هیچ پەیوەندییەکی بە ئەو نەبوو.
جەك یارمەتی ئەلێکسی دا تا جانتای سەفەری ببەستێ. ئەم گەشتەی ئەلێکس پەیوەندییەکی ئەوتۆی لەگەڵ کەنیسە و مۆزەخانەوە نەبوو. ئەو دەیویست لەم هەلە سوود وەربگرێت، شاری ڤێنیز بگەڕێت و زانیاری بەدەست بێنێ. پێنج ڕۆژ ماوەیەکی زۆر نەبوو، بەڵام دەیتوانی خاڵی دەسپێك بێت. پێنج ڕۆژ لە ڤێنیز، پێنج ڕۆژ بۆ دۆزینەوەی ***دوویشك***.
ئیستا ئەو لە گۆڕەپانێکی ئیتاڵیدا وەستابوو. سێ ڕۆژی گەشتەکە کۆتایی پێهاتبوو و هیچی نەدۆزیبۆوە.
– ئەلێکس، حەز دەکەی مۆتەیەك بخۆی؟
– نا، سوپاست دەکەم؟
– من کە گەرمامە. دەمەوێ یەکێ لەو شتانەی کە باست کرد، بیکڕم. ناوی چی بوو؟ گرانادا[٢٢]؟
ئەلێکس لای کوڕێکی چواردە ساڵەی دیکە وەستابوو. ئەو یەکێ لە باشترین و نزیکترین هاوڕێی لە قووتابخانەی بروکلەند بوو. ئەو لەوەیکە بیستبووی تام هریس[٢٣]یش لەم گەشتەدا بەشداری کردووە، تووشی

---

[22] - Granada
[23] Tom Harris

سەرسوورمان ببوو. چونکە تام حەزی لە مێژوو و هونەر نەبوو. تام حەزی لە هیچ بابەتێکی وانەیی قووتابخانە نەبوو و لە گشت وانەکان کەمترین دەرەجەی وەردەگرت. بەڵام خاڵی جێگەی باس لە بارەی تام ئەوە بوو کە بایەخی بە هیچ شتێك نەدەدا. ئەو بەردەوام شاد و دەم بە پێکەنین بوو و تەنانەت مامۆستایان پێیانوابوو کە لەگەڵ ئەو خۆشی دەگوزەرێنن.

بەڵام تام لە گۆڕەپانی وەرزشیدا قەرەبووی کەموکوڕییەکانی وانەکانی دەکردەوە. ئەو کاپتنی تیپی قووتابخانەکەی بوو و لە یارییەکاندا رکابەری سەرەکی ئەلێکس بوو. ئەو توانیبووی لە رکابەرییەکانی راکردنی بەربەستی چوارسەد مەتر و هاویشتنی نێزە لە ئەلێکس بباتەوە. تام بەپێی تەمەنی کورتەباڵا بوو و پرچی رەش و چاوی شین بوو. ئەگەر کوشتبات ئامادە نەبوو بۆ مۆزەخانە بچێت. بەم پێیەوە، ئەو لێرە چی دەکرد. بەڵام ئەلێکس زۆر بە خێرایی و زوو هۆکارەکای زانی. باوك و دایکی تام خەریکی جیابوونەوە بوون و ئەویان بۆ ئەم گەشتە ناردبوو تا ئاگای لە کێشەکانیان نەبێت.

ئەلێکس وتی:

– ناوی گرانیتا[٢٤]یە.

ئەو هەرکات بۆ ئیتاڵیا دەهات، داوای گرانیتای دەکرد: بەفری وردکراو لەگەڵ ئاوی لیمۆی تازە. شتێکی وەکوو مۆتە و خواردنەوەیکی غازدار بوو. هیچ شتێك لە جیهاندا وەکوو گرانیتا فێنککەرەوە و خۆش نییە.

– زۆر باشە، داوای دانەیەکیانم بۆ بکە. کاتێك بە زمانی ئیتاڵی داوا لە کەسێك دەکەم، بەجۆرێك سەیرم دەکەن کە هەر دەڵێی شێتم.

لەڕاستیدا، ئەلێکس زیاتر لە چەند وشەی بە زمانی ئیتاڵی نەدەزانی. زمانی ئیتاڵی لەو زمانانە بوو کە ئیان رایدەر فێری نەکردبوو. بەم حاڵەشەوە، لەگەڵ تام بۆ دوکانێك رۆیشتن و ئەو داوای گرانیتای کرد.

---

24 - Granita

یەکێ بۆ تام و یەکێکیش لەسەر داواکاری تام بۆخۆی. تام پارەیەکی زۆری هەبوو. باوك و دایکی بەر لەم گەشتە پارەیەکی زۆریان پێدابوو.
تام پرسی:
- ئەم کۆرسە بۆ قووتابخانە دێی؟
ئەلێکس شانەکانی هەڵاویشت:
- بێشك.
- کۆرسی پێشوو کەمتر بۆ قووتابخانە هاتی. کۆرسی پێشتریش هەر بەم شێوەیە.
- نەخۆش بووم.
تام سەری داخست. چاویلکەی دژەهەتاوی لێدابوو کە لە فرۆکەخانەی هیترۆ کڕیبووی. بۆ رووخساری زۆر گەورە بوو و تا سەر لووتی هاتبووە خوارێ.
- تۆ باشتر لە هەر کەسێك دەزانی کە بڕوا بە قسەکانت ناکەن.
- بۆچی بڕوا ناکەن؟
- چونکە کەس ئەوەندە نەخۆش نابێ. ئەگەری ئەوە نییە. پروپاگەندەت لە دوایە کە تۆ دزی.
- چی؟
- هۆیەکەی ئەوەیە کە بەم شێوەیە دووری لە قووتابخانە دەکەی. رەنگە کێشەت لەگەڵ پۆلیس هەبێ.
- بەڕاستی ئەتۆ ئاوا بیر دەکەیتەوە؟
- نا، بەڵام خاتوو بێدفۆرشایر(٢٥) لەبارەی تۆدا پرسیاری لێکردم. ئەو دەزانێ کە هاوڕێی یەکترین. وتی جارێك شتێکت دزیوە و تووشی کێشە بوویە و ئێستا سەردانی دەروونناسێك دەکەی کە بەشێوەی دەروون دەرمانی چارەسەر بکرێی.
- دەروون دەرمانی؟

---

25 - Bedfordshire

- بەڵێ، ئەو بۆتۆ زۆر بەپەرۆشە و لەخەمت دایە. دەڵێت هۆیەکەی ئەوەیە کە زۆر بەکەمی بۆ قووتابخانە دێی.
خاتوو جین بێدفۆرشایر سکرتێری قووتابخانە بوو. ژنێکی جوان بوو کە قۆناغی بیست ساڵی تێدەپەڕاند. ئەویش بۆ ئەم گەشتە هاتبوو. ئەمە کارێك بوو کە هەموو ساڵێ دەیکرد. ئێستا ئەلێکس ئەوی بینی کە لەملای دیکەی شەقام وەستاوە و قسە لەگەڵ مامۆستا گرێی دەکات.
کاتژمێر ساعەت دوازدەی راگەیاند. تا نیو کاتژمێری دیکە دەبوایە لە هۆتێل خواردنی نیوەڕۆیان دخوارد. قووتابخانەی بروکلەند قووتابخانەیەکی ئاسایی لە رۆژئاوای لەندەن بوو ئەوان بۆ ئەوەی خەرج و مەسرەف کەم بکەنەوە لە هوتێلێکی دەرەوەی شاری ڤێنیز جێگەیان گرتبوو. مامۆستا گرێی هوتێلیکی لە شارۆچکەی سان لۆرنزۆ[26]، لە مەودای دە خوولەکی لەگەڵ وێسگەی شەمەندەفەر، هەڵبژاردبوو. ئەوان هەموو رۆژێ بەیانی زوو دەچوونە وێسگە و دوایی بە پاسێکی شین بۆ ناوەندی شار دەچوون. بەڵام ئەمڕۆ بەرنامە جیاواز بوو. رۆژی یەکشەممە بوو و ئەوان بەیانیان کردبوو بە پشوو.
تام دووبارە ویستی قسە بکات.
- بەم پێیەوە _
بەڵام قسەکەی پچڕا؟ رووداوێك بە خێرایی روویدابوو، بەڵام ئەوان هەر دوو دیتبوویان.
لە لایەکەی دیکەی گۆرەپان مۆتۆرسکلیتێك، مۆتۆڕێکی وێسپا ٢٠٠سی سی کە نوێ دەهاتەبەرچاو، لەکاتێکدا دوو پیاو سواری ببوون، بینران. هەردوو پانتۆڵی جین و تیشەرتی قۆڵ کورتیان لەبەر بوو. ئەو کەسەی کە لە پاشکۆی مۆتۆڕ سوار ببوو، کڵاوێکی لەسەر بوو بۆئەوەی لەکاتی رووداو یا بەربوونەوە و کەوتنەخوار، پارێزگاری لێبکات. بەڵام شوفێرەکە چاویلکەیەکی لەچاو بوو و بە خێرایی بۆلای خاتوو بێدفۆردشایر دەچوو.

26 - San Lorenzo

واپێدەچوو دەیهەوێ وەبەری بدات. بەڵام رێک لەوکاتە کە دەیویست ئەم رووداوە روو بدات، مۆتۆرسوار بە مانۆرێکی خێرا لە تەنیشت خاتوو بێدفۆردشایر تێپەڕی و لەمکاتەدا پیاوەکەی کە لە پاشکۆی مۆتۆڕەکە دانیشتبوو، بەخێرایی جانتاکەی دزی. بەجۆرێك ئەمکارەیان بە لێهاتوویی بەڕێوەبردبوو کە ئەلێکس پێیزانی کە بێشك ئەمانە لەمکارەدا لێهاتوو و پیشەگەرن.

چەند کەس لە قووتابیانیش ئەم رووداوەیان بینیبوو. یەك دوو قووتابی بە ئیشارە مۆتۆرسوار و رووداوەکەیان بە بەیەکتر نیشان دەدا. بەڵام هیچ کارێکیان لەدەست نەدەهات. مۆتۆرسوارەکان پێشاوپێش ویستی راکردنیان هەبوو و دەیانویست شوێنی رووداوەکە جێبهێڵن.

شوفێری مۆتۆڕەکە سەری تا نزیك سوکان هێنابووە خوارێ و ئەوەی لە پاشکۆی مۆتۆڕ دانیشتبوو، جانتای چەرمی لەسەر کۆشی دانابوو. ئێستا مۆتۆرسوارەکان لەم شوێنە نزیك دەبوونەوە کە ئەلێکس و تام لەوێ وەستابوون. ماوەیەك لەمەوپێش خەڵکانێکی جۆراوجۆر لە گۆڕپانەکە دەبینران، بەڵام ئێستا کەسێکی ئەوتۆی لێنەبوو و ئەمکارە راکردنی دزەکانی ئاسانتر دەکرد.

تام دەیقیژاند:

– ئەلێکس!

– لەدواوە بوەستە.

ئەلێکس بیری لەوە کردەوە رێگە لە رۆیشتنی وێسپا بگرێت، بەڵام بێ سوود بوو. شوفێر زۆر بە ئاسانی دەیتوانی بسوورێتەوە و ئەگەر مۆتۆر بە ئەلێکس کەوتبا، سەداسەد دەبوایە ئەم کۆرسەش لە نەخۆشخانە کەوتبا. مۆتۆری وێسپا خێراییەکەی نزیك بە بیست مایل لە کاتژمێردا بوو. ئەلێکس بێشك نەیدەویست لەپێش مۆتۆڕسوارەکان بوەستێ.

ئەلێکس سەیری دەوروبەری خۆی کرد و بیری لەوە کردەوە کە ئایا دەتوانێ شتێك بۆلای مۆتۆرسوارەکان بهاوێ. تۆڕێك، ستڵێکی ئاو. بەڵام تۆڕی لێنەبوو و فەوارەکەش لەوی دوور بوو. بەڵام ستڵی لێبوو.

مۆتۆڕەکە بیست مەترێکی لێ دوور بوو و خێراییەکەشی زیاتر دەبوو. ئەلێکس بە جووڵەیەکی خێرا سەتڵی دووکانێکی گوڵفرۆشی هەڵگرت و گوڵە وشکەکانی ناو سەتڵەکەی ڕژاندە ناو شەقام و خێرا سەتڵەکەی لە دانەوێڵەی دوکانەکەی تەنیشت پڕ کرد. خاوەنی دوکانەکان بەسەر ئەلێکسدا دەیانقیژاند. بەڵام ئەلێکس گوێی نەدەدانێ. لەمکاتەدا، مۆتۆری وێسپا گەیشتە تەنیشت ئەلێکس. ئەلێکس بە جووڵەیەکی توند دانەوێڵەکانی بەسەر مۆتۆڕسوارەکاندا پڕژاند. تام بە سەرسووڕمانەوە سەیری دەکرد. بیری لەوە کردەوە کە ئەگەر ئەلێکس پێیوایە دانەوێڵەکان دەتوانن پێش لە مۆتۆڕسوارەکان بگرێت، ئەوا لە هەڵەدایە. مۆتۆڕسوارەکانیش ڕێگەی خۆیان دەگرت و رایاندەکرد.
بەڵام ئەلێکس پلانێکی دیکەی هەبوو.
دووسەد تا سێ سەد کۆتر کە لەناو گۆڕەپانەکەدا بوون، پڕژانی دانەوێڵەیان بەسەر دەم و چاوی مۆتۆڕسوارەکان بینیبوو. دانەوێڵەکان بەسەر سەر و دەم و چاو و جلی مۆتۆڕسوارەکاندا بڵاو ببۆوە.
لەناکاو دزەکان بۆ کۆترەکان بوونە سەرچاوەی خۆراك. کۆترەکان لە هەرلاوە ڕژانە سەر دەم و چاوی مۆتۆڕسوارەکان. کۆترێك کەوتە سەر ڕووخساری مۆتۆڕسوارەکە و کۆترەکانی دیکە سەر شان و قۆڵ و ... بۆئەوەی دانەوێڵەکان لەناو پرچ و جلەکانی هەڵگرنەوە. کۆترێکی دیکە لەسەر قورگی نیشتبوو. چەند کۆترێکیش کەوتنە سەر دزەکەی دیکە و دنوکیان لە دانەوێڵەکان دەدا. بەرەبەرە ژمارەی کۆترەکان زیاتر دەبوو. نزیك بە بیست کۆتر کەوتبوونە سەر و شانی مۆتۆڕسوارەکان.
شوفێری مۆتۆڕ چاوی هیچ کوێیەکی نەدەبینی. بە دەستێك سوکانی مۆتۆڕی گرتبوو و بە دەستی دیکەی هەوڵی دەدا کۆترەکان لەخۆی دوور بخاتەوە. مۆتۆڕەکە ئێستا بە تەواوی سووڕابوو و بۆلای ئەلێکس دەهات. ئەوەندەی نەمابوو مۆتۆڕەکە بەسەر ئەلێکسدا تێپەڕێت، بەڵام ڕێك لەم کاتەدا مۆتۆڕەکە ڕێگەی خۆی گۆڕی و بۆلای فەوارەی ناوەڕاستی گۆڕەپان بەڕێکەوت. دوو مۆتۆڕسوار هێشتا لەلایەن کۆترەکانەوە دەورە

درابوون و بە تەواوی شاردرابوونەوە. تایەی پێشەوەی وەلێوی فەوارەکە کەوت و مۆتۆڕەکە کەوتە خوارەوە و هەردوو دزەکان بەرەو هەوا هەڵدێران. ئەو دزەی کە لە پاشکۆی مۆتۆڕەکە دانیشتبوو بەر لەوەی بکەوێتە ناو ئاوەکە، جانتاکەی لەدەست کەوت. جانتاکە لە هەوادا تەقڵەیەکی لێدا و ئەلێکس کە لە چەند شەقاوی جانتاکە بوو، خێرا گرتییەوە.

دواتر هەموو شت کۆتایی پێهات. هەردوو دزەکە کەوتنە ناو ئاوی سارد. مۆتۆری وێسپا بە خرابوویی کەوتبووە خوارێ. دوو پۆلیس کە لە دوایین کاتدا هاتبوونە ناو گۆڕەپان، بۆلای دزەکان رایاندەکرد. خاوەنی بۆتکەکان پێدەکەنین و چەپڵەیان لێدەدا. تام بە سەرسووڕمانەوە سەیری ئەم رووداوەی دەکرد. ئەلێکس بۆلای خاتوو بێدفۆردشایر رۆیشت و جانتاکەی دایەوە.

- وابزانم ئی تۆیە.
- ئەلێکس.....

زمانی خاتوو بێدفۆردشایر وەستابوو.

- چۆن.....؟
- ئەمە ئەو وانەیە کە لە ماوەی دەروون دەرمانیدا فێری بووم.

ئەلێکس ئەمەی وت و گەڕایەوە ناو هاورێیەکانی.

## کۆشکی بێوەژن

مامۆستا گرێی روو بە منداڵەکان وتی:
- ناوی ئەم بینایە پلازو کونتارینی دل بوولو[27]یە. بوولو بە زمانی ڤێنیزی بە مانای پێستە شەیتانۆکەیە و هەر ئەمجۆرەی کە دەبینن ئەم پەیژە جوان و سەرسووڕهێنەرە بە وێنەی قالبی شەیتانۆکەیە.
تام هریس باوێشکێکی هاتێ.
- ئەگەر ئەم کۆشکە، یا مۆزەیەك، یا کاناڵێکی دیکە ببینم، خۆم لە پاسێکەوە دەخەمە خوارەوە.
ئەلێکس وەبیری هێنایەوە:
- ڤێنیز پاسی لێ نییە.
- کەواتە خۆم دەخەمە ژێر پاسە شینەکە. ئەگەر پێم نەکەوێت، رەنگە بەخت یاوەرم بێت و بخنکێم. دەزانی کێشەی ئێرە چییە؟ وەکوو مۆزەخانەیەك دەچێ. هەست دەکەم نیوەی تەمەنم لێرەدا بەفیڕۆ چووە.
- بەیانی دەڕۆین.
- ئامادە نیم تەنانەت رۆژێکیش لێرە بمێنمەوە.
ئەلێکس بڕیاری تامی بە دڵ بوو. پێشتر بۆ شوێنێکی وەکوو ڤێنیز نەچووبوو. یانی لە هەموو دونیادا شارێکی وەکوو ڤێنیزی تێدا نییە. شەقامەکانی باریك و کاناڵەکانی تاریك و پڕ پێچاوپێچە. هەر بینایەکت کە دەبینی، وا پێدەچوو کە بۆ سەلماندنی جوانییەکەی دەیهەوێ رکابەری بیناکەی تەنیشتی بکات. هەر هەنگاوێکی دەنێیەوە، چوار سەدە پێشترت

---

27 - Plazzo Contarini del Bovolo

نیشان دەدات و هەر قوژبن و قولنچکێکی ئەم شارە بە سەرسووڕمانەوە کۆتایی پێدێت. ڕەنگە بازاڕ یا قەیسەرییەکی ئاسایی کە خوێناو لە گۆشتی مالآت دەڕژایە عەرد و یا کەنیسەیەك کە بە ئاو دەورە دراوە، ئەویش لە هەر چوار لاوە. هۆتێلێکی گەورە یا ڕێستۆرانتێکی بچووك. تەنانەت هونەریان لە خۆیان نیشان دەدا، شووشەی ڕەنگاورەنگ، گوڵدانی شووشەیی، ئەشیای کۆن و کۆنەوار. مۆزەیەك بوو، ڕەنگە مۆزەیەکی بەڕاستی زیندوو.

بەلآم ئەلێکس درکی بە هەستی تام کرد. دوای تێپەڕبوونی چوار ڕۆژ تەنانەت ئەویش هەستی بەوە دەکرد ئیتر بەسە و دەبێ کۆتایی پێبێت. پەیکەری زۆر، کەنیسەی زۆر، کاشی زۆر و توریست و گەشتیارێکی زۆر کە لەژێر هەتاو وەستاون. ئەویش وەکوو تام هەستی بە بێ حەوسەلەیی دەکرد.

بەلآم ئەی دووپشك چی لێدەهاتەوە؟

کێشەکە لەوە دابوو کە ئەو ئەسڵەن نەیدەزانی مەبەستی یاسین گرگورووویچ چی بوو. دووپشك دەیتوانی ناوی کەسێك بێ. ئەلێکس سەیری کتێبی ڕێنوێنی تەلەفۆنی کردبوو و ناوی چواردە کەسی بینیبوو کە بەم ناوە لە شوێنە جیاجیاکانی شاری ڤێنیز نیشتەجێنە. دەیتوانی ناوی بازرگانیەتێك بێت. یا ناوی بینایەك. ئێستا لە ڕۆژی چوارەم و نزیك بە کۆتایی گەشتەکەیان، ئەلێکس دەیبینی کە هەر لەسەرەتای دەسپێکی کار هیچ هیوایەکی لە بەدەست هێنانی زانیاری لەسەر ئەم بوارەی نەبوو. ئەگەر یاسین ڕاستی وتبێ، ئەو و جۆن ڕایدەر مرۆڤکوژی خیبرە و پیشەگەر بوونە. ئایا ئەوان ئیشیان بۆ دووپشك کردووە؟ کەواتە دووپشك دەبێ لەناو یەکێك لەم کۆشکە کۆنانە خۆی شاردبێتەوە. ئەلێکس دووبارە سەیری ئەو پەیژەیەی کرد کە مامۆستا گرێی لەبارەیدا دەدوا. ڕەنگە ئەم پەیژەیە بەجۆرێك گەیشتبایە دووپشکەوە. دووپشك دەیتوانی لەهەر شوێنێك بێت و ئێستا دوای چوار ڕۆژ مانەوە لە ڤێنیز هیچی بەدەست نەکەوتووە.

مامۆستا گرێی رایگەیاند:

- ئێستا لە رێگەی فریزێریا[٢٨] بۆ لای گۆرەپانی سەرەکی دەچین. لەوێ بابۆڵەیك دەخۆین و دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ سەردانی سەن مارك باسیلیکا[٢٩] دەکەین و ئەوێ دەبینین.

تام ئاخێکی هەڵکێشا:

- چ باشتر! دیسان کەنیسەیەکی دیکە!

بەڕیکەوتن. دوازدە قووتابی لەگەڵ مامۆستا گرێی و خاتوو بێدفۆردشایر کە لە پێشەوە دەڕۆیشتن.

ئەلێکس و تام لە پشت سەری ئەوانیتر بەڕێکەوتن و دیاربوو کە حەوسەلەی ئەم گەشتەیان نەماوە. تەنیا رۆژێك لە گەشتەکەیان مابوو و تامیش بە روونی وتبووی کە تەنانەت رۆژێکیش بۆ ئەو زۆرە. بەلام ئەو لەگەڵ ئەوانیتر بۆ لەندەن نەدەگەڕایەوە. ئەو برایەکی گەورەتر لەخۆی هەبوو کە لە ناپل[٣٠] دەژیا و دەیویست چەند رۆژی ماوەی پشووی هاوینە لە ناپل لەگەڵ ئەو بگوزەرێنێ. بۆ ئەلێکس کۆتایی گەشت بەمانای دۆڕانێکی گەورە بوو.

رێك لەم کاتەدا بوو کە چاوی پێکەوت. رووناکییەکی رەنگ سیلقەری (رەنگی رەساسی - زێوین) لەژێر کاریگەری خۆر لەچاوی دەدایەوە. سەری وەرگێڕا. شتێ نەبوو. یەکێ لە کاناڵەکان بوو کە بۆ لایەك دەکێشرا. بەلەمێکی مۆتۆڕی لەژێر پردەکە تێدەپەڕی. کەنیسەیەك لەسەرووی بینا سوورەکان دەبینرا. رەنگە شتێکی بە هزریدا هاتبێت.

بەلام ئێستا بەلەمە مۆتۆڕییەکە دەورێکی لێدا و گەڕایەوە و ئەلێکس بۆ جاری دووهەم چاوی پێکەوت. لەتەنیشت بەلەمەکە دووپشکێکی رەنگ

---

[28] - Frezzeria

[29] - St Mark,s Basilica

[30] - Naples

ڕەساسی کوترابوو. ئەلێکس سەیرێکی بەلەمەکەی کرد کە ئێستا چوبووە ناو کاناڵێکی دیکە. بەلەمێکی گشتیی و تایبەت بە هاتووچۆی گەشتیاران نەبوو. بەلەمێکی تایبەتی بوو کە شووشەکانی بە پەردە ڕازێندرابۆوە و کورسییەکانی لە چەرم بوون. دوو کەس بە کۆت و پانتۆڵی ڕەنگ سپی لە ناو بەلەمەکەدا ئیشیان دەکرد. یەکێکیان لەپشت سوکان دانیشتبوو و ئەویتریان بە خواردنەوە میوانداری لە تاکە گەشتیاری ناو بەلەمەکە دەکرد کە ژن بوو و زۆر بە ڕێکی دانیشتبوو و سەیری پێش خۆی دەکرد. ئەلێکس هەر ئەوەندەی لێزانی کە پرچی ڕەشە و لووتێکی قوتی هەیە. ڕووخساری هیچ تایبەتمەندییەکی ئەوتۆی نیشان نەدەدا. دوای ماوەیەکی کوورت، بەلەمەکە کۆتایی بە سوڕانەوە هێنا و لەبەرچاوان ون بوو.

دووپشکێك کە تەنیشت بەلەمێکی ڕازاندبۆوە.

دووپشك.

ئەلێکس بیری لەوە کردەوە کە بەلەمەکە بۆ کوێ دەچێ. واپێدەچوو دووپشکی ڕەساسیان بۆ ئەو ناردبێ تا ئەو شتەی کە دەیهەوێ، بیدۆزێتەوە.

بەڵام شتێکی دیکەش بوو. ئەو هێوریيەی کە ئەم ژنە هەیبوو. چۆن دەکرێ کەسێك لەم شارەدا هاتووچۆ بکات و هیچ هەستێك و حەزبەدیتنێ لەخۆی نیشان نەدات؟ تەنانەت سەریشی بۆ هیچ لایەك نەسووڕێنێ؟ ئەلێکس وەبیر یاسین گرگوروویچ کەوتەوە. ئەویش ئەمجۆرە بوو. ئەو و ئەم ژنە زۆر بە یەك دەچوون.

ئەلێکس ڕووی بۆ لای تام وەرگێڕا؟

- ئاگات لەمن بێت.
- چی ڕووی داوە؟
- پێیان بڵێ تێکچووم و بۆ هوتێل گەڕامەوە.
- بۆ کوێ دەچی؟
- دوایی بۆتی دەگێڕمەوە؟

ئەمەی وت و لەناکاو لەناو ریستۆرانت و کۆنەوارەفرۆشەکاندا خۆی ون کرد. دەیویست هەرچۆنێك بێ بەلەمەکە بدۆزێتەوە.
بەلام دوای ماوەیەکی کورت بەم ئەنجامە گەیشت کە لەگەڵ کێشەیەك رووبەڕوو بووەتەوە.
شاری ڤێنیز لەسەر زیاتر لە ١٠٠ دوورگە بینا کراوە. ئەوە لە لایەن مامۆستا گریی لە کاتی هاتنیان بۆ ئەم شارە ئاگادارکرابوونەوە و پێیان وترابوو. پێشان ئەم شوێنە ئاو و قوڕ و لیتاو بووە و هەر بۆیەش هیچ جاددەیەکی لێنەبوو. تەنیا ئاوەڕێ و پارچە زەوییەکانیش بەشێوەی پرد لەناو شار دەبینران. ژنی ناوبراو لەسەر ئاو بوو و ئەلێکس لەسەر وشکایی. بەدواکەوتنی ئەو وەکوو گەڕان لە شوێنێکی پێچاوپێچی ئاوێنەیی بوو کە ڕێگەکانی هیچکات بە یەك نەدەگەیشتن.
ئەو ئێستاش ژنەکەی ون کردبوو. ئەو کۆڵانەی کە ئەلێکس هەڵیبژاردبوو، دەبوایە ڕێك بڕوات، بەلام لەناکاو پێچێکی خوارد و ئلێکسی بردە بەردەم چەند بینای زۆر بەرز. ئەلێکس بە خێرایی سووڕایەوە. دوو ژنی ئیتالی بە جلی رەشەوە لەسەر دوو چوارپایە لەوێ دانیشتبوون. کاناڵێکی لەپێش بوو، بەلام بەتاڵ بوو. چەند پەیژەی بەردین ئەوی دەگەیاندە ئاوەکە، بەلام ئەگەری چوونە پێشی نەبوو، مەگەر ئەوەیکە بیهەوی مەلەی بکات.
ئەلێکس سەیری لای چەپی خۆی کرد و بەمکارە دیارییەکی باشی وەرگرت. بەلەمێکی مۆتۆڕی بینی کە لەناو چەند بەلەمێکی وەستاو لەناوئاودا تێدەپەڕی. ژنەکە ئێستاش لەناو بەلەمەکەدا دانیشتبوو و خواردنەوەیەکی دەخواردەوە. بەلەمەکە لەژێر پردێك و کاناڵێکی باریکدا تێپەڕی کە تێپەڕین لەم شوێنە زۆر ئاسان نەبوو.
تەنیا دەیتوانی کارێك بکات. گەڕایەوە و بە هەموو هێزیەوە دەستی بە راکردن کرد. دوو ژنە رەشپۆشەکە دیسان چاویان بە ئەلێکس کەوت و

سەرێکیان لەرووی نارەحەتیەوە راوەشاند. ئەلێکس ئاگای لە کەش و هەوای گەرم نەبوو. تەنانەت لە سێبەرەکانیشدا کەش و هەوا گەرم بوو. لەکاتێکدا تەری ئارەقە ببوو، گەیشتە ئەم شەقامە کە لەوێ دەستی پێکردبوو. بەخۆشییەوە مامۆستا گرێی و منالەکان لەوێ نەبوون.

بە کام رێدا؟

لەناکاو هەموو شەقامەکان و قوژبنەکان و شوێنەکان وەکوو یەك دەچوون. ئەلێکس بە هەستی دۆزینەوەی، کە بەراستی بەهێز بوو، شەقامی لای چەپی هەڵبژارد. بەخێرایی لە میوەفرۆشێك تێپەری و دوایی مۆمفرۆشێك و دواتر گەیشتە رێستۆرانتێك کە کوورسییەکانی لە دەرەوە دانابوو. خزمەتکارانی رێستۆرانتەکە مێز و کورسییەکانیان بۆ مشتەرییەکان ئامادە دەکرد. ئێستا ئەلێکس گەیشتە پێچێك کە پردێکی لە تەنیشت بوو. پردەکە بەرادەیەك کوورت بوو کە دەیتوانی بە پێنج هەنگاو بیبڕێ. ئەلێکس چووە سەر پردەکە و لەوێ سەیری ناو کاناڵەکەی کرد. بۆنی بۆگەنی ئاوەکە لووتی ئازار دا. هیچ شتێ لەوێ نەدەبینرا. بەلەمە مۆتۆرییەکە رۆیشتبوو، بەڵام دەیزانی بۆ کام لاوە رۆیشتووە. ئێستاش زۆر درەنگ نەببوو، بەمەرجێك کە توانای رێکردن و راکردنی هەبوایە.

بەخێرایی بەرێکەوت. گەشتیارێکی ژاپۆنی دەیویست وێنە لە کچ و ژنەکەی بگرێت. لەکاتێکدا ئەلێکس بەخێرایی لەنێوانیان تێدەپەری، دەنگی وێنەگرتنەکەی کامێرای گوێ لێبوو. کاتێك بۆ تۆکیۆ دەگەرانەوە، وێنەی کورێکی لاوازیان دەبینی کە پرچی کەوتووەتە سەر شانی و تیشەرت و پانتۆڵێکی لەبەرە و ئارەقە لەسەر و دەم و چاوی دەتکێتەوە.

کۆمەڵێ لە گەشتیارەکان لەوێ بوون. یەکێ لە گۆشەیەکی شەقام گیتاری دەژەنی. دوایی گەیشتە کافەرێستۆرانتێکی دیکە. گارسۆنەکان (خزمەتکارەکان) بە سینی رەنگی رەساسی خەریکی ئیش و کار و هاتووچۆ بوون. ئەلێکس بە خێرا لەنێوانیان تێپەری. گارسۆنەکان قیژەی

نارەزایەتیان دەربڕی، بەڵام ئەلێکس بێئەوەی ئاوڕیان لێبداتەوە، لە راکردنی بەردەوام بوو. ئێستا هیچ نیشانێك لەناو نەبوو، واپێدەچوو شەقامەکە مەودایەکی زۆری مابێ و بەم شێوەیە بەردەوام بێ، بەڵام ئەلێکس دەیزانی کە بە کاناڵێکی دیکە دەگات.
کاناڵەکەی دۆزییەوە. ئاوێکی قوڕاو لەناو کاناڵەکەدا بوو. ئەو گەیشتبوو بە گرندکاناڵ[٣١]، گەورەترین ڕێڕەوی ئاوی ڤێنیز. ئێستا بەلەمی مۆتۆڕی بە دووپشکەوە کە لەسەر تەنیشتی هەڵکەندرابوو، بە جوانی دەبینرا. لانیکەم سی مەتر لە ئەو دوور بوو. بەلەمێکی زۆر دەورەیان دابوو.
بە تێپەڕبوونی هەر چرکەساتێ، بەلەمەکە لە ئەلێکس دوورتر دەبۆوە.
ئەلێکس دەیزانی کە ئەگەر دووبارە بەلەمەکەی لێ ون بێت، ئیتر ناتوانی بیدۆزێتەوە. زۆر کاناڵ لەم کاناڵەوە جیا دەبوونەوە. بەلەمە مۆتۆڕییەکە لەناکاو دەیتوانی بەهۆی بینایەك لەبەرچاو ون بێ و یا بۆ هۆتێلێکی گەورە بچێ. لەمکاتەدا ئەلێکس چاوی بە سەکۆیەکی دار کەوت کە نەختێك دوورتر لە ئەو لەسەر ئاو دەهاتو دەچوو. وای بیر کردەوە کە دەبێ ئەوێ وێسگەیەکی پاسەکانی ئاویی بێت. لەناو کیوسکێ بلیتی پاسیان دەفرۆشت و خەڵکێکی زۆر دەورەیان دابوو.
لەسەر تابلۆیەکی زەردرەنگ ناوی وێسگەی پاسە ئاوییەکە نووسرابوو: سانتا ماریا دل گیگلیۆ[٣٢]. بەلەمێکی پڕ لە جەماوەر خەریکی بەتاڵ کردنی جەماوەرەکە بوو. پاسی ژمارە یەك. ڕۆژی هاتنیان بۆ ڤێنیز سواری پاسێکی هاوشێوە ببوون. ئەو دەیزانی کە ئەم بەلەمە هەموو درێژایی کاناڵەکە دەپێوێت. بەلەمەکە بە خێرایی دەڕۆیشت.

---

[31] - Grand Canal

[32] - Santa Maria Del Giglio

ئەلێکس سەیری پشت سەری خۆی کرد. ئەگەری ئەوە نەبوو بتوانێ لە شاقامدا بەدوای بەلەمەکە بکەوێ. پاسی ئاویی تەنیا ئومێدی ئەو بوو، بەڵام ئەو ئەم پاسەی لەدەست دابوو، لانیکەم تا دە خوولەکی دیکە پاسی دیکــە نەدەگەیشــتێ. کــەرەجی[٣٣] (بەلــەمێکی بچــووک)ی ڤێنیــزی (گوندولا)[٣٤] لـە تەنیشـتی تێپـەڕی. بەلـەم لێخوڕەکـە بـە زمـانی ئیتـاڵی گۆرانی دەوت و گەشتیاری نـاو بەلەمـە بچووکەکەش پێکەنینێکی لەسـەر لێوان بوو. لەناکاو ئەلێکس بیری لەوە کرد بەلەمە بچووکە بدزێ. ئەوکات بیرێکی باشتری بە هزریدا هات. بە جووڵەیەکی خێرا، سەولەکەی لەدەست بەلـەم لێخووڕەکـە دەرهێنـا. بەلـەم لێخووڕەکـە کـە تووشـی سەرسـووڕمان هـاتبوو، قیژەیـەکی هـاتێ و هـاواری کـرد. بـەڵام تـا ویسـتی بـۆ پاشـەوە بگەڕێتەوە، هاوسەنگی لەدەست دا.

هـەر لـەم کاتـەدا ئـەلێکس سـەولەکەی تـاقی کـردەوە. نزیـك بـە پێـنج مـەتر درێژ بوو و قوورسیش بـوو. بەلـەم لێخووڕەکە دارەکـەی خـوار ڕاگرتبـوو و ئەلێکس خێرا بەڕێکەوت و نووکی سـەولەکەی خسـتە نـاو ئـاو. ئومێدەوار بوو کە قووڵایی ئاوەکـە زۆر نـەبێ و لـەم نـاوەدا بـەخت یـاوەریی ئـەلێکس بوو.

ئـاوی کاناڵەکـە زۆر قـووڵ نـەبوو. ئـەلێکس لـە شـێوەی هاویشـتنی نێـزە کەڵکی وەرگرت و لە کاتێکدا کە بەشی دوایی سەولەکەی بەدەستەوە بوو، تیغەی سـەولەکەی خسـتە نـاو ئـاو و بـە جووڵـەیـەکی خـۆی هاویشـتە سـەر پاسـە ئاوییەکـە. سـەولەکەی لەپشــت سـەری خـۆی هەڵـدا و سـەیرێکی دەوروبـەری خــۆی کــرد. گەشــتیارەکانی دیکــەی پاســە ئاوییەکــە بــە سەرسووڕمانەوە سەیریان کرد. بەڵام ئەلێکس ئێستا لەناو پاسەکەدا بوو.

---

٣٣- ئەم بەلەمە بچووکەیە کە خاوەنەکەی بە دارێکی درێژ لەناو ئاودا پاڵی دەدات.

34 - Gondola

له ڤینیز ژماری ئەو کەسانە کەم بوو کە لە ناو پاسی ئاویی بلیتەکانیان کۆنترۆڵ دەکرد. لەم رووییەوە کەس نەهاتە بەردەم ئەلێکس بۆ ئەوەی بلیتەکەی کۆنترۆڵ بکات. ئەلێکس لەکەنارێکی ناو بەلەمەکە دانیشت. بایەکی هێوری دەهات. بەلەمە مۆتۆڕییەکە بە مەودایەکی کەم لەپێش پاسەکە دەڕۆیشت بۆ ئەوەی بگاتە ناو دڵی شار. لەسەر کاناڵ پردێکی داریی باریکیان دروست کردبوو. ئەلێکس ئەم پردەی ناسییەوە، پردی ئەکادێمی[٣٥] بوو کە بەرەو گەورەترین نیگارخانەی هونەریی شار دەچوو. تەواوی بەیانییەکە لەوێ ببوو. ئەلێکس بۆ ماوەیەکی کەم بیری لەو کارە کردەوە کە دەیویست بیکات. ئەو گرووپی گەشتیارانی قووتابخانەی جێهێشتبوو. رەنگە مامۆستا گرێی و خاتوو بێدفۆردشایر بە تەلەفۆن پەیوەندیان لەگەڵ هۆتێل گرتبێ. رەنگە سەردانی پۆلیسیان کردبێ و هەموو ئەمانە بۆچی؟ سەبارەت بەوەیکە ئەو لەسەر بەلەمێك وێنەی دووپشکێکی رەساسی بینیوە. واپێدەچوو عەقڵی لەدەست دابووبێ.

پاسەکە خێرایی خۆی کەم کردەوە. گەیشتە وێسگەی دواتر. ئەلێکس بیری لەوە کردەوە ئەگەر بوەستێ تا ئەم هەموو گەشتیارە بێنەخوار و هەندێ گەشتیاری دیکە سواری پاسەکە بن، ئیتر رەنگی بەلەمەکە نبینێتەوە. ئێستا ئەو لە لایەکەی دیکەی کاناڵەکە بوو. شەقامەکان لەوێ چۆڵتر بوون.

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بیری لەوە کردەوە کە توانای راکردنی چ مەودایەکی دیکەی هەیە. بەڵام دوای ماوەیەکی کورت حەسایەوە، بەلەمە مۆتۆڕییەکە گەیشتبووە شوێنی خۆی.

لەمەودایەکی نزیك بە ئەو، بەلەمەکە لە پشت دیرەکەکان دەوەستا. دواتر، دوو خزمەتکاری ئۆنیفۆرمپۆش لە کۆشکەکە هاتنەدەرێ. یەکێکیان

---

35 - Academy

بەلەمەکەی بەستەوە و ئەویتر کە پەنجەوانەیەکی سپی لەدەست بوو، بۆلای بەلەمەکە درێژ بۆوە. ئەو ژنەی کە لەناو بەلەمەکەدا بوو دەستی خزمەتکارەکەی گرت و لەناو بەلەمەکە هاتە خوارێ. جلێکی تەسکی شیرەیی رەنگی لەبەر بوو و کۆتێکی کورتی پۆشیبوو. جانتا دەستییەکەی هاویشتبووە سەر قۆڵی و بەو مۆدێلانە دەچوو کە وێنەکەی لەپشت گۆڤارەکان چاپ کرابێت. لەکاتێکدا خزمەتکارەکان ئەشیای ئەویان بەتاڵ دەکرد، ئەو لە پەیژەکان سەرکەوت و لەپشت ستوونێکی بەردین لەبەرچاو شارایەوە.

پاسی شین بۆ بەرێکەوتنی دووبارە ئامادە دەبوو. ئەلێکس بە خێرایی لە پاسەکە هاتەخوارێ. دەبوایە جارێکی دیکە رێگەی خۆی لەنێوان بیناکانی دەوروبەری گرندکاناڵ بدۆزێتەوە. بەڵام ئەمجارە دەیزانی دەبێ بەدوای چیدا بگەڕێ و چەند خولەك دواتر ئەم شتەی دۆزییەوە کە بەدوایدا دەگەڕا.

کۆشکێکی نموونەیی ڤێنیزی بوو، بە رەنگی پەمەیی و سپی. پەنجەرەی باریکی هەبوو کە بە جوانی تەواو دروست کرابوون. بەڵام ئەم شتەی کە لە کۆشکەکانی دیکە جیای دەکردەوە، تایبەتمەندییەکەی بوو. کۆشك بەرامبەر بە گرندکاناڵ نەبوو. بیناکە لەوێ نەختێك دوور بوو. ئاوی کاناڵ بە دیوارە خشتییەکەی بیناکە دەکەوت. ئەو ژنەی لە بەلەمەکە هاتبووەخوارێ، لەنێوان هەندێ دەروازە تێپەڕیبوو، بەوەدەچوو چووبێتە ناو قەڵایەك. بەڵام قەڵاکە لەسەر ئاو بوو. دیار نەبوو ئاوەکە لە کوێ تەواو دەبێ و لەکوێوە دووبارە دەست پێدەکاتەوە.

کۆشکەکە لە لایەك لە رێگەی وشکاییەوە رێگەی هاتنەژووری هەبوو. خزمەتکارەکان لەهەر لایەکەوە خەریکی ئیش و کار بوون. مەشخەڵەکانی نەوتی گۆشە و کەناری بیناکەیان رازاندبۆوە. چەند کەسێك فەرشێکی سووریان رادەخست. ژمارێك لە دارتاشیش خەریکی کاری دارتاشی

بوون. واپێدەچوو خەریکی دروستکردنی شانۆیەك بۆ گرووپی مۆسیقا بن. هەندێ لە خزمەتکارانیش خەریکی گواستنەوەی کارتۆنی پڕ لە مەوادی خۆراکی و خواردنەوەکانی جۆراوجۆر بوون. بێشك کۆشك بۆ میوانداریيەکی گەورە ئامادە دەکرا.

ئەلێکس کەسێکی راگرت و پرسیاری لێکرد:

ببوورە، دەکرێ پێم بڵێی کێ لەم کۆشکەدا دەژیت؟

ئەو کەسەی کە پرسیاری لێکرابوو، زمانی ئینگلیزی نەدەزانی و تەنانەت نەیویست هەڵوێستێکی هاوڕێیانەشی هەبێ. ئەلێکس بۆلای پیاوێکی دیکە چوو و پرسیارەکەی دووبارە کردەوە. بەلام ئەویش رێك هەڵسووکەوتی پیاوی پێشووی هەبوو. ئەلێکس پێشتر لەگەڵ خەڵکانی ئەوجۆرە رووبەڕوو ببۆوە. ئەوانە وەکوو گاردەکانی ئەکادیمی پوینت بلانك بوون. لێزانەکانی تەکنەلۆژیای ئامێریی بۆ کارکردن. ئەمانە بۆ کەسێك کاریان دەکرد کە ئەوانیان تووڕە دەکرد. ئەوان بۆ ئەنجامدانی کارێ پارەیان وەردەگرت و هیچ خەتایەکیان نەدەکرد. ئایا ئەمانە شتێکیان دەشاردەوە؟ رەنگە!

ئەلێکس ناو حەوشەی جێهێشت تا گەشتێك بە دەوری کۆشکەکەدا لێبدا. کاناڵێکی دیکە درێژایی دیکەی کۆشکەکەی دەورە دابوو و ئەمجارە ئەلێکس بەختێکی زیاتری هەبوو. ژنێکی بە تەمەن کە جلێکی رەشی لەبەربوو و پێشبەندێکی سپی پۆشیبوو، نزیك کاناڵەکەی گێسك لێدەدا. ئەلێکس بۆلای چوو.

– ئێوە ئینگلیزی دەزانن؟ دەتوانن یارمەتیم بدەن؟

ژنەکە گێسکەکەی دانا و سەری بە نیشانەی بەڵێ هێنایەخوار.

– من ساڵانێکی زۆر لە لەندەن ژیاوم. زۆر بە باشیش بە ئینگلیزی قسە دەکەم. چ یارمەتییەك لەدەست من دێت؟

ئەلێکس ئیشارەیەکی بۆ بینایەکە کرد.

- ئێره کوێیه؟
- ئێره کاڤێدۆڤا[36] یه. کا به مانای کۆشك، ڤێدۆڤایش بەمانای بێوەژنە. بەم پێیە دەبێتە کۆشکی بێوەژن.
- بڕیاره بەرنامەیەکی تایبەتی بەڕێوەبچێ؟
- ئەمشەو میوانداریيەکی گەورە لێرەدا بەڕێوەدەچێ. جەژنی لەدایك بوونە. بڕیارە ماسك و رووپۆش لەچاو بکەن و جلی جوان لەبەر بکەن.
- لەدایك بوونی کێیە؟
ژنەکە بۆ ماوەیەك دوودڵی پێوەدیار بوو. ئەلێکس زیادە لەڕادە پرسیاری کردبوو و واپێدەچوو ژنەکە شك و گومانی لێکردبێ. بەڵام جارێکی دیکە کەمتەمەنی یارمەتی پێکرد. ئەلێکس تەمەنی چواردە ساڵ بوو. گرنگ نەبوو ئەگەر کۆنجکاو بووبێت و زیادە لەڕادە پرسیاری کردبێ.
- لەدایك بوونی خاوەن ماڵ، خاتوو رۆدمەن[37]. ئەو ژنێکی دەوڵەمەند و خاوەن پارەیەکی زۆره.
- رۆدمەن؟ وەکوو جگەرەی رۆدمەن؟
بۆماوەیەك دەمی ژنەکە بەسترا و ترسێك چاوەکانی داگرت. ئەلێکس سەیری دەورووبەری خۆی کرد، یەکێ لە پیاوەکان بەسیلەی چاوی سەیری دەکردن.
ئەلێکس بڕیاری دا دوایین هەوڵیشی بدات.
- من بەدوای دووپشك دەگەڕێم.
پیرێژنەکە بەجۆرێك سەیری کرد وەکوو ئەوە دەچوو کە کەسێك زللەی لێدابێ. گێسکەکەی دەست دایە و رووی لە پیاوەکە کرد کە سەیری دەکردن. بە خۆشییەوە گوێی لە قسەکانی ئەوان نەبیوو. هەڵبەت هەستی

[36] - Ca Vedova
[37] - Rothman

پێکردبوو کە کێشەیەك لەئارادا هەیە، بەڵام هیچ جووڵەیەکی نەکردبوو. بەهەرحاڵ ئەلێکس هەستی بەوە کردبوو کە کاتی ڕۆیشتنە.
ئەلێکس ڕووی لە ژنە پیرەکە کرد و وتی:
- گرنگ نییە! سوپاس بۆ یارمەتییەکەت.
ئەلێکس بەڕێکەوت. لەسەر ڕێگە بە پردێکی دیکە گەیشت. بیٚ ئەوەی هۆکارەکەی بزانیٚ. دەیویست لە کۆشکی ژنەکە تێپەڕیٚ.
هەر کە نەختێك لەویٚ دوور کەوتەوە، نەختێك وەستا. دەیویست بزانیٚ فێری چی بووە. بەلەمێك کە بە دووپشکێکی ڕەنگ ڕەساسی ڕازابۆوە، ئەوی بۆ کۆشکێك هێناوە. خاوەنی ئەم کۆشکە ژنێکی جوان و دەوڵەمەند بوو کە پێکەنینێکی لەسەر لێوانە. کۆشك لەلایەن چەند نیگابان پاسەوانی لێدەکریٚ و هەر کە ناوی دووپشکی هێناوە، وەکوو کەسێك هەڵسووکەوتی لەگەڵ کراوە کە نەخۆشی تاعونی گرتبیٚ.
زیاتر لەوە هیچ شتێکی دەست نەکەوتبوو، بەڵام ئەوەندەش بەس بوو. ئەمشەو بڕیار بوو میوانداری بە ڕووپۆش و پۆشینی ماسك بەڕێوەبچیٚ. چەژنێکی لەدایك بوون. خەڵکانێکی گرنگ و دەوڵەمەند و ناودار بانگهێشت کراون. ئەلێکس یەکیٚ لەو بانگهێشتکراوانە نەبوو، بەڵام پێشاوپێش بڕیاری خۆی دابوو. ئەو دەیوست میوانێکی ناو کۆشك بێت.

## شمشێری نامەرئی (نادیاری بەهێز)

ناوی تەواوی ئەو ژنەی چووە ناو کۆشکەکە، جولیا شارلوت گلنیز رۆدمەن[38] بوو. ئەمە ناوی ئەو بوو. رەنگە یەکێك لە ناوەکانی بێت. ئەو لە نیویۆرکیش ئەپارتمانێکی هەبوو، خانوویەکی لە لەندەن و ڤێلەیەکی لە دەریای کارائیب، ئەمە بەشێك لە سەروەت و سامانی ئەو بوو.

ئەو بە هێوری لە رێڕەوێك کە رووناکییەکی کەمی هەبوو، تێپەڕی. لە لایەکی دیکە رێڕەوەکە ئەسانسۆرێکی (مەسعەد بە زمانی عەرەبی – بالأبەر – ئەسانسێر) تایبەتی دەبینرا. پاژنەی بەرزی پێڵاوەکانی لەسەر ئەرد دەنگیان دەهات. هیچ خزمەتکارێك لە ناو رێڕەوەکەدا نەدەبینرا. بە دەست دوگمەی ئەسانسۆڕەکەی پاڵدا و دەرگا کرایەوە. ئەسانسۆڕێکی بچووك بوو. بە زەحمەت جێگەی کەسێك دەبۆوە. بەڵام ئەو بە تەنیا دەژیا. خزمەتکار دەبوایە لە رێگەی پەیژە هاتووچۆیان کردبا.

ئەسانسۆڕەکە ئەوی بۆ نهومی سێیەم برد. گەیشتە ژوورێکی کۆنفرانسی مۆدێرن کە تێیدا نە فەرشێ راخرابوو و نە وێنەیەك بە دیوارەوە هەڵواسرابوو. ژوورەکە تەنانەت پەنجەرەیەکیشی بەرەو دەروە نەبوو.

بەڵام ئەگەر کەسێك نەیدەتوانی لە دەروەڕا ژوورەوە ببینێ، بە هەمانشێوە لە ژوورەوەش کەس نەیدەتوانی دەرەوە ببینێ. ئەمجۆرە ئەمن و ئاسایشێکی بەرچاوتر لەئارادابوو. رووناکی ژوورەکە لە چرای هالوژنی کە لەناو دیواردا جێسازی کرابوون دابین دەکرا. تەنیا مێزێکی گەورەی

[38] - Julia Charlotte Glenys Rothman

شووشـەیی لەناوەڕاسـتی ژوورەکـەدا بـوو و بـە قەنەفـەی چـەرمی دەورە درابوو.
رووبەڕووی دەرگای ئەسانسـۆر دەرگایـەکی دیکـە دەبینـرا کـە داخرابـوو. دوو پاسـەوان لـە لایـەکی دیکـە وەسـتابوون. چـەکدار بـوون و ئامـادەیی ئەوەیان هەبوو کە هەرکەس لە نیو کاتژمێری دواتر بگاتێ، هەلاکی بکەن و بیکووژن.
لە دەوری مێزەکە هەشت پیاو دانیشتبوون و چاوەڕوانی ئەویان دەکرد. یەکێکیان قۆنـاغی هـەفتا سالی تێدەپەڕاند. سـەری بـێ مـوو بـوو و قات و ریباتێکی خۆلەمێشی لەبەر بوو. ئەو پیاوەی کە لە تەنیشـتی دانیشتبوو چـینی بـوو. ئـەو پیـاوەی کـە رووبـەڕووی دانیشـتبوو و کراسـێکی یەقـەکراوەی لەبـەربوو خـەلکی ئوسـترالیا بـوو. زۆر بەرچـاو بـوو کـە کەسـایەتییەکانی ئـەم دانیشـتنە لـە نەتـەوەکانی جیاجیـا بـوون. بـەلام هەمووشـیان خـالێکی هاوبەشـیان هـەبوو، هـەموویان ئـارام و سـارد و لەسەرەخۆبوون و لەمڕوویەوە ژوورەکە لەجیاتی ئەوەی دەنگی خۆشـی و شـادی لێبێـت، ئـەوا زیـاتر بـە ساردخانە دەچوو. کاتێـك خـاتوو رۆدمـەن لەسەرووی هەموویان لەسەر کورسی دانیشت، هیچکەس نە سلاوی لێکرد و نـە لـە ئەحـەوالی پرسـی. سـەیری کاتژمێریشـیان نـەکرد. هـاتنی خـاتوو رۆدمـەن بـەمانای کاتـژمێر یـەکی دوانیـوەڕۆ بـوو. ڕێـك هـەمان کـات کـە دەبوایە کۆبوونەوەکە دەست پێبکات.
خاتوو رۆدمەن سەری بەرز کردەوە.
– دوانیوەڕۆتان بەخێر.
چەند کەسێك سەریان بە نیشانەی سوپاس هێنایەخوارێ، بەلام کەسیان قسەی نەکرد.
سلاو و حالێ و ئەحوالێ پرسین یانی بە فیڕۆدانی کات.
ئـەم نـۆ کەسـەی کـە لـە دەوری مێـز لـە نهـومی سـێیەمی کۆشـکی بێـوەژن دانیشتبوون، بەرێوەبەری یەکێ لـە بێ رەحمترین رێکخراوانـی تاوانکـاران لە جیهاندا بوون.

پیرە پیاوەکە ناوی مەکس گرێندل[39] بوو. پیاوە چینییەکەش دکتۆر تێری[40]، ئوستراللییەکە بێ ناو بوو. ئەوان لەم ژوورە بێ پەنجەرەیە کۆ ببوونەوە کە لەبارەی چالاکییەکی تاوانکاری راوسەرەنجی یەکتر وەربگرن کە تا چەند هەفتەی دیکە بە ملیۆن پاوندی بە داهات و سەروەت وسامانی ئەوانەوە زیاد دەکرد.

ناوی ئەم رێکخراوەیە دووپشك بوو.

ناوێکی سەیر بوو، رەنگە ئەو کەسەی کە ئەم ناوەی بۆ ئەم رێکخراوەیە دۆزیبۆوە، زۆر لەکتێبەکانی جێمز باند[41]ی خوێندبۆوە. بەهەرحالْ ئەوان دەبوایە ناوێك بۆ رێکخراوەکەیان دابنێن.

دووپشك ئێستا ناوێکە کە لەناو کۆمپیۆتەری گشت دەزگەکانی پۆلیس و ئەمنی و پارستندا هەیە.

ئەم رێکخراوەیە لە سەرەتای دەیەی هەشتا پێکهاتبوو، لە سەردەمی شەڕی سارد. هەمان شەڕ کە لە چەندین دەیە لەنێوان یەکێتی سۆڤیەت، چین، ئەمریکا و ئەوروپا لەئارادا بوو. هەموو ولآتەکانی جیهان سوپایەکیان لە سیخۆر و پیاوانی ئاسایش و ئەمنیەتی هەبوو و هەموویان ئامادە بوون سەبارەت بە ولآتەکەیان بمرن و بکوژن.

ئەوان تەنیا لەخەمی ئەوەدا بوون کە نەیاندەویست ئیشەکەیان لەدەست بدەن. لەناو کۆی ئەواندا، دوازدە کەسێك کە هەستیان دەکرد شەڕی سارد بەزوویی کۆتایی پێدێت بەم ئەنجامە گەیشتبوون کە دەبێ بۆخۆیان کار بکەن.

ئەوان بەیانی یەکشەممە بەیەکەوە بۆ پاریس چوون. یەکەمین کۆبوونەوەی ئەوان لە میسون برتیلون[42]، مۆتەفرۆشێکی ناودار لە ئیل

---

[39] - Max Grendel
[40] - Dr Three
[41] - James Bond
[42] - Maison Berthillon

ست لوییس[43] له نزیک نوتردام[44] بەڕێوەدەچوو. هەموویان بەیەکەوە ئاشنا بوون و یەکتریان دەناسی. بەڕادەی پێویست پێشتر هەوڵیان دابوو یەکتر بکوژن. بەڵام ئێستا لە ژوورێکی رازاوە بە دوازدە مۆتەی توی فەرەنگی لەبارەی ئەوەدا قسەیان دەکرد کە چۆن بتوانن بەیەکەوە ئیش بکەن و سەروەت و سامانی خۆیان زیاتر بکەن. لەم کۆبونەوەیەدا بوو کە دووپشک لە دایک بوو.

لەم کاتەوەی ئیشەکەیان پەرەی پێدار و گەشایەوە، دووپشک لە هەموو دونیادا ناوی دەرکرد. بوو بە هۆی شکستهێنانی دوو حکوومەت، دەیان بازرگـــانی لـــەناو بـــرد، سیاســـەتمەداران و فەرمانبـــەرانی گـــەورەی رێکخراوەکانیان بەرەو گەندەڵی بردبوو، چەند تاوانی گەورەی ژینگەییان بەڕێوەبردبوو و هەر کەسێك لەسەر رێگەی ئەم باندە بوایە، کوژرابوو. دووپشـك یـەك دەیـەمی گشـت تاوانـەکانی تیرۆریسـتیان لـە جیهانـدا بەڕێوەدەبرد. دووپشك حەزی دەکرد خۆی بەناوی (ئەی بی ئێم)ی[45] جەنایەتکار بەجیهان بناسێنێت. بەڵام ئێی بیٚ ئێم بە نسبەت دووپشك رێکخراوێکی بچووکتر بوو.

لە کۆی دوازدە کەسی سەرەتایی، تەنیا نۆ کەسیان مابوون. یەکێکیان بەهۆی شێرپەنجە مردبوو و دوو کەسیشیان کوژرابوون. بەڵام بەپێی بیست ساڵ پێشینەی جەنایەت و کوشت و کوشتار، ئامارێکی خراپ نەبوو. هیچکات رێبەرێکی دیار بۆ دووپشك هەڵنەبژێردرابوو. هەر نۆ کەسیان شەریکی هاوبەش و یەکسان و هاوپلە بوون. هەمیشە لە رووی پیتی "الف و بیٚ"یەوە یەکیٚ لە ئەندامان بەرپرسایەتی پرۆژەکەی بەئەستۆ دەگرت.

---

43 - Ile St-Louis

44 - Notre-Dame

45 - IBM

ئەو پرۆژەیەی کە لەم دوانیوەڕۆیە باسی لێدەکرێ، ناوێکی نهێنی هەبوو. شەمشێری نامەرئی "نادیاری بەهێز" جولیا رۆدمەن ئێستا بەرپرسایەتی ئەم پرۆژەی بەدەستەوە بوو.

خاتوو رۆدمەن وتی:

- دەبێ پێتان رابگەیەنم کە هەموو شت بەپێی پلان دەچێتە پێش.

زاراوەیەکی ڤێلزی هەبوو. ئەو لە ئابریستویت[٤٦] لەدایك ببوو. دایك و باوکی لە کەسایەتی ڤێلزی بوون. ئەوان دژایەتی زۆربەی هەوڵەکانی ئینگلتەرایان دەدا. جولیا شەش ساڵە بوو کە باوك و دایکی ڤێلەی بنەماڵەیەکی ئینگلیزیان ئاگر تێبەردا. بەداخەوە، ئەوکات ئەم بنەماڵەیە لەناو خانووەکەدا بوون. دایك و باوکی جولیا بە تاوانی ئەم کردەوەیە بە سزای زیندانی هەتاهەتایی تاوانبار کران. ئەمە بەشێوەیەك دەسپێکی چالاکییەکانی جەنایەتکارانەی جولیا بوو.

جولیا بەردەوام بوو:

- ماوەی سێ مانگێك دەبێ کە مشتەرییەکەمان، یانی پیاوێکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، پەیوەندی بە ئێمەوە گرتووە. ئەگەر بڵێین دەوڵەمەندە، پێموابێ مافی ئەوتۆمان پێ نەدابێ، ئەو مۆڵتی ملیاردەرە. ئەم پیاوە سەیری جیهان و هاوسەنگی هێزی کردووە و بەم ئەنجامە گەیشتووە کێشەیەکی زۆر گەورە لەئارادایە.

ئەو داوای لێکردووین ئەم غەیری هاوسەنگی و کێشە گەورەیە چارەسەر بکەین. ئەو بەم ئەنجامە گەیشتووە کە رۆژئاوا زیاتر لەڕادە بە هێز بووە. ئەو سەیری بەریتانیا و ئەمریکا دەکات. دۆستایەتییەك لەنێوان ئەم دوو وڵاتەدا هەبوو کە سەرکەوتنی ئەوانی لە شەڕی دووهەمی جیهانی لێکەوتەوە و ئەم دۆستایەتییەیە کە رێگە بە رۆژئاوا دەدات بە حەزی خۆی هێرش بکاتە هەر وڵاتێك و داگیری بکات. مشتەری ئێمە دەیەوێ

46 - Aberystwyth

جارێـك و بـۆ هەمیشـە کۆتـایی بـە یـەکگرتوویی دوو وڵاتـی ئـەمریکا و بەریتانیا بێنین.
خاتوو رۆدمەن بزەیەکی هاتێ.
– بەڵام لەبارەی ئەم مشتەرییە چی دەتوانم بڵێم؟ رەنگە ئەو تەنیا لە وەهم و خەیاڵـدا دەژیـت کـە بـڕوای بـە ئاشـتی جیهانییـە. رەنگـە عـەقڵی بـە تـەواوەتی لەدەسـت داوە. بەهـەرحاڵ، بـۆ ئێمـە جیـاوازی نییـە. ئـەو پارەیەکی زۆری پێشنیار کردووە. یەك سەد ملیۆن پاوند بۆ ئەوەی ئەو کارەی دەیهەوێ ئەنجامی بدەین. ئەو دەیـەوێ هاوکاری نێوان ئەمریکا و بەریتانیا بۆ هەمیشە لەناوبچێت. دەبێ ئەوەش بڵێم کە بڕی بیست ملیۆن وەکوو پێشـەکی خراوەتـە حسـێبمان لـە بـانکی سویسرا. ئێمە ئێستا لـە بارودۆخێك داین کە دەبێ قۆناغی دووهەم دەست پێبکەین.
بێدەنگییـــەك ژوورەکـــەی داگـــرت. لەکاتێکـــدا پیاوەکـــان چـــاوەڕوانی بەردەوامبوونی قسەکانی خـاتوو رۆدمـەن بوون، دەنگـی بـای فێنککـەرەوە بەگوێ گەیشت، بەڵام لە دەرەوەی ژوورەکە هیچ دەنگێك نەدەبیسرا.
– قۆناغی دووهەم – یانی قۆناغی کۆتایی – تا سێ هەفتەی دیکە کامڵ دەبـێ و کۆتـایی پێـدێت. بـەڵێنیتان پێـدەدەم کـە ئینگلیزییـەکان و ئەمریکییـەکان قـورگی یـەکتر رێکبکووشـن. لـە هـەموو ئەمانـە گرنگتر، تا کۆتـایی مـانگ هـەردوو حکوومـەت بەچـۆك دادێـن. ئەمریکاییـەکان نفرینکـراوی گشـت خـەڵکی جیهـانن و ئینگلیزیـەکانیش دەبنـە هـۆی مەترسییەك کە تا ئێستا شێوەی نەبووە. هەمووشمان تا رادەیەکی زۆر دەوڵەمەنـدتر دەبـین. دۆسـتی رۆژهـەڵاتی ناوەڕاستیشـمان بـەم ئەنجامـە دەگات کە پارەکەی لە رێگەیەکی دروستدا خەرج کردووە.
– بمبووە خاتوو رۆدمەن. من پرسیارێکم هەیە...
دکتـۆر تێـری بـە حـەیا و بەشـەرمەوە سـەری داخسـت. مـووی رەش و رووخسـاری نـەرمی بیسـت سـاڵ گـەنجتر لـەوانیتری نیشـان دەدا. بێشـك پرچـی رەش کردبـۆوە. قەڵافـەتێکی زۆر بچـووکی هـەبوو و واپێدەچـوو مامۆسـتایەکی خانەنشـینە. بەئەوەدەچـوو و دەکـرا خـاوەنی هـەر ئیشـێك

بێت. بەڵام ئەو گەورەترین پسپۆر لە ئەشکەنجە کردندا بوو. لەبارەی ئەم بوارەدا زۆر کتێبی نوسیبوو.

دکتۆر تێری پرسی:

– دەتانهەوێ چەند کەس بکووژن؟

جولیا رۆدمەن وەڵامی دایەوە:

– هێشتا ناکرێ بە رێکی دیاری بکەین، دکتۆر تێری. بەڵام بێشک دەگاتە چەند هەزار کەسێك. هەزران کەس.

– هەمووشیان منداڵ دەبن؟

– بەڵێ، زۆربەیان، منداڵانی دوازدە ساڵ و سێزدە ساڵە. هەڵبەت بەوپەڕی داخەوە. من منداڵانم خۆش دەوێت، هەرچەند بۆخۆم منداڵم نییە. بەڵام بەهەرحاڵ ئەمە پلانی ئێمەیە و دەبێ کاریگەری دەروونی ئەم هەموو مێرمنداڵە زۆر بەسوود دەبێت. ئێوە لەم پلانە دڵگیرن؟

دکتۆر تێری سەرێکی بە نیشانەی نەخێر جووڵاند:

– بێشك نەخێر خاتوو رۆدمەن.

– کەس هەیە نارەزایەتی لە پرۆژەکە هەبێ؟

کەس قسەی نەکرد، بەڵام خاتوو رۆدمەن بە سیلەی چاوی بینی کە مەکس گرێندل بە نارەحەتی لەملای مێز لەناو کورسییەکەیدا خۆی جووڵاندەوە. ئەو بە هەفتا و سێ ساڵ تەمەن بە تەمەنترین پیاو بوو کە بەشداری کۆبوونەوەکەی کردبوو. لەسەر ناوچاوانی خاڵ و چەند پەڵەیەك دەبینرا. ئەو ئازاری نەخۆشییەکی چاوی هەبوو و هەر بۆیەش بەردەوام چاوی پڕ لە فرمێسك بوو. ئێستا چاوی بە دەسرەیەك دەسڕییەوە. بە دژواری دەکرا باوەڕ بەوە بکەی کە ئەو زەمەنێك بەڕێوەبەری پۆلیسی نهێنی ئەڵمانیا بووە و تەنانەت سیخۆڕێکی لەناو پرۆژەیەکدا خنکاندبوو.

ئوسترالییەکە پرسی:

– ئایا هەوڵی پێکهێنانی ئیمکاناتی پرۆژەکە لە لەندەن کۆتایی پێهاتووە.

- بیناسازی لە کەنیسەدا هەفتەیەک پێش کۆتایی پێهات. سەکۆ، سیلەندرەکانی غاز و ئامراز و ئامێر و مۆتۆڕ و ئوتۆمبێلەکانی دیکە ئەمڕۆ دەگەن و وەریاندەگرین.
- ئایا شەمشێری نادیار ئیش دەکات؟

لوی کرۆل[٤٧] هەمیشە لەکاتی خۆی و بەجێ قسەی دەکرد. ئەو پیاوێکی ئاسایشی موساد بوو[٤٨]، بەردەوام لە بیست ساڵی رابردوودا بە دەمانچەیەکی ٩ میلی مەتری دەخەوت و لەژێر سەری دادەنا. پیاوێکی بە قەلافەت بوو کە ریشێکی بڵندی هەبوو و هەموو رووخساری داپۆشیبوو بۆ ئەوەی برینەکانی پێ بشارێتەوە. چاوبەندێکی لەسەر چاوێکی بەستبوو.

- بێگومان، بەڵی کار دەکات.
- یانی تاقی کراوەتەوە؟
- هەر ئێستا تاقی دەکەینەوە. بەڵام دەبێ پێتان بڵێم کە دکتۆر لیبێرمەن[٤٩] نوخبەیەکی تەواوە. هەڵبەت ئەگەر بتانهەوێ بیبینن، دڵگران دەبن و حەوسەلەتان نامێنێ. بۆخۆم ناچار بووم کاتێکی زۆری لەگەڵ بم. بەڵام ئەو سیلاحێکی نوێی داهێناوە و لێهاتوویی کارەکەی لەوەدایە کە هەموو پسپۆرانی جیهان لێیتێناگەن و نازانن کە چۆن ئیشی پێدەکرێت. هەڵبەت لە کۆتاییدا لێی تێدەگەن و بۆ ئەمەش پلانێکمان هەیە. بەڵام تا ئەو کات زۆر درەنگ بووە. شەقامەکانی لەندەن پڕ لە مەیت و کوژراو دەبێ. ئەوە ناخۆشترین رووداو دەبێ کە دوای پید پیپر[٥٠] لە لەندەن روو دەدات.

دکتۆر تێری پرسی:

---

[47] - Levi Kroll

[48] - Mossad

[49] - Dr Liebernann

[50] - Pied Piper

– ئەی لیبەرمەن چی بەسەر دێت؟

– هێشتا لەمبارەوە بڕیارمان نەداوە. وابزانم ناچارین بیکوژین. ئەو شەمشێری نادیاری داهێنا، بەلاّم هیچکات نازانێ کە چۆن دەمانهەوێ کەڵکی لێوەربگرێین. چاوەڕوانی ئەوەم کە دژایەتی بکات و هەربۆیەش دەبێ لەناوی ببەین.

خاتوو رۆدمەن سەیرێکی دەورووبەری خۆی کرد و پرسی:

– پرسیارێکی دیکەتان هەیە؟

مەکس گرێندل دەستی لەسەر مێزەکە بەرەو پێشەوە پاڵدا.

– بەڵێ.

خاتوو رۆدمەن بەلایەوە سەیر نەبوو کە ئەو قسەیە بکات. ئەو باوك و باوەگەورە بوو. لە هەموو ئەوانە خراپتر، ئەو لە تەمەنی پیریدا زۆر هەستیار بووە.

– من هەر لە سەرەتای کارەوە لەگەڵ دووپشك بوومە. هێشتا یەکەم کۆبوونەوەم لەبیرە کە لە پاریس بەڕێوەچوو. من بەهۆی کارکردن لەگەڵ ئێوە بە ملیۆن پاوند پارەم پەیدا کردووە و لە هەموو ئەو کارانەی کردوومانە، چێژم وەرگرتووە. بەلاّم، ئەم پرۆژەیە..... شەمشێری نادیار. ئایا بەڕاستی دەمانهەوێ ئەم هەموو منداڵ و مێرمنداڵە لەناو بەرین. چۆن دەتوانین دوای ئەنجامدانی پرۆژەکە لەگەڵ ویژدانی خۆمان پێکبێین؟

جولیا رۆدمەن وتی:

– زۆر ئاساییتر لە رابردوو.

– نا نا، جولیا.

دڵۆپە فرمێسکێك لە سیلەی چاوێکی رژایە سەر رووخساری.

– بۆ تۆ سەیروسەمەرە نییە. لە دوایین کۆبوونەوەدا کە هەمانبوو، لەمبارەیەوە قسەمان کرد. بەلاّم من بەم ئەنجامە گەیشتووم کە ئیتر بەسە. من پیاوێکی پیرم. حەز دەکەم لەناو کۆشکەکەم لە ڤیەنا ژیانێکی کەم رووداوم هەبێ. شەمشێری نادیار گەورەترین سەرکەوتنی تۆ دەبێ، بەلاّم

من ئیتر حەزم لێی نییە. کاتی ئەوە هاتووە خۆم بکێشمە لاوە. دەبێ بەبێ من کارەکان بەڕێوەبەرن.
لوی کرول بە توندی دژایەتی کرد:
- ناتوانی خۆت خانەنشین بکەی! بۆچی، پێشتر لەمبارەیەوە قسەت نەکردووە؟
ئەو کەسەی بە ژاپۆنییەکانیش دەچوو ناڕەزایەتی خۆی دەربڕی.
ماکس گرێندل ویستی هۆکار و بورهان و مەنتیق بێنێتەوە:
- من بە خاتوو رۆدمەنم وت. ئەو بەڕێوەبەری پرۆژەکەیە. وامنەزانی پێویست بێت بە هەموو ئەندامانی رێکخراوەکە بڵێم.
جولیا رۆدمەن بە ئارامی وتی:
- پێویست بەوە ناکات لەمبارەوە گفتوگۆ و وتووێژ بکەین، بەڕێز میکاتۆ[٥١]، ماکس ماوەیەکی زۆرە باسی خانەنشینی خۆی کردووە و بە بڕوای من دەبێ ڕێز لە بڕیارەکەی بگرین. لەڕاستیدا زۆر بەداخم، هاوسەری پێشووم دەیوت هەموو شتە باشەکانیش رۆژێک کۆتاییان پێدێت.
هاوسەری مۆڵتی ملیۆنەری خاتوو رۆدمەن تەنیا چوار رۆژ دوای پێکهێنانی ژیانی هاوسەری لەگەڵ خاتوو رۆدمەن لە پەنجەرەی نهۆمی حەڤدەهەم هاویشترابووە خوارێ.
خاتوو رۆدمەن بەردەوام بوو:
- هەڵبەت زۆر جێگەی داخە، بەلاّم لەوە دڵنیام کە تۆ کاری دروست دەکەی. کاتی ئەوە هاتووە لە گرووپی ئێمە دابڕێی.

*　　　*　　　*

---

51 - Mikato

خاتوو رۆدمەن تا وێسگەی کەشتی لەگەڵی رۆیشت. بەلەمە مۆتۆرییەکە ئەوێی جێهێشتبوو، بەلەمێکی دەستی لەوێ بوو کە لەگەڵ خۆی ببات. ئەوان بە ئارامی، لەکاتێکدا قۆڵیان لەناو قۆڵی یەکترکردبوو، هەنگاویان دەنایەوە.

- دڵتەنگت دەبم.
- سوپاست دەکەم، جولیا. منیش بیرت دەکەم و دڵتەنگت دەبم.
- نازانم بێ تۆ چۆن کارەکان بەڕێوەببەین.
- بە چاودێری تۆ شەمشێری نادیار شکست ناخوات.

خاتوو رۆدمەن لەناکاو وەستا.

- لەبیرم دەکرد کە دیارییەکم بۆت هەیە.

بە ئیشارەی ئەو، خزمەتکارێك لەکاتێکدا سندووقێکی بچووکی پێبوو، لێیان نزیك بۆوە.

- دیارییەك بۆتۆیە.
- دیاری قۆناغی خانەنشینی؟
- شتێك کە هەمیشە بەبینینی ئێمەت وەبیر بێتەوە.

ماکس گرێندل لەلای بەلەمە دەستییەکە وەستابوو. بەلەمسوارەکە بە جلێکی کولتووری لە پشت بەلەمەکە، لەکاتێکدا پاڵی بە سەولەکەیەوە دابوو، وەستابوو.

- زۆر سوپاس، ئازیزم، سەرکەوتوو بی.

خاتوو رۆدمەن یارمەتی ماکسی دا بۆئەوەی سواری بەلەمەکە بێت. ماکس دانیشت و سندووقەکەی لەسەر رانی دانا. بەلەمسوارەکە خێرا بەڕێکەوت. خاتوو رۆدمەن دەستی بەرز کردەوە. بەلەمە بچووکەکە بەخێرایی بەسەر ئاودا بەڕیکەوت.

خاتوو رۆدمەن گەڕایەوە و بۆ کۆشکی بێوەژن چوو.

ماکس گرێندل بەداخ و حەسرەتەوە سەیری کرد. ئەو دەیزانی کە بێ دوویشك ژیان چێژی پێشووی نامێنێ. ئەو لە دوو دەیەی رابردوودا هەموو هێز و توانای سەرف رێکخراوی دوویشك کردبوو. لەژێر کاریگەری

ئەم چالاكییە، گەنج و شاد و خۆشحاڵ مابۆوە. بەڵام ئێستا دەبێ لە بیركردنەوەی نەوەكانیدا رۆژگار تێپەڕێنێ. وەبیر ئەوە جمكەكانی، هەنس[٥٢] و رودی[٥٣]، كەوت. دوازدە ساڵە بوون.
رێك هاوتەمەنی مێرمنداڵانی لەندەن كە ئامانجی دووپشك بوون. ئەو نەیدەتوانی بەشێك لەم پرۆژەیە بێت. بڕیارێكی دروستی دابوو.
ماكس سندووقی سەر رانی لەبیر كردبوو. جولیا زۆرجار ئەمكارەی دەكرد. رەنگە هۆیەكەی ئەوە بوو كە تاكە ژنی ناو رێكخراوەكە بوو، بەڵام زیاتر لە هەموویان هەستی خەرج كردن و سەرف كردنی هەبوو. ئێستا بۆ ماكس جێگەی سەرنج بوو كە بزانێ خاتوو رۆدمەن چی بۆ كڕیوە. بەستەكە قوورس بوو. لە رووی كۆنجكاوییەوە ویستی بیكاتەوە.
جانتایەكی بچووكی دەستی بوو كە بێشك بە نرخێكی زۆر كڕابوو. بە پێی تایبەتمەندی چەرمەكەی بۆی دەركەوت بایەخی زۆرە. لەسەر جانتا دەستییەكە سێ پیتی كورتكراوەی ناوی ئەو بە زێڕ هەڵكەنرابوو. ماكس بزەیەكی هاتێ و دەرگای جانتاكەی كردەوە.
دواتر ئەوەی لەناو جانتاكەدابوو، رژانە سەری و بڵاوبوونەوە. قیژەی گەیشتە ئاسمان.
دووپكشێكی زۆر. دەیان دووپشك. لانیكەم درێژایی هەر كامێیان دەگەیشتە دە سانتی مەتر. دووپشكەكان بە رەنگی قاوەیی تۆخ و پڕرەنگ بوون. دووپشكەكان لەسەر جەستەی وەجووڵە كەوتن و لەسەر كراسەكەی سەركەوتن. كوشەندەترین دووپشكەكانی سەر رووی زەوی لە جۆری *پارابوتوس*[٥٤] بوون.

---

52 - Hans
53 - Rudi
54 - Parabuthus

ماكس گرێندل له‌ پشته‌وه‌ به‌ عه‌رد كه‌وت و دووپشكه‌كان رێگه‌یه‌كیان بۆ ژێر كراسی دۆزییه‌وه‌. یه‌كه‌م دووپشك به‌ ملی وه‌دا. دواتر دووپشكه‌كان یه‌ك به‌دوای یه‌ك پێیانه‌وه‌دا.

ده‌نگی قیژه‌ی ماكس گرێندل له‌ ئه‌وكیدا خنكا.

زۆر پێش ئه‌وه‌ی كه‌ ژه‌هری دووپشك ماكس بكووژێ، دڵی له‌ لێدان وه‌ستابوو. به‌له‌مه‌ بچووكه‌كه‌ ئێستا به‌ره‌و دووڕگه‌ی گۆڕستانی ڤێنیز به‌ڕێكه‌وت. ره‌نگه‌ كاتێك گه‌شتیاره‌كان سه‌یری ناو به‌له‌مه‌ بچووكه‌كه‌یان ده‌كرد، پیره‌پیاوێكیان ده‌بینی كه‌ له‌كاتێكدا ده‌سته‌كانی بۆ ئه‌ملاو ئه‌ولا ئاوه‌ڵا كردووه‌، له‌ناو به‌له‌مه‌كه‌ راكشاوه‌ و به‌ چاوه‌ی بێ ڕووناكی سه‌یری ئاسمانی ڕوونی ڤێنیز ده‌كات.

## تەنیا بە بانگهێشت

ئەم شەوە کۆشکی بێوەژن سێ سەد ساڵ بۆ دواوە گەڕایەوە.
سرووشتێکی بەرچاو و چاوگر بوو. مەشخڵی نەوتیان پێکردبوو و گڕەکان هەموو گۆڕەپان و دەوروبەری خۆی بە رووناکایی داپۆشیبوو. خزمەتکاران بە جلەکانی شێوەی سەدەی هەژدەهەم، گۆرێی تەسك و تەنك، پێڵاوی نووك تیژ و جلیقە لەهاتووچۆدا بوون. مۆسیقاژەنەکان لەسەر ئەو سەکۆیانەی کە دوانیوەڕۆی ئەمڕۆژە ئەلێکس دروستکردنیانی بینیبوو، دانیشتبوون و مۆسیقایان دەژەنی. هەزاران ئەستێرە ئاسمانیان داگرتبوو و تەنانەت مانگیش لە ئاسمان دەدرەوشایەوە. واپێدەچوو هەر کەسێك ئەم میوانداریيەی پێکهێناوە، تەنانەت توانیبووی کەش و هەوا و ئاسمانیش بە کۆنترۆڵی خۆی دەربێنێ.
میوانەکان لەڕێگەی ئاو و وشکایی دەهاتنە ناو کۆشك. ئەوانیش جلی پێشینیان و کوت و تەنوورە و کڵاویان لەسەر بوو و پاڵتۆکەیان لە درێژییان دەگەیشتە سەر عەردی. هەندێکیان گۆچانیان لەدەست بوو. هەندێکیان شەمشێر و خەنجەر و نێزەیان پێبوو. بەڵام بە گشتی کەس نەدەبینرا کە ماسك و رووپۆشی بە رووخساریەوە نەبێ. جۆرەها نیقاب و ماسك کە زۆربەیان بە زێر و زیو و پەڕ رازاندرابوونەوە. ناسینی ئەوەیکە چ کەسانێك لەمیوانداری خاتوو رۆدمەندا بەشداریان کردووە سەخت و دژوار بوو و نەدەناسرانەوە. بەمحاڵەشەوە، هەر کەسێکیش نەیدەتوانی بێتە ژووری. رێگەی هاتنی گرندکاناڵ بۆ کۆشك بەسترابوو و هەموو میوانەکان بەرەو دەرگایەك رێنوێنی دەکران کە ئەلێکس ئەمڕۆژە

بینیبووی. چوار پاسەوان کە جلی رەنگ سووریان لەبەر بوو، لەوێ وەستابوون و کارتی بانگهێشتکراوەکانیان کۆنترۆڵ دەکرد.
ئەلێکس لە لایەکی دیکەی گۆڕەپانەوە تەماشای ئەمانەی دەکرد. ئەو لەگەڵ تام لەپشت دارێك وەستابوون کە نەدەبینران. رازی کردنی تام بۆ ئەوەیکە ئەویش بێت، زۆر دژوار بوو. دیارنەمانی ئەلێکس لە بەرنامەی خواردنی نانی نیوەڕۆ زۆر بەخێرایی ئاشکرا ببوو. تام باسی ژانە دڵی ئەلێکسی بۆ مامۆستا گرێی گێڕابۆوە و ئەویش لە نەبوونی ئەلێکس زۆر تووڕە ببوو. ئێوارەی ئەم رۆژە، کاتێك ئەلێکس بۆ هۆتێل گەڕایەوە، دەیتوانی لەگەڵ کێشەیەکی جددی رووبەڕووبێتەوە و ئەگەر خاتوو بێدفۆردشایر کە ئێستاش لە هەڵسووکەوتی ئەم رۆژەی ئەلێکس خۆشحاڵ بوو ناوبژیوانی نەکردبایە، ئەلێکسیان سزا دەدا کە ئەمشەو مافی چوونەدەر لە هۆتێلی نەبوو. بەهەرحاڵ، ئەوە ئەلێکس بوو و هەموویان دەیانزانی کە چاوەڕوانی هەڵسووکەوتی سەیروسەمەرە لە ئەلێکس دەکرێت.
بەڵام لەبارەی نادیاربوونی دووبارەی! دوایین شەوی مانەوەی گروپ لە ڤێنیز بوو و هەر بۆیەش رێگە بە منداڵەکان درابوو بۆ ماوەی دوو کاتژمێر بچنە هەر شوێنێك کە حەزیان لێیە، کە هەڵبەت مەبەست لەوە بوو کە لە سان لۆرێنزۆ بمێننەوە و یا بۆ رێستۆرانتێکی نزیك بچن و ئەگەر ویستیان، خواردنێك بخۆن. بەڵام ئەلێکس بەرنامەیەکی دیکەی هەبوو. ئەو بەر لە رۆیشتن بۆ هوتێل ئەو شتەی دەیویست بینیبووی، بەڵام دەیزانی کە ناتوانێ ئەم کارە بە تەنیایی بەڕێوەببات. بەم پێیەوە تامیش دەبوایە لەگەڵی بێت.
ئێستا تام بە دەنگێکی پڕ لە پاڕانەوە وتی:
- باوەڕ ناکەم کە تۆ بتهەوێ ئەم کارە بکەی. لەوە بگوزەرێین، چ خاڵێکی گرنگ لەم میوانییەدا هەیە؟
- ناتوانم بۆت شی بکەمەوە.

– بۆچی ناتوانی؟ هەندێ جار سەر لە کارەکانی تۆ دەرناهێنم و لێیان تێناگەم. بۆنموونە ئێمە هاوڕێین، بەڵام تۆ هیچکات لەبارەی خۆت قسە لەگەڵ من ناکەی.

ئەلێکس ئاخێکی هەڵکێشا. ئەو خووی بەم شێوەیە گرتبوو. کاتێك بیری لەم هەموو ئەم ڕووداوانە کردەوە کە لەماوەی شەش مانگی ڕابردوودا بەسەری هاتبوو، بینی کە ئەمە خراپترین بەشی کارە کە دەبێ بەڕێوەیببات. (ئێم ئای٦) ئەوی کردبوو بە سیخوڕ. هەروەها لەژێر کاریگەری هەڵسووکەوت و پلانەکانی (ئێم ئای٦) ئەلێکس نەیتوانی قووتابییەکی ئاسایی بێت. ئەو دەبێ لە دوو بواری جیاوازدا ململانێ بکات. یەکیان ڕزگارکردنی گۆی زەوی لە دەست سیلاحەکانی ناوەکی و ئەویتریان خوێندنی وانەی کیمیا لەگەڵ مامۆستایماڵەوە. نەیدەزانی پەیوەندی بە کێ و کوێوە هەیە. تام، جەك ستاربرایت و یا سابینا پلێژر[٥٥] – هەرچەند سابینا بۆ بەردەوام بوون لە ژیان بۆ ئەمریکا چووبوو. لەمانە بگوزەرێین، ئەو هاوڕێیەکی ڕاستەقینەی نەبوو. هەڵبەت بە هەڵبژاردنی خۆی بەم بارودۆخە نەگەیشتبوو. ئیشەکەی بەرەو ئەم بارودۆخەی هێنابوو.

ئەلێکس بڕیاری خۆی دا.

– زۆر باشە، ئەگەر یارمەتیم بدەی، هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم، بەڵام ئێستا نا.

– کەی؟

– سبەی؟

– سبەی بۆ ناپل دەچم و تا چەند ڕۆژێك لای براکەم دەمێنمەوە.

– بەر لەوەی کە بڕۆی.

تام وتی:

---

55 - Sabina Pleasure

– بەهەرحاڵ هاوکاریت دەکەم، ئەلێکس. هاوڕێکان دەبێ هاوکاری یەکتر بکەن و ئەگەر لەڕاستیدا حەز دەکەی شتێکم بۆ باس بکەی، دەتوانی سەبر بکەی تا ئەوکاتەی بۆ قووتابخانە دەگەڕێمەوە. زۆر باش؟
ئەلێکس سەرێکی جووڵاند و بزەیەکی هاتێ.
– سوپاست دەکەم؟
دواتر کۆڵەپشتییە وەرزشییەکەی کردەوە کە لە هۆتێلەوە لەگەڵ خۆی هێنابوو. ناو کۆڵپشتییەکە زۆر شتی تێدابوو کە دوانیوەڕۆی ئەمڕۆژە کریبوونی. لەماوەیەکی کوورت جلەکانی گۆڕی. پانتۆلیکی فش لە ئاوریشمی لەبەر کرد و جلیقەیەکی مەخمەری کردەبەر. ئەوکات هەویرێکی لەجۆری ژێلەی لە جانتاکای دەرهێنا کە بۆ رەنگکردنی جەستەی هێنابووی. نەختێك ژێلەی لەسەر بەری دەستی رۆکرد و بە ژێلە قۆڵەکانی، ملی و رووخساری رەنگ کرد. ئێستا تەواوی پێستی بەدەرەوەی جەستەی بەڕەنگی زێر دەرهێنابوو.
ئەلێکس نیقابێکی نیورۆخی ئامادە کردبوو کە تا سەر چاوەکانی دادەپۆشی. ئەو پێشتر لە فرۆشگەیەك ئەم ماسکەی کریبوو و داوای لێکردبوو نیقابێکی بداتێ کە وەکوو کۆیلە تورکەکان بچێت.
– ئامادەی؟
تام لەکاتێکدا کە دەستەکانی خستبووە ناو گیرفانی، سەرێکی بەنیشانی بەڵی جووڵاند.
– نەختێك دڵگران و خەماوی دەیێتە بەرچاو.
– گرنگ نییە، بەمەرجێك کاریگەر بم.
– وابزانم بە تەواوی عەقڵت لەدەست داوە.
ئەلێکس سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد، ئێستا ژمارێکی زیاتر لە میوانەکان بەرەو دەرگای کۆشك بەڕێوەبوون. ئەگەر بڕیاربێ پلانەکەی کاریگەر بێت، ئەوا دەبێ کاتێکی باش دیاری بکات. دەبوایە میوانێکی باش هەڵبژێرێت. ئەلێکس سەیرێکی کاناڵی کرد. تاکسییەکی شین وەستا و ژن و پیاوێك لێی هاتنەخوارێ. پیاوەکە کوتێکی فراکی

پۆشیبوو و پالتۆی ڕەنگ ڕەشی ژنەکەش لەدوای دەخشا. هەردووکیان نیقابیان لە رووخسار کردبوو. باش و نایاب بوون.
ئەلێکس بەسەر ئیشارەیەکی بە تام کرد.
– ئێستا.
– سەرکەوتوو بی، ئەلێکس.
تام شتێکی لە کۆڵەپشتی هێنایەدەر و بیٚ ئەوەی کە هەوڵ بدات بۆئەوەی نەبینرێت، بۆ پێشەوە چوو. دوای ماوەیەکی کورت ئەلێکس لە پەنای ڕەشایی گۆڕەپانەکەدا سووڕایەوە.
لەبەر دەرگای کۆشک شێواویان پێوەدیار بوو. پاسەوانێك کە کارتی بانگهێشتی بەدەستەوە گرتبوو، پرسیاری لە مێوانێك دەکرد. ئەمەش ڕووداوێکی بەسوود بوو. ئەلێکس پێویستی بە بچووکترین شێواوی و شەڵەژاویەوە هەبوو. تامیش ئاگاداری ئەم بارودۆخە باشە ببوو، چونکە لەناکاو دەنگێکی بەرز هات. هەموویان ڕوویان بۆلای دەنگە بەرزەکە وەرگێڕا و کووڕێکیان بینی کە پێدەکەنیٚ و هاوار دەکا. ئەو ترۆقەیەکی منداڵانەی تەقاندبۆوە و ئێستا کە هەموو سەیریان دەکرد ترۆقەیەکی دیکەی ئاگر دا. تام بە دەنگی بەرز چەند ڕستەی بە زمانی ئیتاڵی دەوتەوە کە ئەلێکس بۆی هەڵبژاردبوو.
ئێستا ترۆقەی دووهەمیش بە دەنگی بەرز تەقییەوە. لەم کاتەدا ئەلێکس بە خێرایی بەرەو کاناڵ و هەمان شوێن ڕایکرد کە ژن و پیاوەکە لە پەیژەکان بەسەر دەکەوتن. پێڵاوەکانی دەنگیان دەدایەوە، بەڵام کەس ئاگای لەئەو نەبوو. هەموویان سەیری تامیان دەکرد کە بە دەنگی بەرز خەریکی گۆرانی وتن بوو. ئەلێکس خوار بۆوە و داوێنی پاڵتۆی ژنەکەی گرت و لەکاتێکدا بۆلای دەرگای چوونەژوور دەچوو، ئەویش بەدوایدا بەرێکەوت.
پیلان ڕێك بەو شێوەیە بەڕێوەچوو کە ئەلێکس دەیویست. جەماوەرەکە زۆر زوو لە شێتایەتی تام وەڕەز بوون. پاسەوانێك ڕاسپێردرابوو بۆئەوەی تام لەویٚ دوور بخاتەوە. ئێستا ئەلێکس بەگۆشەی چاوی بینی کە تام

دەگەڕێتەوە و بەخێرایی دوور کەوتەوە. ژن و پیاوەکە گەیشتنە دەرگای کۆشك و پیاوێك کە کۆتی فراکی لەبەر بوو، کارتی بانگهێشتی نیشانی پاسەوانی دەرگا دا. پاسەوان کە وایزانیبوو ئەلێکسیش لەگەڵ ئەوانە، ڕێگەی چوونەژووری پێدان. بەبڕوای پاسەوان ئەم ژن و پیاوە بۆ بەشێك لە بەرنامەی خۆیان کووڕێکی بە ڕەگەز تورکیان لەگەڵ خۆیان هێناوە. بەڵام ژن و پیاوەکەش وایاندەزانی ئەلێکس خزمەتکاری کۆشکە و بۆ یارمەتی ئەوان دانراوە. بەهەرحاڵ، چ هۆیەك هەبوو کە ئەو ئەمکارە بکات؟

سێ کەسیی لە دەرگا تێپەڕین و بە هۆڵێکی گەورە و بەشکۆ گەیشتن کە بانەکەی لە کاشی دروست کرابوو. دینگەکانی سپی و عاردەکەشی لە بەردی مەڕمەڕ بوو و زۆر بەجوانی رازابۆوە و سەرنج راکێش بوو. دوو دەرگای شووشەیی بەرز بەرەو حەوشەیەك دەکرایەوە کە تێدا فەوارەیەکی یاو دەبینرا و گوڵ و ڕووەکی جوان دەورەیان دابوو. لانیکەم سەد میوان لەوێ کۆ ببونەوە و پێدەکەنین و دەیانخوارد و دەیانخواردەوە. وادیار بوو گشت میوانەکان لەوەیکە لەوێن، چێژ وەردەگرن. خزمەتکاران بە جلی یەك ڕەنگ، بە سینی پڕ لە خۆراك دەسووڕانەوە. پیاوێك بە پیانۆیەکی کۆن بەشێك لە مۆسیقای موزارت[56] و ڤیڤالدی[57] لێدەدا. بۆئەوەی هۆڵەکە و میوانداریيەکە جوانتر بێتەبەرچاو، چراکانیان کووژاندبۆوە، بەڵام دیواری پڕ لە مەشخەڵی نەوتی تایبەتمەندییەکی جوانیان بە هۆڵەکە بەخشیبوو.

گڕی چرا و مەشخەڵەکان لەژێر نەسیمی با وەسەما کەوتبوون.

ئەلێکس کە لەگەڵ پیاو و ژنەکە تا شوێنە کراوەکەی کۆشك هاتبوو، لەوێ لێیان جیا بۆوە بۆ ئەوەی بەدوای کارەکەی بکەوێت. سەری بەرز کردەوە و سەیرێکی سەرووی کرد. کۆشك بینایەکی سێ نهوم بوو. پەیژەیەکی

---

56 - Mozart

57 - Vivaldi

مارپێچــی ســێ بینایەکــەی بەیەکــەوە دەبەســتەوە. نهــومی ژێــرەوە بــۆ میوانداری رازابۆوە کە تێدا ژوور و دینگەیەکی زیاتری تێدابوو. هەندێ لە میوانــەکان خۆیــان گەیانــدبووە ئــەوێ و بــەئارامی هــەنگاویان دەنایــەوە و لــەوێوە ســەیری میوانــداری خواروویــان دەکــرد. ئــەلێکس ســەیرێکی دەوروبــەری خــۆی کــرد و بەلایــەوە ســەیر بــوو کــە لــە ســەدەی بیســت و یەکەمدا شوێنێکی ئەمجۆرە هەبێ. دیوارەکانی کۆشك وەهەم و خەیاڵێکی زۆریان پێکهێنابوو.

ئێستا کە ئەلێکس لەناو کۆشکدا بوو، رێك نەیدەزانی کە بەدوای چیدا دەگەڕێ. ئایا بەڕاستی دوویشکی دۆزیوەتەوە. چۆن دەیتوانی لەوە دڵنیا بێت کە ئەمە هەمان دوویشکە کە لێی دەگەڕێ؟ بیری لەوە کردەوە کە ئەگەر یاسین گرگوروویچ راستی وتبێ و باوکی سەردەمانێك بۆ ئەم کەسانە ئیشی کردبێ، رەنگە بە دیتنی ئەو زۆریش خۆشحاڵ بن. دەیتوانی لێیان بپرسێ کە چی روویداوە، باوکی چۆن مردووە. بێشك ئەوان رووداوەکەیان بۆ دەگێڕایەوە. ناچار نەبوو جلی ئاوا بپۆشێ.

بەڵام ئەگەر هەڵەی کردبێ، چی؟ ترسی لە رووخساری ئەو ژنە پیرەدا بینیبوو کە کاتێك ئاماژەی بە وشەی دوویشك کردبوو، ئەو زۆر ترسابوو. جگە لەم مەسەلەیە، ئەم پیاوە تووڕە و زەبەلاحانەشی لە دەرەوەی کۆشك بینیبوو کە ئیشیان دەکرد. ئەوان بە زمانی ئینگلیزی دەدوان و ئەلێکس بیری لەوە کردەوە کە ئەگەر ئەوان پێیبزانن و لێی بپرسن لێرە چی دەکات، هیچ وەڵامێکی بۆ ئەوان پێ نییە.

نا. بەر لەوەی جووڵەیەك بکات، دەبێ زانیاری زیاتر بەدەست بێنێ. ئەم ژنە کێ بوو؟ خاتوو رۆدمەن؟

لەوێ چی دەکرد؟ ئەلێکس بەمێشکی داهات کە ئەم میواندارییە رووپۆشییە رەنگە هیچ پەیوەندییەکی بە رووداوێکی چواردە ساڵ لەمەو پێش نەبێ.

دەنگی پیانۆ بەرز بوو. بە هاتنی میوانی زیاتر، دەنگی گفتوگۆی ئەوانیش بەرزتر دەبیسرا. زۆربەیان ماسکەکەیان لەرووخسار هەڵگرتبوو.

ئاخر بە ماسکەوە نەدەکرا خۆراك و خواردنەوە بخۆن. ئێستا ئەلێکس هەستی دەکرد لەڕاستیدا میواندارییەکی نێودەوڵەتی پێکهاتووە.
میوانەکانی زۆربەیان بەزمانی ئیتاڵی قسەیان دەکرد، بەڵام لەنێوانیاندا ژمارێکی زۆر ڕەش پێست و ئاسایی تێدابوو. چینییەکی کورتەباڵا قسەی لەگەڵ پیاوێك دەکرد کە ددانێکی زێڕ بوو. ژنێك لەبەردەمی تێپەڕی کە وایدەزانی دەیناسیّ. دواتر زانی کە یەکیّ لە ناودارترین ئەستێرەکانی ژنی سینەمای جیهانە. ئێستا کە باشتر لە دەورووبەری خۆی ورد بۆوە، بینی کە ئەستێرەکانی هۆلیوود[٥٨] ئەوێیان پڕ کردووە. بۆچی ئەوان بانگهێشت کراون؟ دوایی وەبیری هاتەوە. دەسپێکی مانگی سێپتەمبەر بوو، یانی کاتی دەسپێکی بەڕێوەچوونی فستیڤالی فیلمی ڤێنیز بوو. ئێستا هەستی دەکرد کە خاتوو ڕۆدمەنی زیاتر درك کردووە.
ئەلێکس ئەوەشی دەزانی کە نابیّ زیاتر لەویّ بمێنێتەوە. بەهەرحاڵ ئەو تاکە مێرمناڵی ئامادەبووی ئەم کۆڕە بوو و درەنگ یا زوو کەسێك هەستی پێدەکرد. جەستەی بە تەواوی تەمەنی نیشان دەدا. قۆڵ و شانەکانی ڕووت بوون، پانتۆلی ئاوریشمی ئەو بە ڕادەیەك ناسك بوو کە وای هەست دەکرد هیچی لەبەردا نییە. ڕەنگە قەڵافەتی تورکانەی یارمەتی دابیّ بێتە ناو کۆشك، بەڵام ئێستا لەنێوان ئەم هەموو میوانەدا بەشێوەیەکی بەرچاو جیاوازی پێوە دیاربوو. بڕیاری دا کاریّ بکات. لە نهومی ژێرەوە خاتوو ڕۆدمەن نەدەبینرا. خاتوو ڕۆدمەن ئەم کەسە بوو کە زیاتر لە هەمووکەس حەزی دەکرد ببینیّ. ڕەنگە دەیتوانی لە نهومەکانی سەرووتر بیدۆزێتەوە.
ئەلێکس پێی خستە سەر پەیژە مارپێچەکە. لە نهومی سەرووتر چاوی بە دەرگایەکی زۆر کەوت. لێرە جەماوەرێکی کەمتری لێبوو و چەند کەسێك وردبینانە سەیریان دەکرد. ئەلێکس دەیزانی گرنگ ئەوەیە کە نابیّ دوودڵی لەخۆی نیشان بدات. ئەگەر کەسێك پرسیاری لە ئەلێکس کردبا،

---

[58] - Hollywood.

بێشك دەریان دەکرد. لە دەرگایـەك تێپـەڕی و گەیشـتە ڕێڕەوێـك و ژوورێـك کـە شـێوەی تایبـەتی خـۆی هـەبوو. ئاوێنەیـەك بـە چوارچێوەیەکی زێـڕین لەسـەر دیـوار، لەسـەر مێزێکـی زۆر بـەنرخ. سـەرووی مێزەکـەیان بـە گوڵـدانێکی گـەورەی پـڕ لـە گـوڵ ڕازانـدبۆوە. کـەنتۆرێکی زۆر گـەورەی تایبـەت بە جل ڕووبـەڕووی مێزەکە دەبینـرا و جگـە لەمانـە هیـچ شتێکی دیکە لەناو ژوورەکەدا نەبوو..

دەرگایـەك لـە سوچـی ژوورەکـەدا بـوو. ئـەلێکس ویسـتی بـۆلای دەرگاکـە بچێت کـە دەنگـی چەند کەسێکی گـوێ لێبـوو کـە لێـی نزیـك دەبوونـەوە. بـەدوای جێگەیـەك گـەڕا کـە خـۆی تێـدا حەشـار بـدات و هـیچ شـوێنێکی نـدۆزیەوە، جگە لە کەنتۆرکە. لەم ڕوویەوە، ویستی لە تەنیشت کەنتۆرەکە خۆی بە دیوارەوە مـەلاس بـدات. ئێرەش وەکوو نـاو حەوشـە بـە ڕووناکی مەشخەڵەکان ڕوون بوو. بیری لەوە کردەوە کە گەورەیی کەنتۆرەکە ڕەنگە بتوانێ سێبەرێ پێکبێنێ و ئەویش لە پەنای ئەودا خۆی بشارێتەوە.

دەرگـا کرایـەوە و دوو کـەس هاتنـە ژوورەوە. بـەزمانی ئینگلیـزی قسـەیان دەکرد. یەکێکیان پیاو و ئویتریان ژن بوو.

ئەلێکس دەنگی پیاوەکەی ناسییەوە:

– ئیزنـی هـاوردە کـردنیم وەرگرتـووە. تـا دووسـبەی بەدەسـتمان دەگـات. هەر ئەمجۆرەی کە دەزانن خاتوو ڕۆدمەن، کات زۆر گرنگە.

– زنجیری سارد.

– بەڵێ، ڕێك. بەهیچ شێوە نابڕێت. سندوقەکان بۆ ئینگلتەرا دەنێردرێت، دوای ئەو....

– سوپاسـت دەکـەم، دکتـۆر لیبرمـەن. کارەکـەتان زۆر بـە باشـی بەڕێوەبردووە.

ئێستا ئەوان لە جێگەیەك وەستابوون کە ئەلێکس نەیدەتوانی بیانبینێ. ئـەلێکس نـەختێك خـۆی کێشـایە پێشـەوە. لـەپێش ئاوێنـە وەسـتابوون و لەناو ئاوێنەدا دەبینران.

خاتوو رۆدمەن سەرسووڕهێنەر بوو. ئەلێکس نەیدەتوانی هێمایەکی دیکە لە ئەو وەسف بکات. ئەو زیاتر لە هەموو ئەستێرەکانی سینەمایی بە ئەستێرەی جوانی سینەمایی دەچوو کە لە خوارەوە بوون. مووی درێژ و رەنگ رەش تا سەر شانی پەرێشان و پەخشان کرابوو. نیقابێکیشی هەبوو کە بەدەستەوەی گرتبوو و هەربۆیەش ئەلێکس دەیتوانی رووخساری ببینێ، بە چاوی رەش و درەوشاوە، لێوەکانی سوور بە رەنگی خوێن و ددانە سپی و بریقەدارەکان، جلێکی زۆر جوانی پۆشیبوو. بەبڕوای ئەلێکس کە جلەکانی بەشێوازی کۆن نییە، بەڵکوو لە جوانیدا بێ وێنەیە. ملوانکەیەکی زێڕی لە مل کردبوو.

ئەو کەسەی کە لەگەڵی بوو، ئەویش جلێکی سەیری لەبەر کردبوو. کلاوێك بە لێوی پانەوە و پەنجەوانەی چەرمی لەدەست بوو. ئەویش نیقابێکی بەدەستەوە بوو کە چاوی ناشیرین و ورد بە نووکی بەرزی بە نمایش دەردێنا. قەلافەتی کۆلکە دکتۆرەکانی هەبوو و بەبڕوای ئەو پێویستی بە لەبەرکردنی جلی جوان نییە. رووخساری رەنگی لەبەردا نەمابوو و بێ رۆح بوو. بالایەکی زۆر بەرزی هەبوو کە بۆ قسەکردن لەگەڵ خاتوو رۆدمەن دەبوایە خۆی بۆ خوار بکاتەوە. بۆ ئەلێکس ئەم پرسیارە لەئارادابوو کە بۆچی ئەو بۆ ئەم میوانییە بانگهێشت کراوە.

دکتۆر لیبرمەن لە کاتێکدا چاویلکەی لەسەر چاو هەڵدەگرت، بە دەنگێکی تووڕە و بێ قەرار وتی:

- خاتوو رۆدمەن، تۆ بەڵێنیت داوە کە کەس نەکوژرێ.

خاتوو رۆدمەن وەلامی دایەوە:

- ئایا ئەوە گرنگە؟ ئێوە پێنج ملیۆن یۆرۆ وەردەگرن. باش بیر بکەوە، بەڕێز لیبرمەن، پارەیەکی کەم نییە. تۆ دەتوانی عومرێکی پێ بژی.

ئەلێکس جارێکی دیکە سەیری ئاوێنەی کرد. خاتوو رۆدمەن چاوەڕوانی قسەی دکتۆر لیبرمەن بوو. بەلام دکتۆر لیوەکانی وشك ببوون، لەنێوان ترس و دوودڵیدا مابۆوە.

بەهەرحاڵ دکتۆر دەمی کردەوە:

- نازانم، رەنگە ئەگەر پارەیەکی زیاتر بدەن...
خاتوو رۆدمەن وەڵامی دایەوە:
- بەم پێیەوە، وابزانم باشترە لەسەر ئەو کارەی کە دەیکەی زیاتر بیر بکەیتەوە! بەڵام واباشترە ئەم میوانییە بە قسە لەبارەی تیجارەت و بازرگانی خراپ نەکەین. من خۆم تا دوو رۆژی دیکە بۆ ئامالفی[59] دێم. دەمەوێ کاتێك بارەکە بار دەکرێ، لەوێ بم. لەبارەی پارەش هەر لەوێ بەیەکەوە قسە دەکەین.
خاتوو رۆدمەن بزەیەکی هاتێ. زۆر ئارام و لەسەرەخۆ دەهاتەبەرچاو.
- ئێستا ئەگەر حەزت لێیە بچینە خوارێ و بە هاورێکانمت بناسێنم.
ئەوەی وت و بەرێکەوتن و بەقسە کردنەوە لەتەنیشت ئەلێکس تێپەڕین. بۆ ماوەیەك، ئەلێکس لەوە دوودڵ بوو خۆی نیشانی خاتوو رۆدمەن و دکتۆر لیبەرمەن بدات. ئەو هەمان ژنە بوو کە بۆ دۆزینەوەی بۆ ئێرە هاتووە. دەبێ بەر لەوەی لەناو جەماوەر ون بێ، خۆی بگەیەنێتی. بەڵام وەبیر زنجیری سارد و داگرتنی بار کەوتەوە. نەیدەزانی لەبارەی چ شتێکدا قسە دەکەن. هەربۆیەش، بیری لەوە کردەوە واباشترە بەر لەوەی خۆی ئاشکرا بکات، زانیاری زیاتر بەدەست بێنێ.
ئەلێکس چووە ناو رێرەوەکە و لەو دەرگایە تێپەری کە خاتوو رۆدمەن و هاوکارەکەی هاتبوونە دەرەوە و خۆی لە ژوورێکی زۆر گەورەدا دۆزیەوە. بەراستی کە کۆشکێکی زۆر گەورە بوو.
درێژایی هۆڵەکە بە سی مەتر دەگەیشت. لە عەرد تا بانەکەی شووشەیەك بوو کە سرووشتی گرندکانەلی بەنمایش دەدردێنا. عەردی هۆڵەکە لە داری بریقەدار دروست کرابوو، بەڵام لەوە کە بگوزەرێن، هەموو شتێکی ئەم هۆڵە رەنگی سپی بوو. لەپێش کوورەیەکی بەردیی گەورە کە لە بەردی مەرمەر دروست کرابوو، پێستێکی بەبریان لەسەر عەردەکە راخستبوو. لەسەر دیوار کتێبخانەیەکی رەنگ سپی گەورەی لێبوو.

---

59 - Amalfi.

کتێبەکان بە بەرگی چەرمی لەناو کتێبەخانەکەدا دانرابوون. لە تەنیشت دەرگای دیکەی هۆڵەکەدا، لەسەر مێزێکی جوانی ڕەنگ سپی، شتێکی وەکوو کۆنترۆڵێکی ڕێگەی دووری تەلەفزیۆنی وەبەرچاو دەکەوت. لەناوەڕاستی هۆڵەکەش مێزێك لە داری گوێز. ئایا ئەمە مێزی خاتوو ڕۆدمەن بوو؟ ئەلێکس بۆلای چوو.

لەسەر مێزەکە جگە لە لەتە چەرمێکی سپی و سینییەك کە تێدا دوو قەڵەم دەبینران، هیچ شتێکی دیکەی لێنەبوو. ئەلێکس وای بیر کردەوە کە خاتوو ڕۆدمەن لەپشت ئەم مێزە دانیشتووە. لەو مێزانەی کە زیاتر دادوەر یا بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی گەورەرە کەڵکی لێوەردەگرن. ئەلێکس بە خێرایی سەیرێکی دەوروبەری کرد. دەیویست لەوە دڵنیا بێت کە کامێرای شاراوەی لێنەبێ. ئێستا کەشەوێکی مێزەکەی کێشایە دەرێ. کەشەوەکە دانەخرابوو، بەڵام تەنیا پاکەت و کاغەزی تێدابوو. ئێستا بۆلای دووهەمین کەشەو چوو. بەسەیرەوە بینی ئەمەشیان کراوە بوو. بەڵام فایلێکی تێدابوو و ڕەنگی بەرگەکەی زەرد بوو و ناوێکی بە ڕەنگی ڕەشی لەسەر چاپ کرابوو:

ڕێکخراوی کونسانتۆ[٦٠]

ئەلێکس فایلەکەی هەڵدایەوە. لە لاپەڕەی یەکەمیدا وێنەی بینایەکی تێدا چاپ کرابوو و ئادرەسێکیشی لەژێر نووسرابوو: شەقامی نۆڤا[٦١]، ئامالفی.

ئامالفی. ئەمە هەمان شوێنە کە خاتوو ڕۆدمەن چەند خولەك پێشتر ئامارەی پێکردبوو.

ئەلێکس سەیری لاپەڕەی دواتری کرد. وێنەی ژن و پیاوێکی زۆر بە جلی فەرمی و کۆتی سپی تێدا چاپ کرابوو. ڕەنگە ئەمانە فەرمانبەرانی کونسانتۆ بوون. یەکێ لەوان کە لەنێوان ڕیزی سەرەوە وەستابوو، هارۆلد

---

60 - Consanto.

61 - Nuova.

لیبرمەن بوو. ناوی ئەویان لەژێر وێنەکەی تایپ کردبوو، بەڵام بە زمانی ئیتاڵی بابەتێك نووسرابوو. ئەلێکس نەیدەتوانی لەم نووسراوەیە تێبگات.
ئەلێکس فایلەکەی بەست و کشەوێکی دیکەی تاقی کردەوە.
شتێ بەجووڵە کەوت.
ئەلێکس باش دەیزانی کە بە تەنیایە. ئەو لەوەیکە هیچ پاسەوان یا پیاوێکی ئەم کۆشکە لە ژوورەکە نییە، تووشی سەرسوورمان ببوو. بەتایبەت ئەگەر ئەم هۆڵە شوێنی کاری خاتوو رۆدمەن بووبێت، زۆر سەیر دەهاتە بەرچاو. بەڵام ئێستا لەناکاو ئاگاداری ئەوە بۆوە کە گۆڕانکارییەك پێکهاتووە. چەند چرکەیەکی پێچوو تا زانی چی رووی داوە. لەناکاو هەستی بە بوونی بوونەوەرێك لە پشت سەری خۆی کرد.
ئەوەی کە ئەو پێیوابوو پێستی بەبرە، ئێستا لە سەر جێگەی خۆی هەستابوو. بەبر بوو، زیندوو و تووڕە.
بەبرێکی سیبریایی. لەکوێوە زانی کە سیبریاییە؟ هەڵبەت لە رووی رەنگەکەی ئەمەی زانی. خەتی ریَ ڕێی سەر جەستەی بەبر سپی و زەرد بوون، نەوەك پرتەقاڵی و رەش.
بەبرەکە بە تووڕەیی سەیری ئەلێکسی کرد.
ئەلێکس هەوڵی دا وەبیر خۆی بێنێتەوە کە لەبارەی ئەم گیانلەبەرە چ زانیارییەکی هەیە. کەمتر لە پێنج سەد بەبری سیبریایی لە دونیای وەحشدا ماون. بەبری سیبریایی گەورەترین بەبری دونیا بوو و پەنجەکانی کۆ دەبنەوە.
ئەمە خاڵێکی گرنگ بوو کە زانیاری لەسەری هەبوو تا بە هێرشێك لەبەریەکی دابدڕێ.
واپێدەچوو بەبر لە خەوێکی قووڵ بەخەبەر هاتبێ. بەڵام ئێستا بە چاوە زەردەکانی تەرکیزی لەسەر ئەلێکس کردووە. ئەلێکس هەستی کرد کە هەست بەو پەیامە دەکات کە لە مێشکی بەبرەکە دایە. خۆراك؟ ئێستا وەبیر ئەلێکس هاتەوە کە بەبرەکانی سیبریایی دەتوانن لە ژەمە خۆراکێکدا سەد پاوند گۆشت بخۆن.

پرسیارگەلێکی سەیروسەمەرە بە مێشکی ئەلێکسدا دەهات. ئەمە چ جۆرە ژنێکە کە پاسەوان و کامێرای شاراوەی لەناو کۆشکەکەیدا نییە، بەڵام لە تەنیشت مێزی کارەکەی بەبرێکی راگرتووە؟ ئێستا بەبر جووڵەیەکەی دایە جەستەی. ماسوولکەی بەهێز و قەڵافەتێکی گەورەی هەبوو. هەوڵی دا تەکانێ بخوا، بەڵام نەیتوانی. نەیدەزانی چی رووی داوە، بەڵام بەم ئەنجامە گەیشت کە ترساوە. ئەلێکس لەشوێنی خۆی وشك هەڵگەڕابوو. ئەو لەبەردەست گیانلەبەرێکی دڕندەدا بوو کە بەسەدان ساڵ ترسی خستبووە ناو دڵی گیاندارانی دیکە. هەروەها، باوەڕی بەوە نەبوو کە ئەم دڕندەیە لە کۆشکێکی ڤێنیزدا زیندانی کرابێ. بەڵام بەهەر حاڵ ئەمە رووی دابوو و لەم بارودۆخەدا تەنیا بوونی بەبرەکە بۆ ئەلێکس گرنگ بوو.

بەبر نەڕەیەکی ئارامی کرد. ترسناکترین دەنگێ بوو کە ئەلێکس لە هەمووو ژیانیدا گوێی لێبببوو. هەوڵی دا هێزی کۆ بکاتەوە و جووڵەیەك بەخۆی بدات. دەیویست بەربەستێك لەنێوان خۆی و بەبەرەکە پێك بێنێ. چاوی تار بوون. بەبر دەمی کردەوە و دوو ریز ددانی سپی و تیژی نیشان دا. بۆ دووهەم جار نەڕاندی. ئێستا دەنگ بەرزتر و بەردەوامتر بوو.

بەبر خۆهاویشتنی خۆی دەست پێکرد.

## شەپۆلی لافاو

ئەلێکس تەنیا کارێك کە دەیتوانی بیکات، کردی. ئەو کە خۆهاویشتنی بەبری پێنج سەد پاوندی بۆ لای خۆی بینی، خۆی خستە سەر چۆك و خۆی لەژێر مێزەکە حەشار دا. بەبر لەسەر ئەو کەوتەخوار. هەستی بە گەورەیی جەستەی بەبرەکە دەکرد. تەنیا مێزەکە لەنێوان ئەو و بەبرەکەدا بوو. گوێی لە دەنگی رۆچوونی پەنجەکانی بەبر لەسەر مێزەکە دەبوو. دوو بیر کەوتە مێشکی. یەکەم ئەوەیکە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم گیانلەبەرە زەبەلاح و بەهێزە بەهیچشێوەیەك ناکرێ و دووهەم ئەوەیکە، ئەگەر بەخێرا نەتوانێ رێگەیەك بەرەو دەرەوە بدۆزێتەوە ئەوا فەوتانی مسۆگەرە. ئەم دوو بیرەی هاتە ناو هزری.

بیری یەکەم دوو دەرگا لەناو ژوورەکەدا هەبوو. ئەو دەرگایەی کە لێی هاتبووە ژوور، لەئەو نزیکتر بوو. نیوەی بەبرەکە لەسەر زەوی و نیوەکەی دیکەی لەسەر مێز بوو و بەشێوەی کاتیی گێژ و کاس دەهاتەبەرچاو. لە ناو دارستاندا خێرا دەیتوانی ئەلێکس بدۆزێتەوە. بەڵام کاتێك کە لە مێزەکە دوور کەوتەوە، تازە ئاگاداری ئەوە بۆوە کە لەم کارە سوود وەرناگرێت.

بەبر سەیری دەکرد. پەنجەی قاچەکانی پێشووی بەبر لەسەر مێز بوون. هیچکامیان بچووکترین جووڵەیان نەبوو. ئەلێکس ئاگاداری ئەوە بۆوە کە دەرگا زۆر لە ئەو دوورە. جێگەیەکەی دیکەی بۆ خۆشاردنەوە نەبوو. تووڕەییەکی زۆر دایگرتبوو. هیچکات نەدەبوایە بێتە ئەم ژوورە. دەبوایە زیاتر ئاگای خۆی بێت.

بەبر نەڕاندی. دەنگی، دەنگەکەی مەترسیدار بوو.

بەڵام هەر لەم کاتەدا دەرگای دووهەم کرایەوە و پیاوێك هاتە ژوورێ.

هەموو هۆشی ئەلێکس لەسەر بەبرەکە بوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوی زانی کە ئەو پیاوە جلی فەرمی قەدیمی نەپۆشیوە. تیشەرت لەگەڵ پانتۆڵێکی جینی لەبەر بوو. واپێدەچوو جلەکانی زۆر گرانبەهان. بەپێی ئەم تیشەرتەی کە دەست و جەستەی داپۆشیبوو، ئەلێکس ئەمەشی زانی کە لەرووی جەستەییەوە زۆر ئامادەیە. لاو بوو و قۆناغی بیست ساڵی تێپەڕاندبوو. رەشپێست بوو.

بەڵام کێشەیەك لەئارادابوو.

کاتێك کە رووی وەرگەڕاند، ئەلێکس بینی کە لایەکی رووخساری لە پەڵەی سپی داپۆشراوە. واپێدەچوو لە رووداوێکی کیمیایی و یا ئاگردا تووشی ئەم سووتانە بووە. دوایی ئەلێکس ئاگاداری دەستەکانی بۆوە. دەستەکانیشی رەنگی جیاوازیان هەبوو. پیاوە لاوەکە واپێدەچوو جوان بووبێت، بەڵام بەمحاڵەوە سەر و بارودۆخێکی ئاڵۆزی هەبوو.

پیاوەکە خێرا سەیری بارودۆخەکەی کرد. بینی کە بەبرەکە ئەوەندەی نەماوە خۆی باوێ. خێرا دەزگەی کۆنترۆڵی رێگەی دووری لەسەر مێزەکە هەڵگرت و روو بە بەبرەکە پەنجەی بە دوگمەیەکەوە نا.

دوایی ئەوەی زۆر سەیر بوو رووی دا. بەبرەکە لەسەر مێزەکە هاتەخوار، چاوەکانی کز بوونەوە و لەسەر عەردەکە راکشا. ئەلێکس زۆر بەسەیری ئەم دیمەنەی بینی. بەبر لەناکاو ئەم گۆڕانکارییەی بەسەردا هات و لە گیانلەبەرێکی دڕندەی مەترسیدار وەکوو پشیلەیەکی ئارام و جوانی لێهاتبوو. دوای ماوەیەکی کورت، چاوەکانی بەبر بەستران و خەوی لێکەوت. بە هەر هەناسەیەك، سینگی دەهاتە سەر و دەچووە خوارەوە.

چۆن ئەم رووداوە رووی دابوو.

ئەلێکس سەیری ئەو پیاوەی کرد کە ماوەیەك لەمەوپێش هاتبووە ناو ژوورەکە. ئێستاش دەزگەی کۆنترۆڵی لە رێگەی دوورەوە، یا هەر شتێکی دیکە کە بوو، لەناو دەستەکانیدا بوو. ئەلێکس بیری لەوە کردەوە کە ئەگەری ئەوە هەیە ئەم بەبرە بەبرێکی راستەقینە نەبێت. ئایا دەیتوانی رۆبۆتێك بێت کە بە ئامێرێکی رێگەی دوورەوە کۆنترۆڵ بکرێ؟ نا، ئەوە

بیرکردنەوەیەکی سەیر و سەمەرەیە. ئەو بەڕادەی پێویست لە بەبرەکە نزیك ببۆوە بۆئەوەیکە ئاگاداری هەموو شتێ بێتەوە. ئەو بۆنی هەناسەی بەبرەکەی کردبوو. ئێستا بەبر لە بارودۆخێکدا بوو کە واپێدەچوو بۆ دارستانیك گەڕابۆوە کە تایبەت بە خۆیەتی. ڕەنگە لە خەونیدا دەیدیت کە چی رووی داوە. گیانلەبەرێکی زیندوو بوو، بەلاّم وەکوو ئەوە دەچوو کە گلۆپێك دەکووژێنێتەوە و گۆڕانکاری تەواوی بەسەردا هاتبوو.

ئەلێکس بەدوای بەلەمێك کەوتبوو کە وێنەی دووپشکێکی لەسەر هەڵکەندرابوو و دوایی گەیشتووەتە بینایەکی سەیر لە ئیتالیا.

پیاوەکە بە زمانی ئیتالی پرسیاری لێکرد. ئەلێکس لە تاك بە تاکی وشەکان نەگەیشت، بەلاّم لەوە تێگەیشت کە پرسیاری لێدەکات:

- تۆ کێی و لێرە چی دەکەی؟

ئەلێکس هەستایە سەرپێ. ئارەزووی ئەوەی دەکرد کە بریا بتوانێ جلەکانی بگۆڕێت. نەیدەزانی کە ئایا ئێستاش تام لە دەرەوە چاوەڕوانێتی یا نا. نا چاوەڕوانی نییە، چونکە پێی وتبوو بۆ هۆتێل بگەڕێتەوە.

پیاوەکە بۆ جاری دووهەم قسەی لەگەڵ کرد. چارەیەکی نەبوو، دەبوایە وەلاّمی بداتەوە.

- من زمانی ئیتالی نازانم.

ئێستا پیاوەکە زۆر بە ئاسایی بە زمانی ئەلێکس قسەی کرد.

- تۆ ئینگلیزی؟

- بەڵێ.

- لە ژووری خوێندنەوەی خاتوو ڕۆدمەن چی دەکەی؟

- ناوم ئەلێکس رایدەرە-

- ناوی منیش نیل١ ە. بەلاّم ئەمە پرسیاری من نەبوو.

- من بەدوای دووپشکدا دەگەڕێم.

پیاوەکە - نیل - بزەیەکی هاتێ و ددانەکانی بە نمایش دەرهێنا. ئێستا کە بەبرەکە خەوتووە، کەواتە ئەلێکس کاتی زیاتری هەیە تا لە نزیکەوە

سەیری بکات. ئەگەر کێشەی پێستی نەبوایە، پیاوێکی زۆر جوان بوو. ڕووخساری تاشیبوو، جلێکی جوانی لەبەر بوو و لەڕووی جەستەشەوە ئامادە بوو. پرچی کورت بوو. لەگەڵ ئەوەیکە دەیویست بە ئارامی خۆی نیشان بدات، بەڵام ئەلێکس هەستی دەکرد کە ئامادەی شەڕ و ململانێیە. ئەو پیاوێکی مەترسیدار بوو. متمانەیەکی زۆری بەخۆی هەبوو. لەوەیکە مێرمندالێکی لەم ژوورە بینیوە، هیچ بەلایەوە سەیر نەبوو و هەستی بە مەترسی نەکردبوو. بەپێچەوانە بەلایەوە سەیرتر بوو.

– چی لەبارەی دوویشکەوە دەزانی؟

دەنگێکی نەرم و زوڵاڵی هەبوو.

ئەلێکس وەڵامێکی نییە.

نیل وتی:

– ناوێکە کە لە خوارەوە بیستووتە. ڕەنگە لەسەر مێز دۆزیبێتەوە. ئایا ناو مێزت گەڕاوە؟ ئایا بۆ ئەم کارە هاتوویەتە ئێرە؟ ئایا تۆ دزی؟

– نا.

ئەلێکس بەم ئەنجامە گەیشت کە تا ئێرەش بەسە. ئێستا ڕەنگە کەسێکی دیکە بێتە ژووری. کاتی ڕۆیشتن بوو. گەڕایەوە و بۆلای ئەم دەرگایە ڕۆیشت کە لێی هاتبووە ژووری؟

نیل دەنگی بەرز کرد:

– ئەگەر هەنگاوێکی دیکە بنێیتەوە، بەداخەوە دەبێ بتکوژم.

ئەلێکس نەوەستا، لەناکاو لەسەر پاژنەی پێی سووڕایەوە و بەپێ لێدانێکی ئاراستەی سکی نیلی کرد. ئومێدەوار بوو لانیکەم بۆ ماوەیەکی کەم گێژی بکات. بەڵام بە سەرسووڕمانەوە بینی کە پێی تەنیا هەوای بڕیوە. نیل بە جووڵەیەکی خێرا خۆی کێشابۆوە دواوە. ئێستا ئەلێکس بۆ جارێکی دیکە سووڕایەوە و ویستی بە لێدانی کیزامی– زوکی[٦٢] کە لە کاراتیدا فێری ببوو، هێرش بکاتە نیل. بەڵام ئەم هەوڵەشی بێ ئەنجام

---

[62] - Kizami-Zuki

مایــەوە. نیـل توانیبـووی بـە کشـانەوەیەکی خێـرا لـەم لێدانـەش خـۆی بپارێزێت.

ئێستا نۆرەی نیل بوو کە لێدانێکی توند ئاراستەی ئەلێکس بکات. چاوی ئەلێکس وەرەشکە و پێشکە کەوت و هاوسەنگی لەدەست دا. ئەنێکس بە نائومێدی ویستی شێوازی بەرگریی بگرێیت، بەلاّم نیل لێی تێگەیشتبوو. ئەلێکس هەستی کرد دەستێك بەرەو قورگی دێت و دەستی دیکەی لەسەر سەری ئەلێکسی دانا. نیل دەیتوانی بە جوولّەیەك ملی ئەلێکس بشکێنێ.

– نەدەبوایە ئەم کارەت کردبا.

نیـل بـەجۆرێك قسـەی دەکـرد وەکـوو ئـەوەی لەگـەڵ منـاڵێکی کـەم تەمـەن بدوێ.

– ئاگادارم کردییەوە ، بەلاّم تۆ گوێت نەگرت. هەر بۆیـەش، دەبێ بمری.

ئـەلێکس هەسـتی بـە ژانێکـی زۆر دەکـرد، رووناکییـەکی سپی و دوایـیش هیچ شتێك.

ئەلێکس لەکاتێکدا وەهۆش هاتەوە کە هەستی دەکرد سـەریان لـە جەسـتە کردووەتەوە. تەنانەت کاتێك چاوەکانی کردەوە، چەند چرکەیەکی پێچوو تا بینایی خۆی بەدەست هێنایـەوە. هـەوڵی دا دەسـتی بجووڵێنێ. کاتێك ئــەمکارەی کــرد، بــەم ئەنجامــە گەیشــت کــە ملــی نەشــکاوە. هــەوڵی دا ئەوشـتەی کـە بەسـەری هـاتووە وەبـیر خـۆی بێنێتـەوە. بێشـك نیـل لـە کۆتاییـدا ملـی وێـڵ کـردووە. ئـەلێکس پێشـتریش بـە لێـدانی ئـەمجۆرە بێهۆش ببوو، بـەلاّم بەم هەموو ژانـەوە نا. ئـەو هەر لـە سـەرەتای ململانێ لەگـەڵ نیـل هەسـتی بـەوە کـرد کـە لەگـەڵ مامۆسـتایەکی وەرزشـی بـەتوانا رووبەڕوو بووەتەوە. کەسێك کە دەیزانی رێك چی دەکات و هیچ هەڵەیەکی لەکارەکەیدا بەدی ناکرێ.

نیل بە لێدانێك ئەلێکسی بێهۆش کردبوو و دوایی ئەوی بۆ ئێرە هێنـابوو. کـوێ بـوو؟ لەکاتێکـدا ئێسـتاش سـەری دێشـا و ژانـی دەکـرد، سـەیری دەوروبـەری خـۆی کـرد، بـەلاّم ئەمـەی بـەدڵ نـەبوو کـە لـەم ژوورەدا بـینی. پێیوابوو لەناو ژوورێکی بچووك لە ژێر کۆشك زیندانی کراوە. دیوارەکانی

ژوورەکـە نمایشـی ژووریکـی زینـدانیان دەدا. ئاسـەواری لافـاو لەسـەر عەردی ژوورەکە دیار بوو. دارەکان نماوی بوون. گڵۆپێکی پیسی بچووك ژوورەکەی رووناك کردبوو. پەنجەرەی نەبوو. لـەرزینێك هـەموو جەستەی ئەلێکسی داگرت. کەش و هەوای ناو ژوورەکە سارد بوو و ئەمە لەکاتێکدا بـوو کـە شـەوەکانی سـەرەتای مـانگی سێپتەمەر هـەوا گەرمـە. ئـەلێکس ئێستا لەگەڵ خەیاڵێکی دیکە رووبەڕوو بۆوە. دەستی بە دیواری ژوورەکـە داکێشا، لیچق و قەوزەی پێوە بوو. پێشتر وایزانـی رەنگـی دیوارەکـان بـە رەنگی سەوزن. بەڵام ئێستا زانـی کـە لافاو ژوورەکـەی گرتـوووە و نەتـەنیا دیوارەکـان، بـەڵکوو بـۆ ماوەیـەکی زۆر تەنانـەت گڵۆپەکـەش لـەژێر ئـاوی لافاودا بووە.

دەبوایە چی بکات؟

ئەلێکس ئێستاش پانتۆڵی ئاوریشمی و جلیقەی مەخمەری لەبەر بوو و بەم جلانەوە نەیدەتوانی بەرامبەر بە سەرما پارێزگاری لەخۆی بکات. بۆ ماوەیەکی کەم وەبیر تام کەوتەوە و ئەم هەستە هێوریی پێبەخشی. ئەگەر تـا بـەیانی بـۆ هوتێـل نەگەڕابایـەوە، تـام بێشـك بـە بەرپرسـانی گروپـی رادەگەیانـد. نـابێ تـا دەسـپێکی رۆژی دواتـر زۆری مـابێ. ئـەلێکس نەیدەزانی چ ماوەیەك بێهۆش بووە. ئەو بەرلەوەی ئەم جلکانە لەبەر بکات کاتژمێرەکـەی دانـابوو و ئێسـتا لـەمکارەی پەشـیمان بـوو. لـەملای دەرگـا هیچ دەنگێك نەدەبیسرا. هیچ چارەیەکی نەبوو، دەبوایە چاوەڕوان بێت.

خـۆی خسـتە قولنچکێك، دانیشت و دەسـتەکانی خسـتە نـاو قاچـەکانی. بەشـێکی زۆری وێنەکێشـراوەکانی سـەر جەسـتەی تێکچـووبوون. وای هەست دەکرد جەستەی چڵکن و پیسە. نەیدەزانی دووپشك چی بەسـەر دێـنێ. بێشـك کەسـێکی وەکـوو نیـل یـا خـاتوو رۆدمـەن دەهاتنـە لای تـا لانیکەم بزانن بۆچی بۆ ناو کۆشك هاتووە.

بەوپـەڕی سەیروسـەمەرەییەوە خـەوی لێکـەوت و کـەمێك دواتـر بـەهۆی کاریگـەری ئـەو ژانـەی کـە لـە ملـی دابـوو، بەخەبـەر هـات. سـۆزێکی سـارد هەموو جەستەی داگرتبوو. واپێدەچوو دەنگی ئاژیر (زەنگێك بۆ بەخەبەر

هێنان یا ئاگادار کردنەوە) بەخەبەری هێنابوو. دەنگی دەرەوەی کۆشک نەبوو، لە دوورەوە دەبیسرا. هەروەها ئاگاداری ئەوە بۆوە کە گۆڕانکاری لە ژوورەکەدا پێکهاتووە. ئەلێکس سەیری کرد. ئاو هاتووەتە ناو ژوورەکە.

زۆری پێ سەیر بوو. ئایا بۆرییەك تەقیوە؟ ئاو لە کوێوە دەێتە ناو ژوورەکە؟ دوای ماوەیەکی زۆر کەم توانی هزر و هۆشی کۆنترۆڵ بکات. زانی کە چ چارەنووسێك چاوەڕوانی دەکات. دووپشك هیچ حەزێکی لە ئەو نەبوو. نیل پێی وتبوو کە دەمرێ و ئێستا کاتی مردنێتی و ئەمە روو دەدات.

دەنگی ئاژیر هۆشداریێ بوو بۆ هاتنی لافاو. ڤێنیز لە تەواوی ساڵدا لە سیستەمێکی ئاژیر کەڵکی وەردەگرت. شار لەسەر دەریا دروست کراوە و لەژێر کاریگەری با و پاڵەپەستۆی هەوا، گەردەلوولێکی زۆر بەرێوەن. ئەم مەسەلەیە دەبێتە هۆی ئەوەی ئاو لە دەریای "ئادریاتیك[٦٣]"ەوە بۆناو شاری ڤێنیز سەراوژێر بێت. لەمجۆرە کاتانەدا ئاوی ناو کاناڵەکان زیاتر دەبن و دەڕژێنە ناو شەقامەکان. تەنانەت هەر لە ئێستاوە ئاوی رەش تەختایی ئەو ژوورەی داگیر کردبوو کە ئەلێکسی تێدا زیندانی کرابوو. ئاوەکە تا چ رادەیەك دەهاتە ناو ژوورەکە؟ ئەلێکس پێویستی بەم پرسیارە نەبوو. پەڵەکانی میچی بانی ژوورەکە وەڵامی پرسیارەکەی بوون. ئاو دەگەیشتە سەرووی سەری. ئەو توانای رزگار کردنی خۆی نەبوو. دەبوایە ئەوەندە بمێنێتەوە تا دەخنکێ. دوایی کاتێك ئاوەکە کەم دەبۆوە، ئەوان تەرمەکەیان دەست دەدایە و دەیانهاویشتە ناو ئاوی شاری ڤێنیز.

ئەلێکس هەستایە سەرپێ و بۆلای دەرگا رایکرد و بە دەست چەند لێدانی ئاراستەی دەرگا کرد. لەگەڵ ئەوەیکە دەیزانی بێ سوودە، بەڵام دەیقیژاند. کەسێ بۆ رزگارکردنی نەهات. کەس ئاگای لە ئەو نەبوو.

---

63 -Adriatic

بێشك ئەو یەکەم کەس نەبوو کە لەم زیندانەدا دەستبەرسەر کرابوو. پرسینی پرسیاری زیادە لەڕادە، چوونە ژوورێك کە نەدەبوایە بچێ، ئەنجامەکەی ئەمە بوو.

ئاو دەهاتە سەرتر. ئێستا بەرزایی ئاو گەیشتبووە پێنج سانتی مەتر. تەختایی ژوورەکە نەدەبینرا. پەنجەرەی تێدا نەبوو و دەرگاش بە توندی داخرابوو. رەنگە تەنیا رێگەیەك بۆ راکردنی هەبوو کە ئەلێکس لە تاقی کردنەوەی دەترسا. بەڵام تەختەدارێکیان شل بوو و دەلەقا. رەنگە لەژێر ئەو بۆرییەك یا چاڵێکی لێبێ. بیری لەوە کردەوە کە دەبێ رێگەیەکی هەبێ کە ئاو بەم شێوەیە پێیدا دێتە ژوورەکە.

ئێستا خێرایی هاتنەژووری ئاوەکە زیاتر ببوو. ئەلێکس بە خێرایی لە پەیژەکان هاتەخوار. ئاو زیاتر لە جمگەکانی بوو و گەیشتبووە چۆکەکانی. ئەلێکس لێکیدایەوە کە تا سێ خوولەکی دیکە ئاو هەموو ژوورەکە دادەگرێت. ئەلێکس جلیقەکەی دەرهێنا و هاویشتییە لایەکی. بە پێی خۆی بەدوای تەختەدارەکەی تەختایی ژوورەکە دەگەڕا. وەبیری هاتەوە کە دارەکە لەناوەڕاستی ژوورەکە دابوو و خێرا دۆزییەوە. پەنجەی خستە قەڵشی تەختە دارەکە. چۆکی دادا. ئاو گەیشتبووە ناوقەدی. تەنانەت متمانەی بەوە نەبوو کە بتوانێ لەناو قەڵشی تەختەدارەکەدا تێپەڕێ. ئەگەریش ئەمکارەی دەکرد، لەملاوە بە کوێ دەگەیشت؟

لەژێر دەستی ئاو دەهاتە دەروە. ئەمە سەرچاوەی هاتنەژووری ئاوەکە بوو. ئاو راستەوخۆ لە قوولاییەك دەهاتە ناو ژوورەکە. لەم رووییەوە، دەبوایە ئەمە رێگەی چوونەدەر بێت. تەنیا پرسیار بۆ ئەلێکس ئەمە بوو کە ئایا توانایی بەڕێوەبردنی ئەم کارەی هەیە. دەبوایە سەری لە قەڵشتەکە تێپەڕێنێ، رێگەی هاتنی ئاوی دەدۆزیەوە و دوایی دەیتوانی بە مەلە خۆی رزگار بکات. ئەگەر رێگەی هاتنی ئاو لە شوێنێك کۆتایی پێبێت، ئەوا رێگەی گەڕانەوەی نەبوو. ئەو بەرامبەر بە خراپترین جۆری مردن چۆکی دادابوو. ئاو ئێستا گەیشتبووە ناوقەدی.

تووڕەییەك جەستەی ئەلێکسی داگرتبوو. ئایا ئەوە ئەو چارەنووسە بوو کە یاسین گرگوروویچ بەڵێنی پێدابوو؟ ئایا ئەو تەنیا بۆ ئەم مەبەستە بۆ ڤینیز هاتبوو؟ دەنگی ئاژیر هێشتا بەرز بوو. ئاو گەیشتبووە سەرووی دوو پەیژەی ژوورەکە و ئێستا دەیویست پەیژەی سێیەمیش داگیر بکات.
ئەلێکس نفرەتێکی نارد، دوایی چەند هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و کاتێك سییەکانی پڕ لە هەوا کرد، بە خۆهاویشتنێك سەری لە درزی تەختەدارەکە تێپەڕاند.
درزەکە یا قەڵشتەکە ئەوەندە کراوە نەبوو. تەختەدارەکە شانی ئەلێکسی بریندار کرد. بەڵام دوایی توانی دەستەکانی لەکار بکات و بۆلای پێشی بڕوات. چاوەکانی هیچ شوێنێکیان نەدەدیت. لەگەڵ ئەوەیکە چاوەکانی کردبۆوە، بەڵام ئاوەکە ڕەشاو بوو. دەیتوانی هەستی ئەوە بکات کە ئاوەکە پاڵەپەستۆیان خستووەتە سەر کونی لووت و لێوەکانی. ئاو زۆر سارد بوو. خوایە!! ئیتر ئەمە چ ڕێگەیەك بۆ مردنە؟ سکی لە درزەکە تێپەڕیبوو، بەڵام سمتەکانی تێنەدەپەڕین. ئەلێکس وەکوو مار جووڵەیەکی خێرای بەخۆی دا. جەستەی بەم جووڵەیە ئازاد بوو. بەڵام ئێستا مەترسییەکی دیکە ئەوی گرتەوە. هەوای ناو سییەکانی کەم کەم کۆتاییان پێدەهات. ئێستا لەناو بۆڕییەکە ڕێگەیەکی نەبوو، جگە لەوەیکە بچێتە خوارەوە. بە پێیەکانی لێدانێکی بەهێزی ئاراستە کرد کە تەنیا ئەنجامەکەی ژانی پێی بوو. کەسانی بەهێزتر لەو نەیاندەتوانی تا ئەم شوێنە بێن، بەڵام ئەلێکس بە جەستەی بچووکی تا ئێرە هاتبوو. دیوارکانی بۆڕی لەهەر لایەکەوە پاڵەپەستۆیان خستبووە سەر جەستەی. ئەگەر بۆڕییەکە لەوە باریکتر بوایە، ئیتر نەیدەتوانی بەرەو پێشتر بچێت.
ئەلێکس هەوڵێکی دیکەی دا بۆئەوەی بەرەو پێشەوە بچێ. لەکاتێکدا دەستەکانی بەرەو پێشەوە دەبرد. زیاتر دەچووە ناو قووڵایی بۆڕییەکە. تەنیا بیری لەوە دەکردەوە کە نیل هەر لەسەرەتاوە بەڵێنی مردنی پێدابوو. سییەکانی لەگەڵ کەمبوونی هەوا ڕووبەڕوو ببونەوە. پاڵەپەستۆیان دەخستە سەر خۆی و سینگی. هەوڵی دا خۆی لە ترس دوور بخاتەوە.

باش دەیزانی ئەگەر خۆی بەدەست ترسەوە بدات، بەخێرایی پێویستی بە ئۆکسجنێکی زیاتر دەبێ. بەمحاڵەوە، مێشکی کەم کەم ئەمری وەستانی پێ دەدەا. دەیوت هەناسە بکێشێ، ئاو بنێرێتە ناو سییەکانی خۆی بۆئەوەی بخنکێ. دەیتوانی بۆماوەی دوو خولەك هەناسەی رابگرێ. خوولەکێك دەبوو لەناو بۆری پڕ لەئاو دابوو. خۆت بەدەستەوە مەدە، لە رۆیشتن و هەوڵ بەردەوام بە.

تا ئێستا دەبێ گەیشتبێتە قووڵایی دە تا پازدە مەتری تەختایی ژوورەکەی. لەم کاتەدا پەنجەی بە خشتێك کەوت. چەند بڵقی هەوا لەناو دەمی هاتەدەر. لە تەنیشت جەستەی تێپەڕین. هەستی بەوە کرد کە ئیتر تووشی بەربەست بووە. چاوەکانی کردەوە. بەڵام هیچ جیاوازییەك پێکنەهات. بە چاوی کراوە یا بەسراو هیچ شتێك نەدەبینرا. لە تاریکییەکی تەواودا حاسێ ببوو. واپێدەچوو ترپەی دڵی وەستاوە. لەم کاتەدا تامی مردن هەموو جەستەی داگیر کردبوو.

بەڵام لەم کاتەدا دەستی بە کۆتایی بۆرییەکە کەوت. واپێدەچوو بە کۆتایی بۆرییەکە گەیشتبێ و دەبوایە ئێستا لێی تێپەڕێ. ڕەنگە لەمەوبەدوا بە کاناڵ بگات. بەڵام کاتێك ئەلێکس بەردەوام بوو، بۆرییەکە تەسکتر بوو. خشتەکانی کە بۆ چاك کردنی ئەم تونەلە بچووکە کەڵکیان لێوەرگیرابوو، ئەنیشك و سینگیان دادەڕوشەکاند. ئەلێکس دەیزانی کە هەوایەکی کەمی بۆ ماوەتەوە. هەستی دەکرد کە سەری بەتاڵ بووە. ئەوەندەی نەمابوو ببورێتەوە. لەهۆش چوونیش دەیتوانی نەعمەتێك بێت. ئەگەر ببورابایەوە، ئیتر هەستی بە چوونی ئاوی ناو دەم و قورگی نەدەکرد. ڕەنگە بەر لە مردنی دەچووە خەوێکی قووڵی قووڵ.

ئەلێکس گۆشەکەی دەور لێدا. ئێستا دەستی بە شتێك کەوت. بە میلەێی بە شیشێکی باریك دەچوو. ئەوەی لێدەترسا بۆی دەهاتەدی. بە کۆتایی چاڵاوەکە گەیشتبوو. تەختایی چاڵاوەکە دەرگایەکی ئاسنین بوو لەشێوەی دەرگای زیندان دەچوو. ڕێگەی راکردنی نەبوو.

هەستی ئەوەیکە تا ئێرە فریویان داوە، هێزێکی بێ کۆتایی پێبەخشی. ئەلێکس بەدەست پاڵی بە شیشەکانەوەنا، ئەوانەی تەمەنیان زیاتر لە سێ سەد ساڵ بوو و تا ئێستا ژەنگیان هێنابوو و رزیبوون. زۆر بەئاسانی دەرگا کرایەوە و ئەلێکس بەرەو پێشەوە و ناو ئاوەکە مەلەی کرد. شانەکانی ئازاد بوون، ئێستا دەیزانی کە سەرووی ئەو تەنیا ئاوی لێیە. بە پێ پاڵێکی دیکەی بە دەرگاکەوەنا. شیشێکی شکاو رانی بریندار کرد، بەڵام هەستی بە هیچ ژانێك نەکرد.

بۆ لای سەرووی ئاو بەرێکەوت. ئێستاش هیچی نەدەدیت. بەڵقە بڵقی دەمی هەر لەخۆیانەوە لەناو دەمی دەچوونە دەر. ئەو دوایین هەوای ناو سییەکانی لەدەست دا بێ ئەوەی بتوانێ هەوڵی راگرتنی بدات. چەندە لە قوڵایی ئاو دایە؟ ئایا بەرادەی پێویست ئوکسجنی لەناو سییەکاندا ماوە کە بتوانێ خۆی بگەیەنێتە سەر ئاو؟ ئەلێکس بە خێرایی بەرەو سەرەوە دەستی بە مەلەکردن کرد. بۆ جارێکی دیکە چاوی کردەوە. بەم هیوایە روناکاییەك ببینێ. روناکی مانگ، بریقەی چراکان، یا روناکی هەر شتێکی دیکە. لەمکاتەدا لە دوورەوە روناکاییەکەی بینی. ئەلێکس قیژاندی و هەوای ناو سییەکانی دایە دەرەوە. ئیتر گەیشتە سەر ئاو و روناکییەکە روناکی بەرەبەیان بوو. ئیتر دەست و شانی لەسەر ئاو بوو. ئەلێکس بە خێرایی هەوای بۆ ناو سییەکانی کێشا و دوایی دەستی بە هەناسە هەڵکێشانێکی زۆر کرد. ئاو لەنێوان پرچی ئەلێکس دەتکایەوە سەر رووخساری و بەسەر گۆنایدا کەوتنەخوار. ئەلێکس دەیزانی فرمێسك و ئاو تێکەڵ بوونە.

ئەلێکس سەیری دەوروبەری خۆی کرد.

واپێدەچوو کاتژمێر شەشی بەیانی بێت. دەنگی ئاژیر ئێستەش دەهات، بەڵام کەس لەم دەوروبەرە نەبوو. ئەمەش شتێکی خراپ نەبوو. ئەلێکس لەنێوانی گرند کاناڵ مەلەی دەکرد و دەیتوانی پردی ئەکادمی ببینێ. لە کەش و هەوایەکی نیوەتاریك شێوەیەکی نادیاری هەبوو. مانگ ئێستاش

لەئاسمان بوو، خۆر کەم کەم لە پشت کەنیسەکان بە بێدەنگی خۆی نیشان دەدا. رووناکایی خۆر وردەوردە خۆی دەخستە سەر ئاوەکە.
ئەلێکس بەرادەیەك سەرمای بوو کە ئیتر هەستی بە هیچ شتێك نەدەکرد. هێزی کۆ کردەوە و هەرچۆنێك بێ خۆی بۆلای پەیژەکانی لای کاناڵەکە گەیاند. مەودای تا کۆشکی بێوەژن زۆر بوو. هەرچی رووی دابا، حەزی نەدەکرد دووبارە بۆ ئەم کۆشەکە بگەرێتەوە.
لەناوقەدەوە بۆ سەرەوە رووت بوو. پێڵاوەکانی لەدەست دابوو. خوێن لە پێیەکی دەرژایە ناو ئاوە پیسەکەی ناو کاناڵەکە. تەری ئاو بوو. پارەی نەبوو و مەودای ئەو تا هۆتێل وێستگەیەکی شەمەندەفەر بوو. بەلام بۆ ئەلێکس ئەوە گرنگ بوو کە بە زیندوویی مابۆوە.
ئەلێکس سەیرێکی پشتی سەری خۆی کرد. کۆشك لەناو تاریکی و بێدەنگیدا رۆچووبوو. میوانداری ناو کۆشکی بێوەژن ماوەیەك بوو کۆتایی پێهاتبوو.
ئەلێکس بەشەلەشەل لەوێ دوور کەوتەوە.

## ئەندێشە لەناو شەمەندەفەردا

تــام هــریس بــە شــەمەندەفەرێکی دەرجــە دوو واتــە شــەمەندەفەری پنـدولینو[٦٤] لـە ڤێنیـز بـەرەو ناپـل دەچـوو. لـە پەنجـەرەوە سـەیرێکی دەرەوەی کرد. بینا و کێڵگەکان لە تەنیشت شەمەندەفەر تێدەپەڕین. تام بیری لە ئەلێکس دەکردەوە.

شەوی پێشوو، هەموویان ئاگاداری نادیارمانی ئەلێکس رایدەر ببوون. مامۆستا گرێی وای بیردەکردەوە کە تا درەنگی شەو دەگەڕێتەوە، بەڵام کاتێك کاتژمێر خۆی لە دە و نیو دا و تەختی خەوی ئەلێکس هەر بەتاڵ بوو، هەر بۆیەش دەنگی هۆشدار بەرز بۆوە. مامۆستا پۆلیسی ئاگادار کردەوە و هەروەها بە سەرپەرشتی ئەلێکس واتە جەك ستارتبرایتیشی راگەیاند. لە بروکلەند هەموو دەیانزانی کە ئەلێکس باوك و دایکی نییە. لەڕاستیدا، جەك بوو کە بارودۆخی پێشهاتووی نەختێك هێور کردەوە.

– دەزانن، ئەلێکس کوورێکی وردبین و کونجکاوە و هەر ئەم وردبینییەی کێشەی بۆ دەنێتەوە. خۆشحاڵم کە پەیوەندیتان بە منەوە گرت، بەڵام بێ گومان دێتەوە. پێویست بە نیگەرانی ناکات.

بەڵام تام نیگەران بوو. ئەو بینیبووی کە ئەلێکس لەناو دڵی جەماوەری کۆشکی بێوەژندا ون ببوو. دەیزانی کە شتێ زیاتر لە کونجاوی و وردبینی بووەتە هۆی ئەوەی هاوڕێیەکەی بەمشێوەیە بچێتە ناو کۆشك. رەنگە پێویستی بە یارمەتی بێت.

---

64 - Pendolino

بەڵام لەلایەکی دیکەوە، لەوە دەترسا خۆی تووشی کێشە بێت و یا بەم ئاشکراکردنە بارودۆخی ئەلێکس دژوارتر بکات. تام بەم ئەنجامە گەیشت کە لەبارەی ئەلێکس قسە لەگەڵ هیچ کەس نەکات. رۆژی دواتر دەبوایە کاتژمێر دە و نیو هۆتێل جێبهێڵن. ئەگەر تا بەیانی هیچ هەواڵیك لە ئەلێکس پەیدا نەبوو، ئەوا رۆیشتنی ئەلێکس بۆ کۆشکی بێوەژن ئاشکرا دەکات.

لەڕاستیدا کاتژمێر حەوت و نیو ئەلێکس تەلەفۆنی بۆ هوتێل کرد. مامۆستا گەری وەڵامی دایەوە و ئەلێکس پێی وت کە وا بۆ ئینگلتەرا دەگەڕێتەوە.

ئەلێکس وتی دڵگران بووە و دەیهەوێ خێراتر بگەڕێتەوە.

مامۆستا گەری نارەزایەتی خۆی دەربڕی و وتی:

– ئەلێکس باوەڕ ناکەم تۆ بەم شێوەیە هەڵسووکەوت بکەی. من بەرامبەر بە تۆ بەرپرسیارم. کاتێ تۆم بۆ ئەم گەشتە هێنا، متمانەم پێکردی. تۆ ئابڕوی منت برد.

– بەداخەوە، بەڕێزم.

– داخ چ دەردێکی من دەوا دەکات. بەهۆی ئەم هەڵسووکەوتەی تۆ ئیتر من ناتوانم لە گەشتەکانی دیکەدا منداڵەکان لەگەڵ خۆم بێنم. تۆ بۆ هەمیشە کاری منت خراپ کرد.

– من مەبەستێکی خراپم نەبوو، بەڵام تۆ ئاگاداری بواری من نی. کۆرسی دواتر کە بتبینم، هەموو رووداوەکەت بۆ دەگێڕمەوە. بەڕاستی زۆر بەداخم. لەوەیکە ئەم هاوینە یارمەتیت دام، زۆر سوپاست دەکەم. بەڵام نیگەرانی من مەبن. هیچ کێشەیەك نایەتەپێش.

مامۆستا گەری دەیویست زیاتر قسە بکات، بەڵام خۆی کۆنترۆڵ کرد. لەم ماوە زۆرەی کە وانەی بە ئەلێکس دەوت، فێری زۆر شت ببوو و لەڕاستیدا خۆشیی لێهاتبوو. ئەمەشی دەزانی کە ئەلێکس لەگەڵ هەموو ئەم منداڵانە جیاوازە کە ئەو دەیانناسێت. ئێستاش باوەڕی بەوە نەبوو کە

وەڕەزی ئینگلتەرای کردبێ. باش دەیزانی کە ئەلێکس بۆ ئینگلتەرا ناگەڕێتەوە. بەڵام هەستی بەوە کرد کە زۆرجار واباشترە پرسیار نەکات.

– سەرکەوتوو بی ئەلێکس، ئاگاداری خۆت بە.

– سوپاس، بەڕێزم.

بە منداڵەکانی دیکەی گروپ وترا کە ئەلێکس بۆ ئینگلتەرا گەڕاوەتەوە. خاتوو بێدفۆرشایر ئەشیاکانی ئەلێکسی کۆ کردەوە. ئەوانیتریش ئەوەندە سەرقاڵ بوون کە بیر لە ئەلێکس نەکەنەوە. تەنیا تام دەیزانی کە ئەلێکس درۆی کردووە. ئەوان لە هۆتێلدا هاوژوور بوون و پەساپۆرتی ئەلێکس ئێستاش لەسەر مێزی تەنیشت تەختی ئەو بوو. ئەو پەساپۆرتەکەی هەڵگرت. پێشتر ئادرەسی براکەی خۆی لە ناپل بە ئەلێکس وتبوو. ئەگەری ئەوە هەبوو کە سەرێك لەوێ بدات.

تام لە گروپی منداڵەکانی قووتابخانە جیا ببۆوە. منداڵەکان بۆ ئینگلتەرا دەگەڕانەوە. دوو بلیتی ناپلی هەبوو. لەوێ براکەی چاوەڕوانی بوو. دەبوایە شەش کاتژمێر کات بۆ ئەم سەفەرە دابنێت. کتێبی رۆمانی پێبوو. هەڵبەت تام خوێندنەوەی چیرۆك و رۆمانی پێ خۆش نەبوو، بەڵام لە قووتابخانە پێیان وتبوو لانیکەم دەبێ لە وەرزی هاویندا کتێبێکی چیرۆك بخوێنێتەوە. چەند رۆژێکی مابوو بۆ ئەوەی قووتابخانەکان بکرێنەوە و تازە ئەو تا لاپەڕەی حەوتی کتێبەکەی خوێندبۆوە.

نەیدەزانی ئەلێکس چی بەسەر هاتووە و بۆچی ئەلێکس ئەوەندە پێداگرە کە خۆی بگەیەنێتە ناو کۆشکی بێوەژن. کاتێك شەمەندەفەر بەڕێکەوت داوێنەکانی دەوروبەری شاری ڤێنیزی تێپەڕاند، تام دووبارە وەبیر هاوڕێکەی کەوتەوە. ئەوان دوو ساڵ پێش بەیەکەوە ئاشنا ببوون. تام قەڵافەتێکی بچووکی هەبوو و هەر بۆیەش لە قووتابخانەدا زوڵمیان لێدەکرد. ئەو رۆژە چەند منداڵی زەبەلاح پێیان وتبوو کە دەبێ پارەی خواردنەکەی بەئەوان بدات بۆئەوەی جگەرەی پێبکڕن و چونکە تام داواکاری ئەوانی رەت کردبۆوە، لێدانێکی چاکیان لێدابوو. کاتێك

ئەلێکس لە شەقام گەیشتێ، تام بەشەلاّلی کەوتبوو و کتێب و دەفتەر و قەڵەماکانی پەرشوبلاّو ببون و لووتیشی خوێناوی ببوو.

– حاڵت باشە؟

– بەڵی لووتم شکاوە. پارەی نانی نیوەڕۆشم لەدەست دا. ئەوان پێیان وتم سبەیش ئەم کارەیان دووبارە دەکەنەوە. لەوە کە بگووزەرێن، حاڵم باشە.

– مایك کوك[٦٥] ئەم کارەی لەگەڵ کردی؟

– بەڵێ.

– واباشترە نەختێ قسەی لەگەڵ بکەم.

– بۆچی وابیر دەکەیتەوە کە بە قسەت دەکات؟

– من بەشێوەیەکی تایبەتی قسەی لەگەڵ دەکەم.

ڕۆژی دواتر، ئەلێکس کووڕە زۆردارەکە و دوو هاوڕێیەکەی بینی کە لەپشت پایسکل دانیشتبوون. دیدارێکی کوورت بوو، بەلاّم ئەم ڕۆژە بەدواوە مایکل کوك زوڵمی لەکەسیتر نەکرد. هەموو بینیان کە لە هەفتەی دواتردا بەشەلەلی دەڕوات و توانای قسەکردنی نییە.

ئەمە دەسپێکی هاوڕێیەتی نزیکی ئەوان بوو. تام و ئەلێکس نزیك بە یەکەوە دەژیان و زیاتر بە یەکەوە و بە پایسکل بۆ ماڵ دەگەڕانەوە. ئەوان لە تیپەکانی جیاوازدا بەیەکەوە یارییان دەکرد. تام لەگەڵ ئەوەیکە کوورتەبالاّ بوو، بەلاّم زۆر خێرا و توند و تیژ بوو. کاتێك باوك و دایکی تام باسی جیابوونەوەیان کرد، ئەلێکس تاکە کەسێك بوو کە تام باسی کێشەی نێوانیانی بۆ کرد.

لەبەرامبەردا، لە بروکلەند هیچکەس ئەلێکسی زیاتر لە تام نەدەناسی. تام چەند جار بۆ ماڵی ئەلێکس هاتبوو و لەگەڵ جەك، کە سەرپەرشتی ئەلێکس بوو، یەکتریان بینیبوو. ئەلێکس باوك و دایکی نەبوو و بەپێی بارودۆخی ماڵەوەیان دەبوایە دەوڵەمەند بێت. دواتر مامێکی ئەلێکس لە

65 - Mike Cook

ڕووداوێکی ئۆتۆمبێل گیانی لەدەست دابوو. ئەم هەواڵەیان لە قووتابخانە ڕاگەیاندبوو. تام چەند جارێك بۆ ماڵی ئەلێکس چوو، بەلام ئەوی نەدۆزییەوە.

دوای ئەم ڕووداوە، ئەلێکس گۆڕانکاری بەسەردا هاتبوو. بەرنامە بە نەهاتنی ماوەیەکی زۆری ئەلێکس لە قووتابخانە لە کۆرسی بەهاری دەستی پێکرد. هەموو وایان بیر دەکردەوە کە لەژێر کاریگەری مردنی مامی هاوسەنگی و کۆنتڕۆڵی خۆی لەدەست داوە. بەلام جارێکی دیکە ئەلێکس لە کۆرسی هاوینەدا ئامادە نەبوو. کەس ئامادە نەبوونی ئەلێکسی شی نەکردەوە. واپێدەچوو کەس زانیاری لەسەر ئەوە نییە کە ئەلێکس بۆکوێ دەچێت. کاتێك کە ئەوان دووبارە یەکتریان بینی، بۆ تام جێگەی سەرسووڕمان بوو کە ئەلێکس چەندە گۆڕاوە. ئەو زام و برینێکی زۆری پێکەوتبوو. تام هەندێ لە برینەکانی ئەوی بینیبوو، بەلام واپێدەچوو ئەلێکس زۆر گەورەتر بووبێت. شتێکی لە چاوەکانیدا دەبینرا کە پێشتر بوونی نەبوو. واپێدەچوو هەندێ شتی بینیوە کە ناتوانێ لەبیریان بکات.

ئێستاش ئەم ڕووداوەی کە لە ڤێنیز ڕووی دابوو. ڕەنگە حەق بە خاتوو بدفوردشایر بوو کە دەیوت ئەلێکس پێویستی بە دەروون دەرمانیی هەیە. تام لابتۆپەکەی لە کۆڵەپشتی دەرهێنا. ڕەنگە بە یارییەکی کۆمپیوتەری دەکرا ئەلێکس لە هزری خۆی بەرێتەدەر. دەیزانی کە دەبێ لە خوێندنەوەی کتێب بەردەوام بێ. بەڵێنی بەخۆی دا کە دوای تێپەڕینی دووسەد یا سێسەد مایل دەست بە خوێندنەوەی کتێب بکاتەوە – دوای تێپەڕینی لە ڕۆما.

لەناکاو هەستی بەوە کرد کە کەسێك لەپشتی سەری وەستاوە و خێرا دەستی کردە ناو گیرفانی بۆئەوەی بلیتەکەی بداتێ. تام سەری بەرز کردەوە. ئەلێکس لەپشت سەری وەستابوو.

پانتۆڵی جینی مۆدێل کۆن و تیشەرتێکی فشی لەبەر کردبوو. پانتۆڵ و تیشەرتەکە سایزێك بۆ ئەلێکس گەورە بوون. ئەلێکس پیس و ناڕێك بوو.

پرچی ئاڵۆز، شانەی پێنەکەوتبوو و دوایی کاتێک تام سەیری پێی ئەلێکسی کرد، بینی کە پێپەتییە و پێڵاوی لەبەر نییە و واپێدەچوو بێ حاڵە و توانایی ڕاگرتنی هاوسەنگی خۆی نییە.
تام بەڕادەیەك بەلایەوە سەیر بوو کە توانای قسە کردنی نەبوو.
– ئەلێکس؟
– سلاو.
ئەلێکس ئەمەی وت و لەسەر کوورسییەکی بەتاڵ دانیشت.
– دەتوانم لای تۆ بمێنمەوە؟
– تکایە،دانیشە.
گەشتیارەکانی دیکە بەسەیری چاویان لە ئەلێکس بڕیبوو.
– چۆن هاتیتە ئێرە؟ چی ڕووی دا؟ ئەم جلانەت لە کوێ پەیدا کردووە؟
– بەداخەوە جلەکانم دزیوە. ئەوانم لە جلکشۆرێك هەڵگرت. پێڵاویشم بەدەست نەکەوت.
– دوێنی شەو چی ڕووی دا؟ بینیم کە چوویتە ناو کۆشکەکە. ئایا تۆیان دۆزییەوە. ئایا کەوتیتە ناو کاناڵەوە؟
ئەلێکس ماندووتر لەوە بوو کە وەڵامی پرسیارەکانی تام بداتەوە.
– چاوڕوانی یارمەتیم لە تۆ هەیە، تام.
– دەتهەوێ لە پۆلیس بتشارمەوە؟
– پێویستیم بە کەمێ پارە هەیە کە بلیتێکی پێ بکڕم. دەبێ جلك بکڕم.
– کێشە نییە. بە پێی پێویست پارەم هەیە.
– دەبێ بۆ ماوەیەك لای تۆ و براکەت بمێنمەوە. کێشە پێك نایەت؟
– بێشك. ئەم شتانە بەلای جەرییەوە گرنگ نییە.
بەلام ڕێك لەم کاتەدا کە تام ئەم قسەیەی کرد، ئەلێکس ناوچاوانی خستە نێوان دەستەکانی و دوای ماوەیەکی کوورت خەوی لێکەوت.
شەمەندەفەر خێراییەکەی زیاتر کرد، ڤینیزی بەجێهێشت و ڕێگەی باشووری گرتەبەر.

*　　　*　　　*

کاتێك ئەلێکس لەخەو هەستا، شەمەندەفەر هێشتا بە خێرایی لە ڕێگەی خۆی بەردەوام بوو. ئەلێکس جووڵەیەکی بە جەستەی دا. نەختێك باشتر ببوو. شەمەندەفەر تەنیا لە ڤێنیز تێنەپەڕیبوو، بەڵکوو چەند شاری جێهێشتبوو. لەسەر جێگەی خۆی بەڕێکی دانیشت و تامی بینی کە سەیری دەکات. بابۆڵەیەك، نەختێك چیپس و ساردییەك لەسەر مێزێکی تەنیشتیان دەبنیرا.

تام وتی:

- وام هەست پێکرد کە برسی،
- بەڵێ، زۆریشم برسییە.

ئەلێکس قوودی ساردییەکەی کردەوە. نەختێك گەرم بوو، بەلاّم بەلایەوە گرنگ نەبوو.

- لە کوێین؟
- کاتژمێرێك دەبێ لە ڕۆما تێپەڕیوین. وابزانم خێرا دەگەینە شاری ناپل.

تام وەستا تا ئەلێکس ساردییەکەی خواردەوە و دواتر کتێبەکەی دانا.

- مەترسیدار دێیتەبەرچاو. دەتەوێ پێم بڵێی دوێنی شەو چی ڕووی دا؟
- بەڵێ، بێشك.

ئەلێکس بەر لەوەی سواری شەمەندەفەر بێت، بڕیاری دابوو هەموو شتێك بۆ تام بگێڕێتەوە. نە سەبارەت بەوەیکە پێویستی بە یارمەتی تام هەیە، بەڵکوو لە درۆکردن ماندوو ببوو.

- بەلاّم پێموانییە بڕوام پێ بکەی.
- دوو کاتژمێر و نیوە کە کتێب دەخوێنمەوە، تازە گەیشتوومەتە لاپەڕەی نۆزدە. بەم پێیەوە، وابزانم زۆر حەز دەکەم گوێم لە قسەکانی تۆ بێت. هەرچی دەتهەوێ بیڵێ.
- زۆر باشە.....

ئەلێکس پێشتر تەنیا ڕووداوی خۆی بۆ کەسێك گێڕابۆوە. بۆ سابینا پلژر. بەلاّم ئەو بڕوای پێ نەکردبوو. تەنیا کاتێك زانی ئەلێکس درۆی ناکات کە لە ژێرزەوینی مولتی ملیونەری شێت، دامیان کاری، لەگەڵ

ئەلێکس بەند کرا. ئێستا ئەلێکس ئەوشتەی بۆ سابینای گێڕابۆوە، بۆ تامیشی باس کرد. سەرەتا لەبارەی راستیی جۆری مردنی مامی دەستی پێکرد و دوایی رووداوی شەوی رابردوو و دوایی راکردنی لە ژووری لافاویی. سەیر لەوەدا بوو کە ئەو چێژی لە گێڕانەوەی چیرۆکەکەی وەردرگرت. ئەو لەوەیکە بە شاراوەیی قسەی دەکرد شانازی بەخۆی نەدەکرد و قسەکانی بەشێوەی راست و دروست دەگێڕایەوە. شانازی بەوەش نەدەکرد کە بۆ رێکخراوی نهێنیکاری حکوومی کاری دەکرد. بەپێچەوانەوە. ئەو ماوەیەکی بەردەوام بۆ (ئێم ئای٦) کاری کردبوو. ئەوان ئەویان ناچار کردبوو لەبارەی کارەکانی بێدەنگ بێت. ئەویان ناچارکردبوو یاسای نهێنی پارێزی بەشێوەی فەرمی واژوو بکات. ئێستا بە وتنی راستییەکان، رێك بەپێچەوانەی چاوەڕوانییەکانی ئەم رێکخراوەیە هەڵسووکەوتی کردبوو، بەلأم ئەلێکس هەستی بەوە کرد بارێکی قوورسی لەسەر شانی لابردووە. هەستی کرد دەسەلأتی خۆی لەبەردەستی خۆی دایە.

– ..... بێ پارە نەمدەتوانی بۆ هوتێل بگەڕێمەوە. پێلأویشم نەبوو، دەمزانی کە تۆ بە شەمەندەفەر دەچیتە ناپل. هەربۆیەش بە پێیان چوومە وێستگەی شەمەندەفەر و لەوێ چاوەڕوانی تۆم کرد. دوایی لە شەمەندەفەردا بەدوات کەوتم و ئێستاش دەبینی کە لێرەم.

ئەلێکس قسەکانی تەواو بوو و بێ سەبرانە چاوەڕوانی کاردانەوەی تام بوو. تام لەماوەی بیست خوولەکی رابردوودا هیچ قسەیەکی نەکردبوو.

ئایا ئەویش وەکوو سابینا بڕوای بە قسەکانی نەدەکرد؟

تام سەرێکی وەکوو قبووڵ کردن دانەواند.

– واپێدەچێ راست بکەی.

ئەلێکس سەیرێکی کرد.

– بڕوا بە قسەکانم دەکەی؟

– منیش شتێکی دیکەم بە مێشکیدا نایات. ئەم هەموو نەهاتنە بۆ قووتابخانە. ئەم هەموو برینە. وام هەست کرد کە کەسێ لە ماڵەوە

تەمبێت دەکات. بەڵام واش پێنەدەچوو. بەم پێیەوە، ئەمە قبووڵ دەکەم کە مەئمورێکی نهێنیت. بەڵام کارێکی زۆر دژوارە. دەبێ ئەمە بڵێم کە زۆر خۆشحاڵم ئەم کارە ناکەم.

ئەلێکس بزەیەکی هاتێ.

– تام، تۆ بەڕاستی باشترین هاوڕێی منی.

– لەوەیکە هاوکاریت بکەم، زۆر خۆشحاڵ دەبم. بەڵام شتێك هەیە کە هێشتا لەبارەیدا لەگەڵم نەدواوی. بۆچی بیر لە دووپشك دەکەیتەوە و حەزت لەوەیە زیاتر لەبارەی بزانی؟ هەروەها دەتهەوێ لە ناپل چی بکەی؟

ئەلێکس ئاماژەی بە باوکی نەکردبوو. ئەمە بوارێك بوو کە ئێستاش ئازاری دەدا. بواری تایبەتیتر ئەوە بوو کە لەبارەیدا قسەی لەگەڵ هیچکەسێ نەکردبوو.

– دەبێ دووپشك بدۆزمەوە.

ئەوەی وت و نەختێك بێدەنگ بوو و دوایی بەردەوام بوو:

– وابیر دەکەمەوە کە باوکم کێشەی لەگەڵ ئەوان هەبووە. من هیچکات باوکی خۆمم نەناسی. ئەو ماوەیەکی کوورت دوای لەدایکبوونم مرد.

– ئایا ئەوان باوکتیان کووشت؟

– نا، شی کردنەوەکەی زۆر دژوارە. من دەمەوێ لەبارەی ئەودا راستییەکان پەیدا بکەم. هیچکات کەسێکم نەبینیوە کە باوکم بناسێ. تەنانەت مامیشم لەبارەی ئەودا قسەیەکی ئەوتۆی نەدەکرد. دەبێ ئەمە بزانم کە چ جۆرە پیاوێك بووە.

– ئەمە چ پەیوەندییەکی بە ناپلەوە هەیە؟

– گوێم لێبوو کە خاتوو رۆدمەن لەبارەی کۆمپانیایەك لە ئامالفی قسەی دەکرد. زۆر لە ناپل دوور نییە. وابزانم ناوی کونسانتۆ بێت. ئەم ناوەم لەناو فایلی ناو کشەوی مێزی ئەودا دۆزییەوە. وێنەی ئەو کەسەی کە خاتوو رۆدمەن قسەی لەگەڵ دەکرد، لەناو ئەم سیڤیەدا چاپ کرابوو. خاتوو رۆدمەن وتی تا دوو رۆژی دیکە دێتە ئامالفی. یانی سبەی. حەز دەکەم هۆکارەکەی بزانم.

تام نێوچاوانی تێکنا.
– بەڵام ئەلێکس..... تۆ ئەو لاوە رەشپێستە، واتە "نیل"ت بینیوە.
– لەڕاستیدا ئەوەندەش رەش نەبوو. دوورەگە بوو. شتێك لەنێوان رەش و سپی.
– هەر کە باسی دوویشکت کرد، تۆی لەم ژوورەدا زیندانی کرد و ویستی بتخنکێنێ. بۆچی دووبارە دەتهەوێ بۆ ناویان بگەڕێیتەوە؟ وابزانم ئەوەندە حەزی بینینی تۆیان نەبێ.
– بەڵێ، دەزانم.
ئەلێکس دەیزانی حەق بە تامە و لەبارەی خاتوو رۆدمەندا زۆر شت نازانێ. تەنانەت لەوەش دڵنیا نەبوو کە ئەو پەیوەندی بە دوویشکەوە هەبێ. تەنیا ئەوەی دەزانی ئەو و ئەو کەسانەی کە کاری بۆ دکەن، زۆر بێ زەمیر و بێ روحمن. بەڵام نەشیدەتوانی هەر ئاوا بە ئاسانی لێیان بگوزەرێت و یا هێشتا نەیدەتوانی ئەم کارە بکات. یاسین گرگوروویچ رێگەی بەئەو نیشان دابوو و دەبوایە تا کۆتایی رێگە بەردەوام بێت.
– تەنیا حەز دەکەم سەیرێکی ئەوێ بکەم.
تام شانەکانی هەڵاویشت.
– وابزانم کاتێك بۆ قووتابخانە گەڕایتەوە، مامۆستا گەری بەشێوەی جددی بە خزمەتت بگات.
– بەڵێ، تەلەفۆنی کە قسەم لەگەڵی کرد، ئەوەندە خۆشحاڵ نەبوو.
تام وتی:
– بەڵێ، دەزانم. دەبێ مانایەکی زۆری بۆتۆ هەبێ، ئەوەیکە لەبارەی باوکت زانیاریت بەدەست هێنا.
– بەڵی، ئەمجۆرەیە.
– باوکم و دایکم ماوەیەکی زۆرە لەسەر یەکتر دەقیژێنن. ئیشیان تەنیا شەڕ کردنە. ئێستاش کە دەیانهەوێ جیا ببنەوە، لەمبارەوە بەسەر یەکتردا دەقیژێنن. ئیتر هیچکامیان بۆمن گرنگ نین. پێموانەبی ئیتر ئەوانم خۆش بوێت.

لەناکاو، خەم هەموو جەستەی تامی داگرت.
- بەڵێ، ئاگادارم لەبارەی باوکت چ هەستێکت هەیە. هیوادارم هەرچی زووتر ئەو زانیارییە بەدەست بێنی کە بەدوایدا دەگەڕێی. من کە ئێستا خاڵێکی بەرچاو لەپەیوەندی بە باوکەمەوە نابینم.

جێری هوریس[٦٦]، برا گەورەکەی تام، لە وێستگەی شەمەندەفەر بەرەوپیریانەوە هات و بە تاکسی بۆ ماڵەوە رۆیشتن. ئەو بیست و دوو ساڵە بوو. بۆ گەشتێکی کوورت بۆ ئیتاڵیا هاتبوو و دوایی لەوێ مابۆوە. ئەلێکس زۆر بەخێرایی حەزی کەوتە ئەم برایەی تام. جێری زۆر لاواز بوو، مووی پڕ رەنگی هەبوو و زردەخەندەیەکی بەردەوام لەسەر لێوان بوو. بۆی گرنگ نەبوو کە ئەلێکس بێ بانگهێشتکردن بۆ ماڵی هاتووە. هیچ کارێکی بە سەر و رووخسار و بارودۆخ و تەنانەت ئەوەش نەبوو کە ئەلێکس لە ڤێنیزەوە تا ناپل بە پێخواسی هاتووە.
جێری لە گەڕەکی ئیسپانییەکانی شاری ناپل دەژیا. یەکێ لە شەقامە خۆشەکانی ناپل بوو، شەقامێکی گەورە بە بینای پێنج شەش نهۆمی. ئەلێکس سەری بەرز کرد، لە نهۆمی سەرووی یەکێ لە بیناکان ژنێك لەگەڵ دراوسێیەکەی قسەی دەکرد. جێری لە نهۆمی ئاخر ئەپارتومانێکی بەکرێ گرتبوو. ئەسانسۆری نەبوو. سێ کەسی بەیەکەوە لە پەیژەکان بەسەر کەوتن. بە هەر نهۆمێك دەگەیشتن، بۆنێکی تایبەتی لە خانووەکەی ئەم نهۆمە دەهات. لە نهۆمی یەکەم بۆنی خواردن دەهات و مناڵێك کە دەگریا و لە نهۆمی دووهەم دەنگی ژەنینی کەمان بە گوێ دەگەیشت.
ئێستا جێری دەرگایەکی کردەوە.
- ئەمەش خانووی ئێمە. فەرموون. وەرنە ژوور. راحەت بن.
ماڵەکە کراوە بوو. قەنەفە و ئەشیایەکی ئەوتۆی تێدا نەبوو. دیوارەکان بە رەنگی سپی رەنگ کرابوون. تەختایی ژوورەکە لە دار بوو. سرووشتی

---

[66] - Jerry Harris

شار دیار بوو. لە قولنچکێکی بیناکە چێشتخانە دەبینرا. قاپ و کەوچکی پیس گۆشەیەك لە چێشتخانەکەیان داگیر کردبوو. ژوورێکی بچووکی خەوتن و دەستشۆرییەکیشی تێدابوو. لە ژوورکە مۆبلێکی (کوورسی سێ کەسی) بچووکی سێ کەسی لێبوو. ژوورەکەی پڕ لە ئەشیای وەرزشی بوو کە ئەلێکس هەندێ لەوانی دەناسی. دوو سکێت بۆرد، حەبل، کایت، دارێکی خلیسکێنە و پەڕەشووتی خۆرزگار کردنی لێبوو. تام پێشتر بە ئەلێکسی وتبوو کە براکەی زۆر خولیای وەرزشە. ئەو لە ناپل وانەی ئینگلیزی دەوتەوە و بە پارەکەی چالاکییەکانی وەرزشی بەڕێوەدەبرد.

جێری پرسی:

– ئێوە برسین؟

تام لەسەر مۆبلەکە خۆی پان کردەوە.

– بەلێ، شەش کاتژمێرە لەناو شەمەندەفەرین. خۆراکت هەیە؟

– بێشك گاڵتە دەکەی. هەڵبەت کە نیمانە. دەتوانین بچینە دەرەوە و پیتزا یا شتێك بکڕین. ئێ، تام! بارودۆخ چۆنە. باوکم و دایکم حاڵیان چۆنە؟

– وەکوو هەمیشە.

– بەم خراپییە؟

جێری ئێستا بۆلای ئەلێکس سووڕایەوە.

– باوکم و دایکم پێکەوە ناحاوێنەوە. باش دەزانم کە تام بۆی باس کردووی. ئێ، ئەلێکس! لێرە چی دەکەی؟ دەتەوێ بۆ قەراخ دەریا بچی؟

لە شەمەندەفەردا، ئەلێکس بە تامی وتبوو کە هیچ شتێك لەم رووداوانەی کە لای باس کردووە، لە هیچکوێ باسیان نەکات. بەلام لە قسەی تام تووشی سەرسووڕمان بوو.

– ئەلێکس پۆلیسی نهێنییە.

– راستی؟

– بەڵێ. بۆ (ئێم ئای٦) کار دەکات.

– ئۆە، چ سەیرە!

– سوپاس.

ئەلێکس نەیزانی چ وەڵامێك بداتەوە.
– کەواتە لە ناپل چی دەکەی، ئەلێکس.
ئەمجارەش تام لەجیاتی ئەلێکس وەڵامی دایەوە.
– دەیهەوێ لەبارەی کۆمپانیایەك زانیاری بەدەست بێنێت. کۆمپانیای کونستانتۆ.
ئەلێکس وتی:
– کونستانتۆ.
– ڕێکخراوی کونستانتۆ؟
– من ئەوان دەناسم. فەرمانبەرێکی ئەم ڕێکخراوەیە پێشتر لای من زمانی ئینگلیزی دەخوێند. ئەو کیمیازانێکی توێژێنەر بوو. هیوادارم لە کیمیادا بارودۆخی لە ئینگلیزی باشتر بێت. چونکە لە ئینگلیزیدا وێرانی وێران بوو.
ئەلێکس پرسی:
– کونستانتۆ چ جۆرە ڕێکخراوێکە؟
– لە گەورەترین کۆمپانیاکانی دەوا و دەرمانە. نزیك بە ئامالفی کارگەیەکیان هەیە.
ئەلێکس ئومێدوارانە پرسی:
– ئایا دەتوانی من بۆ ئەم کۆمپانیایە ببەیت؟
– بێشك سۆحبەتم لەگەڵ دەکەی. تەنانەت پاپیش ناتوانێ ئەمکارە بکات. سیستەمێکی پارێزگاری بەربڵاوی هەیە. دەوراودور بە ئاسن تەنراوە و لەسەر دیوارەکانی کامێرای شاراوە بەستراوە.
تام وتی:
– بێشك شتێك دەشارنەوە.
جێری وتی:
– زۆرت زانی. ئەوە ئاشکرایە کە شتێك دەشارنەوە. هەموو کۆمانیاکانی دەوا و دەرمان هەوڵ دەدەن بوون و نەبوونی خۆیان بشارنەوە. بۆنموونە ئەگەر کەسێك بتوانێ دەرمانی ئایدز بدۆزێتەوە، بایەخی بەڕادەی

ملیارەها دۆلارە. هەر بۆیەشە کە ناتوانی بۆ ئەویٚ بچی. ئەم کەسەی کە وانەم پیێ دەوت، هیچکات لەبارەی کارەکەی قسەی نەکرد. ریٚگەی ئەم کارەی نەبوو.

– ریٚك وەکوو ئەلیٚکس.

– چۆن مەگەر؟

– بۆئەوەیکە ئەو مەئموری نهێنییە و ریٚگەی پێنەدراوە لەبارەی ئیشەکەیدا هیچ قسەیەك بکات.

جیٚری بە نیشانەی قبوولٚ کردن سەری هیٚنایە خوارەوە.

– بەلٚیٚ، ریٚك ئەمجۆرەیە.

ئەلیٚکس سەیری تامی کرد. لەگەلٚ ئەوەیکە جیاوازی تەمەنیان هەشت سالٚ بوو، بەلاٚم زۆر لە یەکتر نزیك بوون. حەزی دەکرد زیاتر لەلایان بمیٚنیٚتەوە. لای ئەوان هەستی بە حەسانەوەیەکی زۆر دەکرد. ئەو بۆ ئەمکارە بۆ ئیٚرە نەهاتبوو.

– دەتوانی من بۆ ئامالفی ببەی؟

– بەلٚیٚ، بیٚشك. سبەی وانە وتنەوەم نییە. سبەی رۆژیٚکی باش بۆ تۆیە؟

– بەلٚیٚ، رۆژیٚکی ئایدیالە.

– لە ناپل دوور نییە. دەتوانم ئوتۆمبیٚلی هاورِیٚیەکەم بە قەرز وەربگرم و تۆ بۆ ئەوی ببەم. خۆت دەتوانی کونسانتۆ ببینی. بەلاٚم لەوە دلٚنیات دەکەمەوە کە ئەگەری چوونەژووری نییە.

## کونسانتۆ

لەکاتێکدا لەژێر خۆری گەرم لە تەنیشت ئۆتۆمبێل وەستابوون، ئەلێکس بەم ئەنجامە گەیشت کە حەق بە جێرییە. کونسانتۆ بێشك لە هیچ هەوڵێك بۆ پاراستن و حەشاردان درێغی نەکردبوو.
بینای سەرەکی ئەم رێکخراوەی بەرهەمهێنانی دەرمان کە بەشێوەی چوارگۆشە بوو، درێژاییەکەی بە ٥٠ مەتر دەگەیشت. ئەلێکس وێنەی ئەم بینایەی لەناو فایلەکەدا بینیبوو و ئێستا ئەیبینی کە ئەم بینایە و وێنەکەی تا چ رادەیەك وێکدەچن. ئەلێکس سەیری دیوارێکی شووشەیی کرد. تەنانەت واپێنەدەچوو تیشکی خۆریشی لێبگوزەرێ. بینایەکی رەنگ زێوینی (سیلڤەر) بوو کە روویەکەی لە کانزایەکی بەناو کونسانتۆ کوترابوو.
جێری لە تەنیشت ئەو وەستابوو. قوتە پانتۆڵێکی لەبەر کردبوو کە تا سەر چۆکانی دەهات و تیشەرتی بێ قۆڵی لەبەر بوو. ئەو دووربینێکی دووچاوی پێبوو و ئەلێکس بەیارمەتی ئەم دووربینە توانی پەیژەکانی بەردینی پان ببینێ کە پێی دەچوونە ژوورەوە. جگە لەم بینا سەرەکییە، چەند بینای بچووکتریش وەکوو ئەمباری لێبوو. پارکینگێکیشی لێبوو کە زیاتر لە سەد ئۆتۆمبێلی لێ پارك کرابوو. ئەلێکس دووربینەکەی لەسەربانی بینا سەرەکییەکە زووم کرد. دوو تانکەری ئاو لەسەر بینایەکە بوو. چەند سەفحەی بەرهەمهێنانی وزەی خۆر، بوورجێکی دروستکراو لە خشت و دەرگایەکی کراوە دەبینرا.
بەڵام بە تەواوی مسۆگەر بوو کە ناتوانێ لێی نزێك بێتەوە. تەواوی بینایەکەیان بە ئاسنی شەش مەتری و سەرووشیان بە تێلدڕوو تەنیبوو.

ڕێگەیەکی تاکەکەسی تا دەرگای پاسەوان هەبوو. هەر ئۆتۆمبێلێك کە دەهاتە ژوور و دەچووە دەر، دەپشکنرا. کامێراکانی وێنەهەڵگرتنەوە لەسەر پایە بەردەوام فیلمیان هەڵدەگرتەوە. تەنانەت ئەگەر مێشێکیش بیویستبا بچێتە ئەم شوێنە، دەبینرا. ئەلێکس بە هەرزاران جۆر بیرکردنەوە سەیری دەکرد.

ڕێکخراوی کونسانتۆ زۆر بە ڕێکی و بە وردی و بیرکرنەوە ئەم شوێنەی هەڵبژاردبوو. ئامالفی، بەندەری پڕ جەماوەری مەدیتەرانە، چەند مایلێك لە لای باشوورە. چەند گوندێکیش لە باکووری ئەودا هەیە. جێگەیەك کە ئەلێکس وەستابوو، نیو مایل پشت سەری دەریای لێبوو. چەند بەلەم و کەشتی لە دەریادا هاتووچۆیان دەکرد و کەشتییەکی بارهەڵگر بەرەو دوورگەی کاپری[٦٧] دەڕۆیشت. ئەلێکس وای لێکدایەوە هیچکەس ناتوانێ بێ ئەوەی ببینرێ، لە هیچ لایەکەوە لە کونسانتۆ نزیك بێتەوە. ئەگەری زۆر بوو کە ئێستاش فیلمبەرداریان لێکرابێت.

جێری وتی:

- ئێستا لێم تێگەیشتی؟

تام پشت بە بینا و ڕوو بە دەریا وەستابوو.

- کەس حەز دەکا مەلە بکات؟

- بەڵێ، بەڵام من جلی مەلەم نەهێناوە.

پیکابێك لەپێش یەکەمین شوێنی پشکنین تێپەڕی. لەڕاستیدا چوونە ناو ئەم شوێنە نەدەکرا. تەنانەت ئەگەر دەیتوانی خۆی بگەیەنێتە ناو ئۆتۆمبێلێك کە ڕێگەی چوونە ژووری پێدەدرێت و لەکاتی پشکنین ئاگادار دەبوونەوە. مانەوە تا گەیشتنی شەو بێ مانا بوو.

---

67 - Capri

کاتێک تاریکی شەو داهات، هەزاران چرا هەڵکران. ئەلێکس چاوی بە پاسەوانانی چەکدار کەوت کە بە سەگی گێرمەن شێپرد[٦٨] لەحاڵی هاتووچۆدا بوون. واپێدەچوو تەواوی شەو پاسەوانی لەم بینایە بدەن.
ئەوەندەی نەمابوو تەسلیم بێت. نەیدەتوانی لە دەرگاکانی پێشەوە و ئەملاوئەولاوە بچێتە ناوەوە. چوونەسەر لە تەل و تێلدڕووش نەدەکرا. سەیری لایەکەی دیکەی ڕێکخراوەکەی کرد.
ڕێکخراوەکەیان لە تەنیشت تاشەبەردێکی بەرز چاک کردبوو. بەرزایی تاشەبەردەکان بە سێ سەد مەتر دەگەیشت. لەسەرووی تاشەبەردەکان چەند بینایەک دەبینران.
ئەلێکس لەکاتێکدا بە دەست ئەم بینایانەی نیشان دەدا، پرسی:
- ئەمانە چ بینایەکن؟
جێری سەیری ئەملایەی کرد کە ئەلێکس بەدەست نیشانی دەدا.
- نازانم، ڕەنگە ڕاڤلو1 بێ. گوندێکە.
- دەتوانین بۆ ئەوێ بچین؟
- بەڵێ، بێشک.
ئەلێکس لەکاتێکی کەمدا بیری لە هەموو شتێک کردەوە. بانێکی ساف کە پەیژەی کاتیی هەبوو، واپێدەچوو کرابێتەوە. گوندەکە لەسەرووی تاشە بەردەکان بوو. بەم ئەشیایانەی کە ئەو لە ئەپارتمانی جێری بینیبووی، ئیستا ئیتر کێشەکە چارەسەر دەکرا.
ڕێکخراوی کونسانتۆ وا دەهاتە بەرچاو کە چوونە ژووری ناکرێ، بەڵام ئەلێکس ڕێگەیەکی بۆ دۆزیبۆوە.
ڤێلای تایبەت بە سەدەی هەژدەهەم نەختێک لە ڕاڤلۆ دوور بوو. جاددەیەک لە تەنیشت ناوچەی کوێستانیی لەنێوان دارە کاجەکان تا ئەم ڤێلایە ڕۆیشتبوو. بایەکی فێنک لەلای دەریاوە دەهات؟ خۆر بەئارامی ئاوا دەبوو. باخێک کە جاددەیەکی لەنێواندا کێشرابوو و بەشێکی باخ بە

[٦٨] - German Shepherd

سەراوژێرییەکی توند بۆلای جاددەی سەرەکی دەچوو. ڕێکخراوی کونسانتۆ لە مەودای سێ مەتری لە خوارەوەی ئەمانە دەبینرا.
بە نزیك بوونی شەو، گەشتیارەکان ناوچەیان چۆڵ کردبوو. ڤێلا دادەخرا. ئەلێکس بە تەنیایی وەستابوو و بیری لەوە دەکردەوە کە دەبێ چی بکات. دەمی وشك ببوو. گەدەی بەشێوەیەکی سەرسووڕهێنەر ژانی دەکرد. جۆرێك شێتایەتی بوو. دەبێ ڕێگەچارەیەکی دیکە هەبوایە، بەڵام ئەمجۆرە نەبوو. ئەو گشت ڕێگەکانی تاقی کردبۆوە. ئەمە تاکە ڕێگە بوو کە بوونی هەبوو.
ئەو دەیزانی کە خۆهاویشتنی بیس[٦٩] لە مەترسیدارترین وەرزشەکانە کە هەموو ئەم کەسانەی کە ئەم کارە دەکەن، کەسانێك دەناسن کە گیانیان لەسەر ئەمکارە لەدەست داوە. بەواتایەکی دیکە، ئەم خۆهەڵدانە بە پەڕەشوت بێ کەڵك وەرگرتن لە فڕۆکە بوو. خۆهەڵدەرەکان لەسەرووی بیناکان و تاشە بەردەکان، بەنداوەکان و پردەکان خۆیان بۆ خوارەوە هەڵدەدەن. ئەم خۆهەڵدانانە غەیری یاسایی نین، بەڵام خۆهەڵدەرانیش ئەزن لە کەس وەرناگرن و یا پێشتر کەس ئاگادار ناکەنەوە. کاتی ئەم خۆهەڵدانانە زیاتر نیوەی شەوانە.
ئەوان بۆ ناپل ڕۆیشتبوون بۆ ئەوەی ئەشیاکانی جێری هریس بێنن کە بەڵێنی پێدابوو بە ئەمانەت بیانداتە ئەلێکس. جێری لە ڕێگەی چوون و گەڕانەوە تا ئەو جێگەی توانی لەبارەی جۆری هەڵدانی پەڕەشوت زانیاری بە ئەلێکس دا و هەروەها باسی مەترسییەکانیشی کرد. تام لەم هەموو ئاگادارکردنەوە و زانیارییانە بێزار ببوو.
جێری وتی:
– یەکەمین و گرنگترین خاڵ ئەمەیە کە زۆربەی تازەکارەکان ئەمکارە زۆر بە سەخت و دژوار دەزانن. کاتێك خۆت هەڵدەدەی، دەبێ تا زۆرینەی کات سەبر بکەی و دوایی پەڕەشوتەکەی بکەیتەوە. هەرچی زیاتر سەبر بکەی،

---

[69] - Ravello.

زیاتر لە تاشەبەردەکان دوور دەکەویتەوە. دەبێ شانەکانت هاوسەنگ رابگری. پێویستیت تەنیا بەم شتەیە کە لەکاتی کەوتنە خوارەوە بە بەرد نەکەوی.

– مەبەستت چییە؟
– ئەوەیکە بە تاشە بەردێك بکەوی.
– ئەوکات چیم لێدێت؟
– دەمری.

جێری شی کردەوە کە تا ئێستا بێ دەورە و فێربوون خۆهەڵدانی تاقی نەکردووەتەوە. ئەو وتی:

– ئەگەر کێشەیەك بێتە ئاراوە، هیچ جلێك یا کلاوێك یا شتی دیکە ناتوانێ گیانت رزگار بکات.

جێری لە تەنیشت ئەلێکس وەستا و بە دووربین سەیری خوارەوەی کرد، دەیویست بەرزایی ئەوێ تا خوارەوە حسێب بکات.

– سێ سەد و هەفتا و پێنج مەتر. دەتوانی چوار تا شەش چرکە دوای خۆهەڵدان، پەڕەشوتەکە بکەیتەوە.

ئەلێکس لە مەبەستی تێگەیشت. هەرچی زیاتر خۆهەڵدانی ئازادی دەکرد، ئەگەری ئەوە کەم بوو بیبینن، بەلاّم لە لایەکی دیکەوە ئەگەر درەنگ پەڕەشوتەکەی کردباوە، بەو خێراییەی کە هەیبوو، بە تاشەبەردەکان دەکەوت.

– ئەگەر دەتهەوێ هەردوو پێت ورد نەبن، دەبێ سێ تا چوار چرکە بەر لە گەیشتنت بۆسەر زەوی خێراییت کەم بکەیتەوە.
– سوپاست دەکەم.

ئەلێکس سەیری دەوروبەری خۆی کرد. هیچکەسێ نەدەبینرا. بەشێوەیەك حەزی دەکرد پۆلیسێك یا راسپێردراوێکی نهێنی لە ڤێلایەکە با و پێشی لێگرتبا، بەلاّم باخەکان کەسیان لێنەبوو. واپێدەچوو تەنیا بەردەکانی مەڕمەڕ و سپی سەیری دەکەن.

جێری بەردەوام بوو.

- لەماوەی سێ چرکە خێراییت دەگاتە شەست مایل لە کاتژمێردا. دەبێ ڕێك بزانی کەی دووگمەی پەڕەشوتەکەت دەکەیتەوە، قاچ و چۆکت کۆبکەوە. چناگەت لەسەر سینگت دابنێ. ئاگاداری خۆتبە، بە گەستن زمانت قڵت نەدەی و نەیکەی بە دووبەش. ئەوەندەی نەمابوو لە یەکەم خۆهەڵدانم ئەمکارە بکەم؟.
- بەڵێ، بێشك.
جێری لەسەرەوەڕا سەیرێکی خوارەوەی کرد.
- بانی کونسانتۆ ڕێك لەژێر پێی ئێمەیە. زۆر باشە، باشی نایات. ئەمەی وت و دەستێکی لەسەر شانەکانی ئەلێکس دانا.
- ئەگەر بتهەوێ، دەتوانم ئەم کارەت بۆ ئەنجام بدەم.
ئەلێکس سەری بە نیشانەی نەخێر جووڵاند.
- نا، سوپاست دەکەم، جێری. ئەمە کارێکە کە دەبێ بۆخۆم بیکەم. لەسەرەتاوەش هەر بیری خۆم بووە.
- ئاگات لێبێت پێیەکانت نەشکێن.
ئەلێکس لەنێوان دوو پەیکەر تێپەڕی و گەیشتە لێوی تاشەبەردە هەڵدێرەکە. سەیری خوارەوەی کرد. ڕێك لەسەر ڕێکخراوەکە بوو. لەم بەرزاییەڕا ڕێکخراو زۆر بچووك دەهاتەبەرچاو. زۆربەی فەرمانبەران واپێدەچوو ڕێکخراویان جێهێشتبێ، بەڵام بێشك پاسەوانەکان لەوێ بوون. هەموو ئومێد و هیوای ئەلێکس لەوە دابوو کە لەماوەی ئەم چەند چرکە خۆهەڵدانەی کەس لە پاسەوانەکان سەری بەرز نەکاتەوە بۆئەوەی بیبینن. کونسانتۆ بەسەر دەریادا دەیڕوانی. ڕێگەی سەرەکی و دەرگای سەرەکی لەلای دەریاوە بوو. بەهەرحاڵ، پاسەوانەکان دەبوایە ئاگاداری ئەولا بن و سەیری ئەولایان کردبا. ئەگەر بەخت یاوەری ئەلێکس دەبوو، دەیتوانی بچێتە ناو ڕێکخراو و کەسیش نەیبینێ.
ترپەی دڵی زیاتر ببوو. پێیەکانی هەستیان بە هیچ نەدەکرد. هەستی دەکرد کە لەبارودۆخی هەڵواسران دایە. هەوڵی دا هەناسەیەکی قووڵ هەڵکێشێ، بەڵام دژوار بوو. ئایا تا ئەم رادەیە بەلایەوە گرنگ بوو کە

بچێته ناو كونسانتۆ و سەر لە پەیوەندییەكانی دووپشك دەربێنی؟ ئەگەر رێك لەم كاتەی دواییدا رای خۆی بگۆڕێت، تام و برایەكەی چیان دەوت؟ هاتە ناو هزری كە بە درك كردنەوە زۆر لە مێرمنالان هەڵدانی لەجێوە دەكەن. ماوەیەك لەمەوپێش جێری لە وێست ڤیرجینیا[70] لەسەر پردێك هەڵدانی ئازادی كردبوو. ئەمجۆرەی كە دەیوت، چەند مێرمندالی دیكە بۆ خۆهەڵدان نۆرەیان گرتبۆوە. ئەمە جۆرە وەرشێك بوو. خەڵكی بۆ خۆشی ئەم كارەیان دەكرد. ئەگەر چركەیەك دوودڵ بوایە، رەنگە وازی لەم پیلانە بهێنابا. كاتی ئەوە بوو پیلانەكەی بەرێوەبباتـ.

ئەلێكس بێ دوودڵی لەسەر تاشە بەردەكە وەستا. سەیرێكی خوارەوەی كرد و خۆی هەڵدا. زیاتر وەكوو خۆكووژی دەچوو.

پێشتر ئەم ئەزموونەی تاقی نەكردبۆوە.

دەبوایە ئەمجۆرە هەڵسووكەوتی كردبا كە جێری پێی وتبوو.

ئێستا!

لەناكاو وای هەست كرد كە پەڕەشوتەكەی درەنگ كردووەتەوە. وای هەست كرد كە هەركات ئەگەری ئەوەی هەیە بە عەردی بكەوێ و پەرشوبلاو بێت. كەچی پەڕەشوتەكە كرابۆوە. بەلام ئەو بۆ كوێ دەچوو؟ ئەلێكس سەیری خوارەوەی كرد. پێیەكانی هەڵواسرابوون. بانی رێكخراو لە ئەو نزیك بوو، بەلام ئێستاش مەودایەكی هەبوو.

تەنیا شتێك كە دەیتوانی ببینێ، بانی بینایەكە بوو و دوایی لەوێ هاتەخوار. پاڵەپەستۆ لە جمگەكانەوە و دوایی بەرەو رانی گوازرایەوە. بۆ كاتێكی كەم بەرەو پێشەوە چوو. پەڕەشوتەكە ئەوی لەگەڵ خۆی دەكێشا. جێری لەمبارەیەوە پێی وتبوو. وتبووی ئەگەری ئەوە هەیە لە خوارەوە با توندتر بێت و ئەگەر ئاگای لەخۆی نەبێ، لەسەر بانەوە دەیخاتە خوارەوە. ئێستا دەیبینی كە لێواری بانەكە لەئەو نزیكە. هەوڵی دا لە رۆیشتن بەرەو پێش خۆی بپارێزی و لە كۆتاییدا لە مەودایەكی كەم لەگەڵ لێواری

70 - West Virgina

دیوارەکە توانی پاژنەی بچەقێنێ و خۆی لە کەوتنە خوارەوە رزگار بکات. دوایی خۆی بەرەو دواوە خوار کردەوە و پەڕەشوتەکەی بۆلای خۆی راکێشا و لەسەر بانی دانیشت.
چووبووە ناو رێکخراوەکە.
بۆ ماوەیەکی کەم هیچ کارێکی نەکرد. بەو هەستە چێژبەخشە گەیشتبوو کە هەموو ئەو کەسانەی خۆیان لە بەرزاییەوە هەڵدەدەن. رێك ئەم چێژە زۆرەیە کە خەڵکی بۆ ئەمکارە هان دەدات و خووی پێوە دەگرن. جەستەی رێژەیەکی زۆری ئەدرنالین دابووە دەرەوە کە ئێستا هەموو جەستەی داگرتبوو. ترپەی دڵی دوو بەرامبەر خێراتر ببوو. ترس هەموو جەستەی لەخۆ گرتبوو. سەیری تاشەبەردەکەی کرد. تام و براکەی نەدەبینران. ئەلێکس بڕوای نەدەکرد چ مەودایەکی پێواوە و بە چ خێراییەك گەیشتووەتە ئەم شوێنە. تا ئەو جێگایەی کە دەیزانی، پاسەوانەکان سەیری سەروویان نەکردووە و هەر ئاگایان لە دەوروبەری خۆیان بووە. ئەمەش لە ئەمنییەتی کونسانتۆ.
ئەلێکس وەستا تا ترپەی دڵی نۆرماڵ بۆوە. ئێستا کڵاوی لەسەری خۆی هەڵگرت، بە خێرایی پەڕەشوتەکەی کۆکردەوە و بە باشترین شێوە خستییە ناو جانتاکەی. لەناو دەمیدا تامی خوێنی دەکرد. لەگەڵ ئەم هەموو ئامۆژگاریانەی جێری، واپێدەچوو زمانی گەستبێ. بە لەسەرەخۆیی و لەکاتێکدا خۆی دوولا کردبۆوە، پەڕەشوتەکەی بۆ لای ئەو دەرگایە برد کە پێشتر لەسەر زەوی بینیبووی. دەیویست ئەشیاکانی جێری لەسەر بانەکە بهێڵێتەوە تا ئەوکاتە کە رێکخراو جێدەهێڵێ. کەم تا زۆر بیری لەوە کردبۆوە کە چۆن لە کونسانتۆ بچێتە دەرەوە. سادەترین کار ئەمە بوو کە پەیوەندی بە پۆلیسەوە بگرێت و لێگەڕێ دەستبەسەر بکرێن. لە خراپترین حاڵەتدا رەنگە ئەویان سەبارەت بەوە دەستبەسەر کردبا کە بەشێوەی نایاسایی چووەتە ناو ئەم رێکخراوەیە. بەڵام ئەو تەمەنی زیاتر لە چواردە ساڵ نەبوو. لەمەش دوو دڵ بوو کە لە ئیتاڵیا زیندانی بکەن. ئەگەری زۆر بوو بۆ ئینگلتەرا بەڕێی بکەنەوە.

دەرگا کرابۆوە. لەمبارەیەوە راستی بیر کردبۆوە. قونکە جگەرەی سەربان ئەمەیان دەردەخست کە لەگەڵ ئەم هەموو ئاگاداری و پاراستنە و پاسەوانانەی کە لە ڕێکخراودا بوون، کەسێك خۆی گەیاندووەتە ئەم بانە و لەوێ جگەرەی کێشاوە.

تا ئێرە خراپ نەبوو. ئەلێکس لە درگا تێپەڕی و گەیشتە پەیژەی ئاسن کە دەچووە خوارەوە. ئێستا گەیشتە دەرگایەك کە واپێدەچوو قایمتر بێت کە لە پۆڵا دروست کرابوو و چەند پەنجەرەی شووشەیی دەرگاکەیان رازاندبۆوە. بۆ کاتێکی کەم بیری لەوە کردەوە کە ڕێگەی بەستراوە. بەڵام ئامێرێکی هەستیاریی بۆ کردنەوەی دەرگا هەبوو. کاتێك نزیك بۆوە، دەرگا کراوە و لەپشت سەری داخرا. رەنگە جگەرەکێشی نەناسراو ئاوای ڕێکخستبێ.

ئێستا ئەلێکس گەڕایەوە و دەستێکی بۆڵای دەرگا برد. بەڵام دەرگا نەکرایەوە. لەسەر دیوار چەند دووگمە هەموو شتێکیان بۆ ئەلێکس شی کردەوە کە ژمارەیان لەسەر بوو. چوونە ناو ڕێکخراو خاڵێك بوو، بەڵام هاتنەدەر پێویستی بە ژمارەی نهێنی هەبوو، لەوێدا حاسێ ببوو.

تەنیا ڕێگەیەکی کە هەیبوو، ڕۆیشتن بەرەو پێشەوە بوو. لە ڕێڕەوەکە تێپەڕی و بە دەرەگایەکی دیکە گەیشت. دەرگاکە بە دەنگێکەوە بەڕووی ئەلێکس کرایەوە و بەدوایدا داخرایەوە. کەش و هەوا لەناکاو گۆڕا. زۆر سارد بوو و بۆنی ئاسنی لێدەهات. شوێنێکی زۆر خاوێن بوو. مۆنیتۆرێکی زۆر لەناو هۆڵەکە دەبینرا.

لە ڕۆیشتنی بەردەوام بوو. لە ڕێڕەوەکە گوزەرا. دەیویست بەر لەوەی بیدۆزنەوە. هەرچی دەتوانێ سەیری دەوروبەری خۆی بکات. واپێدەچوو کە کەس لەناو بیناکەدا نییە. هەموو فەرمانبەران شەو بۆماڵیان چووبوونەوە، بەڵام ئەگەری ئەوەش هەبوو لەناکاو پاسەوانەکان چاوێك لە ژوورەوە بکەن. دەنگی کرانەوەی دەرگایەك بیسرا. دڵی ئەلێکس لە لێدان وەستا. بیری لەوە کردەوە کە هەرچی زووتر خۆی لەشوێنێك بشارێتەوە. بەڵام ڕێڕەوەکە رووت و بەتاڵ بوو. رووناکی چرایەکان ئەم شوێنەیان بە

تەواوی روون کردبوو. نیسێیەك نەبوو کە خۆی لێ حەشار بدات. چاوی بە دەرگایەك کەوت و بە خێرایی بۆلای رایکرد، بەلآم داخرابوو. ئەلێکس بە جەستە پاڵێکی بە دەرگاوەنا و ئومێدەوار بوو کەس نەیبینێ.
پیاوێك لە سوچێکی رێرەوەکە پەیدا بوو. لەسەرەتادا زۆر دژوار بوو پیاوبوونی دیاریبکرێ. رووپۆشێکی خۆپارێزی پۆشیبوو کە هەموو جەستەی دادەپۆشی. کلآوێکی لەسەر بوو. رووخساریشی بە ماسکێکی شووشەیی داپۆشیبوو. بەلآم کاتێك سەری وەرگێرا، ئەلێکس ردێنی بینی و ئەوکات زانی پیاوە. چادانێکی گەورەی ئاسنینی لەسەر چەرخێکی دەستی دەگواستەوە. چادانەکە رێك هاوبالآی پیاوەکە بوو. بۆری و دەرپۆش لەسەر چادانەکە دەبینرا. پیاوەکە بۆ رێرەوێکی دیکە سوورایەوە و ئەلێکس هەناسەیەکی پڕ لە حەسانەوەی هەڵکێشا.
ئەلێکس سەیری ئەو دەرگایەی کرد کە خۆی تێدا شاردبۆوە. پەنجەرەیەکی شووشەیی ئەستووری هەبوو. وەکوو شووشەی پێش جلکشۆرێك دەچوو. لە لایەکەی دیکەدا، ژوورێکی گەورە دەبینرا. ناوی رووناك بوو، بەلآم کەسی تێدا نەبوو. ئەلێکس وای بیرکردەوە کە ئەم ژوورە دەبێ لابراتوار بێ، بەلآم زیاتر بە کارگەیەکی دلۆپەچەکان دەچوو. چادانگەلێکی زیاتر لەم ژوورەدا بوون کە هەندێکیان بە زنجیرێکەوە هەڵواسرابوون. پەیژەیەکی لەئاسن دروستکراو بەرەو سەرەوە دەچوو. دەرگایەکی زۆر گەورە کە زیاتر بە دەرگای بەفرگر دەچوو، دەبینرا. هەموو ئەشیا و ئاسنەواڵەکان نوێ دەهاتنە بەرچاو و بریقەیان دەدایەوە. لەکاتێکدا ئەلێکس سەیری دەکرد، ژنێك سەر و رووخساری پەیدا بوو. ئەمجۆرەی بیری کردبۆوە، رێکخراوەکە بەتاڵ نەبوو. ئەم ژنەش رووپۆشێکی خۆپارێزی پۆشیبوو و ماسکێکی شووشەیی بە رووخسارەوە بوو. ئەویش چوارتایەیەکی سیلڤەر رەنگی بەدەستەوە بوو کە پاڵی دەدا. هەرچەند بێ مانا دەهاتەبەرچاو، بەلآم واپێدەچوو ئەم ژنە خەریکی گواستنەوەی هێلکە بێت. بە سەدان هێلکە کە لەسەر سینییەکی گەورە بە جوانی و رێکی چنرابوون، بەلآم توێکڵی هەموویان سپی بوو.

ئایا ئەگەری ئەوە هەبوو کە ئەم ژنە یەکێك لەو کەسانە بێت کە بۆ فەرمانبەرانی ئەم رێکخراوەیە خۆراك و خواردن ئامادە بکات؟ بەلأم ئەلێکس بیری خۆی لەمبارەیەوە گۆری و بەلایەوە ئەم ژنە چێشتلێنەر نەبوو. هەستی بەوە کرد کە کێشەیەك لە هێلەکەکاندا هەیە. هەموویان رێك یەك شێوە و یەك قەبارەن. ژنەکە چووە پشت ئامێرێك و لەبەرچاوان وون بوو. ئەلێکس بیری لەوە کردەوە کە دەبێ بەرێکەوێت.

چووە هەمان رێرەو کە پیاوەکە پێیدا رۆیشتبوو. ئێستا ئیش کردنی ئامێرێك بە گوێ دەڤەیشت. لە پەنجەرەوە سەیرێکی ژوورەکەی کرد. لەوێ ژنێك لە پشت ئامێرێك دانیشتبوو کە دەیان بۆری تاقیکاری پێوە بوو.

لە رێکخراوی کونسانتۆ چییان بەرهەم دێنا؟ رەنگە چەکی کیمیایی؟ چۆن دەکرا لەوێ دەربازی بکەن؟ ئەلێکس سەیرێکی دەستەکانی کرد کە ئێستاش بەهۆی پەرەشوتەکەوە پیس بوو. بەلایەوە سەیر بوو کە لە بیناکە زەنگی مەترسی لێنەدراوە.

ئەلێکس گەیشتە دەرگایەکی دیکە کە بە خۆشییەوە بە نزیکبوونی کرایەوە و توانی لێی تێپەرێ. بەهەرحاڵ رەنگە بیتوانیبا رێگەی چوونەدەرەوە بۆخۆی بدۆزێتەوە. بەلأم ئەم دەرگایەش ئەوی گەیاندە ناو رێرەوێکی دیکە. ئەم رێرەوە نەختێك بەرینتر لە رێرەوەکەی دیکە بوو. وای هەست کرد کە ئێستاش لە نهومی سەروویە. ئەو لەرێگەی سەربانەوە هاتووەتە ناوەوە و ئێستا بەدوای ئەسانسۆر یان پەیژەیەك دەگەرا کە پێیدا بچێتە خوارەوە.

لەناکاو لە مەودای دە مەتری ئەو دەرگایەك کرایەوە و پیاوێك بەسەیرسەمەرەیی سەیری ئەلێکسی کرد. سەری بێ موو بوو. لووتی هەڵۆیانی و چاویلکەیەکی پانی رەنگ رەشی لەچاو بوو. کۆتێکی سپی تایبەت بە ژووری تاقیگەی لەبەر کردبوو. جلەکانی فەرمی بوون، بەلأم ئەو رۆژە کە بینیبووی، جلی سپۆرتی لەبەر کردبوو. ئەو دکتۆر لیبەرمەن بوو.

ئـەو کەسـەی کـە پێشـتر بینیبـووی. لـە میوانـداری ڤێنیـز لەگـەڵ خـاتوو رۆدمەن قسەی دەکرد.

– من .....

ئەلێکس نەیدەزانی چی بڵێت.

– ون بوومە.

– تۆ رێگەت پێنەدراوە بێیتە ئێرە. ئێرە بەشێکی پارێزگارییە. تۆ کێی؟

– ناوم تامە. باوکم لێرە ئیش دەکات.

– ناوی چییە؟ لە چ بەشێکدا کار دەکات.

دکتـۆر لیبەرمـەن ئامـادە نـەبوو هـەر لـەجێوە ون بـوونی ئـەم کـوورە لاوە قبووڵ بکات.

– چۆن گەیشتوویەتە ئێرە؟

– باوکم منی بۆ ئێرە هێنا. ئەگەر رێگەی چوونە دەرەوەم نیشان بدەی، زۆر سوپاست دەکەم.

– نا، ناتوانم. دەبێ نیگابانی بەشی پاراستن بانگ بکەم. دەتوانی لەگەڵم بێی.

دکتۆر لیبەرمەن هەنگاوێك بەرەو ئەو دەرگایە رۆیشـت کـە لێـی هـاتبوو. ئـەلێکس لـەخۆی دڵنیـا نـەبوو کـە دەیهـەوێ چ کارێـك ئـەنجام بـدات. ئایـا دەبـێ خێـرا رابکـات؟ ئەگـەر زەنگـی مەترسـیان لێـدابا ئـەوکات چـی لێدەهاتەوە، پاسەوانەکان لەماوەی چەند چرکە دەگەیشتنێ. دوایی چی رووی دەدا؟ ئەو وای بیردەکردەوە کە رەنگە نیگابانەکانی کونسانتۆ ئەو بدەنـە دەسـت پـۆلیس. بـەلام ئەگـەر شـتێکی شـاراوەیان هەبوایـە. ئەگـەر شـتێکی نهێنیـان هەبوایـە، ئـەوکات ئەوەنـدە بـەخت یـاوەری نـەدەبوو کـە بیدەنە دەست پۆلیس.

دکتـۆر لیبەرمـەن بـۆلای شـتێك دەڕۆیشـت و ئـەلێکس دوگمـەی زەنگـی مەترسی لە تەنیشت دەرگا بینی.

– کێشە نییە، هارۆلد[٧١]. بۆخۆم چارەسەری دەکەم. دەنگەکە لەپشت سەری ئەلێکسەوە هاتبوو.

ئەلێکس سەیری دواوەی کرد و وەخت بوو دڵی بوەستێ.

وەکوو کابووس دەچوو. نیل کە ئەوی بێ هۆش کردبوو و خستبوویە ناو ژووری لافاوگر، لە پشت سەری ئەو وەستابوو. بزەیەکی لەسەر لێوەکانی بوو و بە تەواوی ئارام و هێور دەهاتەبەر چاو. ئەویش کۆتێکی رەنگ سپی پۆشیبوو و پانتۆڵێکی جین و تیشەرتێکی تەسکی لەبەربوو. جانتایەکی بە دەستەوە بوو. کاتێك ئەلێکس سەیری دەکرد، ئەو دەیویست جانتاکەی لەسەر عەردی دابنێ.

هارۆلد لیبەرمەن نەختێك بە گێژی دەهاتەبەرچاو.

– چاوەڕوانی ئەوە نەبووم دووبارە بتبینمەوە.

– خاتوو رۆدمەن منی نارد.

– بۆچی؟

– هەر ئەمجۆرەی کە خۆتان دەبینن دکتۆر رۆدمەن، ئەمنیەت و ئاسایشی ئێمە لەگەڵ کێشە رووبەڕوو بووەتەوە. ئەو بەر لەوەیکە بڕوات داوای لەمن کرد کارێکی بکەم.

– تۆ ئەم کوورە دەناسی؟ ئەو کێیە؟

– ناوی ئەلێکس رایدەرە.

– بەڵام ئەو وتی ناوی تامە.

– درۆ دەکات. پۆلیسی نهێنییە.

ئەلێکس لەنێوان ئەم گفتوگۆیەدا گیری کردبوو و دەیزانی کە هیچ کارێکی لەدەست نایات. نیل خێرایی و هێزی زۆر لە ئەو زیاتر بوو و پێشتر ئەمەی سەلماندبوو.

دکتۆر لیبەرمەن پرسی:

– دەتەوێ چی بکەی؟

---

71 - Harold

ئەو بەجۆرێك قسەی دەكرد كە نە نیل و نە ئەلێكس هیچكامیان نەدەبوایە لەوێ بن.

- من پێشتر وتم، هارۆلد. ناتوانین كێشەی ئەمنییەتی و پاراستنمان هەبێت. من دەمەوێ ئەم كێشەیە چارەسەر بكەم.

نیل دەستی بردە ژێر كۆتەكەی و شەمشێرێكی سامۆڕایی دەرهێنا كە تا ئەوكات ئەلێكس وێنەكەی نەبینیبوو. بەڵام درێژایی لە شەمشێر بچووكتر بوو. یانی درێژاییەكی لەنێوان خەنجەر و شەمشێردا بوو. نیل شەمشێری تاڕادەی شانەكانی بەرز كردەوە و ئەلێكس زانی كە لەگەڵ مامۆستایەكی وەرزشی بەئەزموون و بەتوانا رووبەڕوویە. رەنگە چەند چركەیەك لە مردن دوورە.

دكتۆر لیبەرمەن دەنگی بەرز كردەوە:

- ناتوانی لێرە بیكووژی. خوێنەكەی بۆ هەموو شوێنێك دەپرژێت!

- نیگەران مەبە، هارۆلد. شەمشێرەكە لەملیەوە دەخەمە ناو مێشكی سەری. خوێنێكی ئەوتۆ ناڕژێت.

ئەلێكس ئامادەی ئەوە بوو كە جێگەی خۆی بەتاڵ بكات.

لەم كاتەدا بوو كە شەمشێر هاویشترا. شەمشێر لە نزیكی شانی ئەلێكس تێپەڕی. ئایا نیل هاویشتنەكەی بەخەتا رۆیشتووە؟ نا، بەهیچ شێوەیەك. نیل شەمشێرەكەی هاویشتبووە دكتۆر لیبەرمەن. دكتۆر لیبەرمەن زۆر بە خێرایی گیانی لەدەست دا.

- رێك تیغەی شەمشێرەكە چووە ناو مێشكی. هەر ئەمجۆرەی كە پێشتر وتبووم.

لەكاتێكدا ئەلێكس بێ وتنی تەنیا وشەیەك سەیری دەكرد، نیل لە تەنیشتی تێپەڕی و بۆلای تەرمی دكتۆر لیبەرمەن چوو. شەمشێرەكەی لە جەستەی ئەو دەرهێنا و بە ریباتی دكتۆر لیبەرمەن خوێنەكەی پاك كردەوە و شەمشێرەكەی لە جێگەی خۆی لەژێر كۆتەكەی دانا و سەیرێكی سەرووی كرد.

- سلاو ئەلێکس. چاوەڕوانی ئەوە نەبووم لێرە بتبینم. خاتوو ڕۆدمەن لە دیتنت خۆشحاڵ دەبێ.
- تۆ کە ناتهەوەێ بمکوژی؟
- نا، بەهیچ شێوەیەك.

نیل هەستا و چووە لای جانتا دەستییەکە و کردییەوە. بۆ ئەلێکس قبووڵکردنی ئەم ڕووداوەی ڕووی دابوو، زۆر سەخت و دژوار بوو. لەناو جانتاکە کۆمپیوتەرێك و ژمارێك وایەری تێدابوو. نیل چۆکی دادا و بە خێرایی دوگمەکانی کۆمپیوتەری پاڵدەدا. چەند نیشانەیەك لەسەر مۆنیتۆرکە دەرکەوتن. ئەو لەکاتێکدا تایپی دەکرد، لە قسەکردنی بەردەوام بوو.

- هیوادارم لێم ببوری، ئەلێکس. لەو ڕووداوەی کە لە کۆشکی بێوەژن ڕووی دا، زۆر بەپەرۆشم. نەمدەزانی تۆ کێی. تۆ کووڕی جۆن رایدەری. ڕاکردنت زۆر ئازایانە بوو. ئەگەر بمردبای، هیچکات خۆم نەدەبەخشی.

نیل تایپ کردنی کۆتایی پێهینا و بابەتەکەی بۆناو کۆمپیوتەرکە گواستەوە.

بەلام ئێستا ناتوانین بەیەکەوە قسە بکەین. خاتوو ڕۆدمەن لە قەراغ دەریا لە پوزیتانۆ[72]یە. باش دەزانم کە لە دیتنت زۆر خۆشحاڵ دەبێ.

ئەلێکس پرسی:

- بۆچی دکتۆر لیبەرمەنت کووشت؟
- خاتوو ڕۆدمەن ئەمری پێکردم کە ئەم ارە بکەم. زۆر پرسیارت هەیە، بەلام ناتوانم لێرە وەلامی هەموویان بدەمەوە. بۆمبێکم داناوە کە تا ماوەیەکی کوورت دەتەقێتەوە.

نیل سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد.

- نەوەد و دوو چرکەی دیکە. کاتی قسە کردنمان نییە.

[72] - Positano

جانتاكەی لە نزیك سەری د كتۆر لیبەرمەن دانا و بۆ دوایین جار سەیرێكی تەرمەكەی كرد بۆئەوەی لە كووشتنی مسۆگەر بێت. دوایی هەستایە سەرپێ و بەرێكەوت. ئەلێكس بەدوای كەوت. دەیتوانی چ كارێكی دیكە بكات؟ نیل گەیشتە دەرگایەكی داخراو. ژمارەی نهێنی لێدا. دەرگا بەخێرا كرایەوە. ئێستا گەیشتنە ئەم پەیژەیە كە ئەلێكس بەدوایدا دەگەڕا. سێ نهوم لە پەیژەكان هاتنە خوارێ. ئێستا گەیشتنە دەرگایەكی دیكە.

نیل دوگمەیەكی پاڵدا و ئیتر ئێستا ئەوان لە شوێنێكی كراوە بوون. ئۆتۆمبێلێك پارك كرابوو. ئۆتۆمبێلێكی ئالفا رۆمیۆ[٧٣]ی شەبەحی مۆدێل نوێ.

نیل وتی:

- سوار بە.

جۆرێك قسەی دەكرد وەكوو ئەوە دەچوو كە ئەو و ئەلێكس لە سینەما هاتوونەتەدەر و ئێستا بۆ ماڵەوە دەگەڕێنەوە.

ئەلێكس سوار بوو و بەڕێكەوتن. لەو كاتەی كە نیل بۆمبەكەی داناوەتەوە، چ كاتێك دەگوزەرا؟ ئێستا هەوای دەرەوە بە تەواوی تاریك بوو. خۆر خۆی شاردبۆوە. بە ئۆتۆمبێل بەرەو دەرگای دەرەوە دەڕۆیشتن. نیل بەدەم پاسەوانەوە پێكەنی و بە زمانی ئیتاڵی قسەی كرد. پاسەوان سەری داخست و ڕێگەی بۆ كردنەوە.

نیل پێی خستە سەر بەنزین و ئۆتۆمبێل بە نەرمی بەڕێكەوت. ئەلێكس لەكاتێكدا لەسەر كووشین دانیشتبوو، سەیری پشتەوەی خۆی كرد. چەند چركە دواتر تەقینەوەیەكی گەورە روویدا. گڕە سوورەكان لە پەنجەرەكانی بینای رێكخراوە هاتنەدەر. پەنجەركان ورد بوون و دوكەڵ و ئاگر بیناكەی داگرت. بە هەزران لەتە شووشە و پۆلا پەرشوبڵاو بوون و وەكوو باران رژانە سەر زەوی. دەنگی ئاژیری مەترسی بە دەنگێكی بڵند بەرزبۆوە.

---

73 - Alfa Romeo

ئەلێکس قەبارەی بۆمبەکەی بینیبوو و ئێستا بەلایەوە سەیر بوو بۆمبێکی ئاوا بچووك چۆن دەتوانێ ئاوا وێرانگەر بێت.
نیل لە ئاوێنەی پێشەوەی ئۆتۆمبێل سەیری پشتی سەری کرد.
– ئامان لەدەست رووداوی پیشەیی! مرۆڤ نازانێ تەقینەوەی دواتر لە چ کاتێك روو دەدات!
نیل ئالفا رۆمئۆی بەرەو جاددەی قەراخ دەریا لێخووڕی. ئێستا بە خێرایی هەشتا مایل لە کاتژمێردا دەڕۆیشت. لەپشت سەری ئەو، رێکخراوی کونسانتۆ لە ئاگردا سووتا. بڵێسەکانی ئاگر شەوی تاریکیان روون کردبوو.

## دارِشتنی پیلان

ئەلێکس لەبەرهەیوان وەستابوو و سەیری شاری پوزیتانۆ و ئاوی رەشی مەدیتەرانەی دەکرد کە لەملای شارەوە دەبینرا. لە رۆژئاوابوونی خۆر دوو کاتژمێر تێپەڕیبوو، بەلام گەرما ئێستاش لە هەوادا جێگەی خۆش کردبوو. جلی خاولەیی پۆشیبوو. دوای ئاو بەخۆداکردنێکی شیلەوتین، پرچی ئێستاش تەڕ بوو. لەسەر مێزەکەی پەرداخێکی ئاوی لیمۆی تازە دەبینرا. لەوکاتەوە کە بۆ دووهەمجار نیلی بینیبوو، وایدەزانی کە خەونی بینیووە و ئێستا وادیارە ئەم خەونە بۆلایەکی غەریبی دەبات.

پێش هەموو شت، هۆتێل. ناوی هۆتێل سایرنوس[٧٤] بوو و ئەمجۆرەی کە نێل دەیوت، لە لۆکسترین و رازاوەترین هۆتێلەکانی باشووری ئیتالیا بوو. ژووری ئەلێکس زۆر گەورە بوو و هیچ بە ژوورەکانی هۆتێل نەدەچوو. بە ئاپارتمانێکی گەورەی ناو کۆشکەکانی ئیتالیا دەچوو. تەختێکی زۆر گەورەی هەبوو کە بە قوماشی سپی لە لۆکەی میسری داپۆشرابوو. مێزی کاریی، تەلەڤزیۆنێکی سی و شەش ئینچ، ڤێدیۆیەك، دەزگەیەکی دی وی دی و کوشینێکی گەورەی چەرمی ئەشیاکانی دیکەی ژوورەکەی پێکدەهێنا.

پەنجەرەیەکی گەورە بەرەو هەیوان دەکرایەوە. حەمامی ژوورەکە بەشی تیپێکی یاری تۆپی پێی دەکرد. هەموو بەردەکان لە جۆری مەڕمەڕ بوون و بە کاریی دەستی رازانرابوونەوە. ئەم هۆتێلە ئی ملیۆنەرێك بوو. ئەلێکس بیری لەوە دەکردەوە کە هەر شەوێکی ئەم هۆتێلە دەبێ چەندی پارە بوێت.

---

74 - Sirenuse

نیل ئەلێکسی بۆ ئەم هۆتێلە هێنابوو. لەماوەی گەشتە کوورتەکەیان هیچکامێکیان قسەیان نەکردبوو. ئەلێکس سەدان پرسیای هەبوو کە دەیویست لە نیل بپرسێ، بەڵام خێرایی زۆر و دەنگی بەرزی مۆتۆڕی ئالفا رۆمئۆ ئەگەری قسە کردنی نەهێشتبۆوە.

بەڵام بەهەرحاڵ، ئەلێکس هەستی دەکرد نیل ئەو کەسە نییە کە وەڵامی پرسیارەکانی ئەو بزانێ. بیست خوولەك لە جاددەی کەناردەریا شوفێریان کردبوو تا بەم هوتێلە گەیشتبوون. ئۆتۆمبێلەکەیان لە پێش هوتێل پارك کردبوو کە شوێنێکی ئاسایی دەهاتەبەرچاو.

لەکاتێکدا ئەلێکس بەرگەکانی مانەوە لە هوتێلی پڕ دەکردەوە، نیل بە مۆبایلەکەی قسەی دەکرد.

– خاتوو رۆدمەن لەوەیکە لێرەی، زۆر خۆشحاڵە. کاتژمێر نۆ و نیو خواردنی شەوت لەگەڵ دەخوات. پێی وتم جلێکی شایستەت بۆ بێنم.

دوایی بە رێکی سەیری ئەلێکسی کرد.

– دەتوانم جلی تۆ زۆر بە باشی ئامادە بکەم. ئایا لەبواری جلەوە حەزت لە هیچ جۆرە مۆدێلێکی تایبەتی هەیە؟

ئەلێکس شانەکانی هەڵاویشت؟

– نا، هەر مۆدێلێکی هەڵیبژێری، لەبەری دەکەم.

– زۆر باشە. پێشخزمەت بۆ ژوورەکەی خۆت رێنوێنیت دەکات. خۆشحاڵم کە لەگەڵت ئاشنا بووم. بێشك هاوڕێیەتێکی خۆشمان دەبێت. خواردنی شەوت بخۆ. خواردنی ئێرە نایابە. ئەمەی وت و سواری ئۆتۆمبێل بوو و بەڕێکەوت.

*بێشك هاوڕێیەتێکی خۆشمان دەبێت*. ئەلێکس بە ناباوەڕی سەرێکی جووڵاند. رێك دوو شەو پێشتر ئەم پیاوە بە لێدانێك بێ هۆشی کردبوو و خستبوویە ناو ژوورێکی تاکە کەسی بۆ ئەوەی بە هاتنەژووری ئاو لەناو ژوورەکەدا بخنکێ.

لەم بیرەدا بوو کە پیاوێکی بە تەمەن کە ئۆنیفۆرمێکی پۆشیبوو بۆ ژوورەکەی رێنوێنی کرد. ژوورەکەی لە نهومی دووهەمدا بوو. لە رێڕەوێك

که دیوارەکەی پڕ لە ئەشیای کۆنەوار بوو تێپەڕین و دوایی چووبووە ناو ژوورەکەی خۆی. ئەلێکس خێرا سەیرێکی ژوورەکەی کرد. دەرگا دانەخرابوو و تەلەفۆنەکانی ژوورەکە کاریان دەکرد. واپێدەچوو تەلەفۆنکردن ئازاد بێت و بەدڵی خۆی دەتوانێ قسە لەگەڵ هەر کەسێك کە دەیهەوێ بکات، ئەویش لە هەر شوێنێکی دونیادا. دەیتوانی پەیوەندی بە پۆلیسیشەوە بگرێت. بەهەرحاڵ، ئەو شایەدی بەشێکی گەورەی وێرانبوونی رێکخراوی کونسانتۆ بوو. کوشتنی هارۆلد لیبەرمەنیشی بینیبوو. بەلاّم بێشك نیل متمانەی بە ئەلێکس کردبوو کە لەمبارەیەوە بێدەنگ دەبێ یا لانیکەم تا ئەوکاتەی کە خاتوو رۆدمەنی دەبینێ، دەبێ ئەمکارە بکات. هەروەها، ئەگەر حەزی لێبوو، ئەوا دەیتوانی هوتێل جێبهێڵێ. دەیتوانی زۆر بە سادەیی خۆی حەشار بدات. بەلاّم ئەوان بیریان لەوە کردبۆوە کە ئەلێکس ئەم کارە ناکات. بوارەکە زۆر تێکەڵ و پێکەڵ ببوو.

ئەلێکس خواردنەوەکەی خواردەوە و سەیری سرووشتی شەوی کرد.

شەوێکی زۆر جوان بوو. ئاسمان پڕ بوو لە هەزاران ئەستێرە. دەنگی شەپۆلی دەریای گوێ لێدەبوو. شاری پوزیتانۆ لەسەر تەپۆلکەیەکی سەراوژێر بینا کرابوو. سوپەرمارکێتەکان، رێستۆرانتەکان، خانووەکان و بیناکان هەموویان لەسەر یەك دروست کرابوون. شەقامێکی پێچاوپێچ بەیەکەوەی دەبەستنەوە. هەموو جێگە رووناك بوو. وەرزی پشوو لە رۆژەکانی کۆتایی خۆی نزیك ببۆوە، بەلاّم شار پڕ لە خەڵکانێك بوو کە دەیانویست تا دوایین رۆژ لە پشووی خۆیان بە باشترین شێوە چێژ وەربگرن.

دەنگی دەرگا هات. ئەلێکس چووە ناو ژوورەکەی کە تەختایی لە بەردی مەرمەڕ دروست کرابوو. خزمەتکارێکی هوتێل بوو کە کۆتێکی سپی و ریباتێکی رەشی بەستبوو.

– ئەمە جلەکانی تۆیە، بەڕێز. بەڕێز نیل پێشنیاری دا ئەمانە بۆ ئەم شەو لەبەر بکەی.

ئەمەی وت و لە ئەلێکس دوور کەوتەوە.
ئەلێکس جانتاکەی کردەوە. پڕ لە جل بوو. هەموویان جلی گرانبەها بوون. کۆت و پانتۆڵ لەسەر جلەکانی دیکە دانرابوو. ئەلێکس ئەوانی لەسەر تەخت دانا. بە رەنگی خۆڵەمێشی و ئاوریشمی، مارکەکەی میومیو[٧٥] بوو. کراسێکی سپیشیان بۆ دانابوو کە ئەمەشیان مارکەکەی ئارمەنی[٧٦] بوو. سندووقێکی چەرمی بچووکیش لەناو جانتاکەدا بوو. کاتێک کردییەوە، بینی کاتژمێرێکی بە مارکەی مرسیە[٧٧] ی تێدابوو. رەنگە بە سەدان پاوندیان کڕیبێ. سەرەتا ژوورێکی خۆش و رازاوە و دوایی ئەم هەموو جل و بەرگە.
ئەلێکس بۆ کاتێکی کەم بیری کردەوە. نەیدەزانی چی بکات. ساعەت نزیك بە نۆ و نیو بوو. جلەکانی لەبەر کرد و لە ئاوێنەدا سەیرێکی خۆی کرد. کۆت و پانتۆڵەکە رێك بۆ بەری دەبوو. خاتوو رۆدمەن جووتێك پێڵاو و ریباتێکیشی بۆ ناردبوو.
ئەلێکس بە زەحمەت خۆی دەناسییەوە.
رێك سەری ساعەت نۆ و نیو ئەلێکس بۆ رێستۆرانتی هۆتێلەکە چوو. ئێستا دیار بوو کە هۆتێلەکە لە تەنیشت تەپۆڵکە بینا کراوە و لەڕاستیدا زۆر گەورەتر لەوە بوو کە بیری لێدەکرایەوە. رێستۆرانت بە سەدان مۆم رووناك دەکرا کە لە ناو لوستەری شووشەیی دانرابوون. ژمارێکی بەرچاو خەریکی خواردنی نانی شەو بوون. خزمەتکارەکان خێرا لەسەر مێزێك بۆ مێزێکی دیکە دەچوون. دەنگی پێکەوتنی کێرد و کەوچك و چەنگاڵ کە بە قاپ دەکەوتن لەگەڵ سرتەسرتی ئامادەبووان بێدەنگی ژوورەکەی دەشکاند و ژوورەکەی پڕ کردبوو.

---

75 - Miu Miu
76 - Armani
77 - Baume & Mercier

باشترین مێز بۆ خاتوو رۆدمەن رازابۆوە. مێزەکەی لەنێوان هەیواندا بوو کە رووی کەوتبووە شاری پوزیتانۆ و دەریای مەدیتەرانە. خاتوو رۆدمەن بە تەنیایی لە پشت مێز دانیشتبوو و چاوەڕاوانی ئەو بوو. جلێکی رەنگ رەشی لەبەر بوو و ملوانکەیەکی ئەڵماسی بە ملەوە هەڵواسیبوو. خاتوو رۆدمەن ئەلێکسی بینی، بزەیەکی هاتێ و دەستێکی راوەشاند . ئەلێکس بۆلای ئەو چوو. ئێستا لەناو ئەم جلکانە بە بڕوابەخۆبوونێکی بەرچاو گەیشتبوو. زۆربەی خەڵکەکە جلی غەیری فەرمیان لەبەربوو. ئەلێکسیش ریباتی نەبەستبوو.

- زۆر جوانپۆش بوویە، ئەلێکس. ئەم جلانەت لێدێت. مارکەی میومیوە. راستە؟ زۆرم حەز لەم مارکەیە. تکایە دانیشە.

ئەلێکس دانیشت. لەبیری ئەوەدا بوو کە خەڵکانی دیکە بە دیتنی، ئەو چی دەڵێن. ئایا وابیر دەکەنەوە دایکێك لەگەڵ کوورەکەی بۆ ریستۆرانت هاتووە؟

خزمەتکارێك هاتە لایان و چاوەڕوانی ئەوە بوو ئەلێکس داوای خواردن بکات.

- تکایە پەرداخێك ئاوی پرتەقاڵی تازە بە سەهۆڵەوە.

خزمەتکارەکە نەختێك داهاتەوە و رۆیشت بۆئەوەی ئاومیوەی ئەلێکس بێنێ. ئەلێکس چاوەڕوان مایەوە تا خاتوو رۆدمەن قسە بکات.

خاتوو رۆدمەن وتی:

- خۆراکی ئەم ریستۆرانتە نایابە. لەڕاستیدا، لە باشترین ریستۆرانتەکانی ئیتاڵیایە. هیوادارم لێمببووری، بەڵام پێشتر داوای خواردنم بۆتۆش کردووە. ئەگەر پێتخۆش نەبوو، دەتوانی داوای خواردنێکی دیکە بکەی.

- زۆر سوپاس، کەواتە باشە.

خاتوو رۆدمەن خواردنەوەیەکی دەست دایە و قومێکی خواردەوە.

– بەلام بەر لە هەموو شت دەبێ پێم بڵێی کە لێمبوراوی. ئەو رووداوەی کە لە کۆشکی بێوەژن روویدا زۆر مەترسیدار بوو. لەم ڕوویەوە شەرمەزارم.

ئەلێکس وتی:

– مەبەستت هەوڵدان بۆ کوشتنی منە؟

– ئەلێکسی ئازیز، تۆ بێ کارتی بانگهێشتەوە بۆ میوانی هاتبووی و دوایی چووبوویتە ناو ژووری خوێندنەوەم. تۆ ناوێکت هێنابوو کە دەبوایە خێرا گیانت لەدەست بدەی. بەخت یاوەرت بوو کە نیل، ویستی لەجیاتی کووشتنت بتخنکێنێ. هەڵبەت ئەگەر بمانزانیبا ئەتۆ کێی، بێشك جۆری هەڵسووکەوتەکە بە تەواوی دەگۆڕا.

– من ناوی خۆمم بە نیل وت.

– بەڵێ، ئەو لەوکاتەدا گرنگی بە ناوی تۆ نەدا. بەلام بەیانی رۆژی دواتر ناوی تۆی پێ وتم، بڕوات بێ بە تەواوی شڵەژام. بڕوام بەوە نەدەکرد ئەلێکس رایدەر، کووڕی جۆن رایدەر، لەناو ماڵی مندا بێت. بڕوام نەدەکرد کە لە ژووری تاکە کەسی زیندانیان کردبێ....

خاتوو رۆدمەن بۆ ماوەیەکی کوورت چاوەکانی خۆی بەست.

– پێش ئەوەی کە بتوانین دەرگای ژوورەکە بکەینەوە، دەبوایە چاوەڕوانی نیشتنی ئاوەکە بین. زۆر نیگەران بووم. وام بیردەکردەوە کە کار لە کار ترازاوە. دوایی کاتێك دەرگای زیندانە تاکە کەسییەکەم کردەوە، بینیم کە کسی تێدا نییە. تۆ رات کردبوو. وابزانم بە مەلە خۆت گەیاندبووە ئەم چالاوە کۆنە. راستە؟

ئەلێکس سەری بەنیشانەی بەڵی جوولاند.

– لە نیل تووڕە بووم. دروست بیری نەکردبۆوە. هەر کە ناوی رایدەرت هێنا دەبوایە بۆ ئەو بەس بێ. دوایی جارێکی دیکە لە کونسانتۆ تۆم بینی. لەوێ چیت دەکرد؟

– بەدوای تۆدا دەگەڕام.

خاتوو رۆدمەن بۆ ماوەیەك وەستا و چووە ناو بیرکردنەوە.

- بێشك فایلی ناو کشەوی مێزی منت بینیبوو. ئایا گوێت لە قسەکانی من لەگەڵ هارۆلد لیبرمەن بوو؟
خاتوو رۆدمەن چاوەڕوانی وەڵام نەبوو.
- بەڵام خاڵێك هەیە کە دەمەوێ بزانم. چۆن چوویتە ناو ئەم ڕێکخراوەیە.
- لە تاشەبەردی راڤۆلۆ خۆم هەڵدا.
- بە پەرەشوت؟
- بەڵێ.
خاتوو رۆدمەن سەری بردە دواوە و پێکنینێکی هاتێ. لەم کاتەدا زیاتر لە هەمووکات بە ئەکتەرەکانی سینمای هۆلیوود دەچوو.
- زۆر باشە. بەڕاستی کە سەرسووڕهێنەرە.
ئەلێکس بەردەوام بوو:
- ئەم پەرەشووتەم لە برای هاوڕێیەکم بە قەرز وەرگرت و هەروەك دەبینی بەباشی کەڵکم لێوەرگرت. من هەموو ئەشیاکانی ئەوانم لەدەست دا. ئەوان نازانن ئێستا لە کوێم.
خاتوو رۆدمەن بەشێوەی هاودڵیانە وتی:
- دەتوانی تەلەفۆنیان بۆ بکەی و پێیان بڵێی کە هیچ کێشەیەکت بۆ نەهاتووەتەپێش. سبەی بۆ براکەی هاوڕێت چەکێك دەنووسم. ئەمە کەمترین کارە کە دەتوانم بیکەم.
خزمەتکار پەرداخە ئاوە پرتەقاڵەکەی ئەلێکسی هێنا و لەگەڵ ئەویشا دوو خواردنی راڤیۆلی[٧٨] لەسەر مێزەکە دانا. ئەلێکس نەختێك خواردنی خوارد. هەر ئەمجۆرەی کە خاتوو رۆدمەن وتبووی، زۆر بەچێژ بوو.
ئەلێکس پرسی:
- نیل چ کێشەیەکی هەیە؟
- جاریوایە زۆر گێل دەبێ. سەرەتا کارەکە دەکات جا دوایی دەپرسێ. ئەو هیچکات بیر ناکاتەوە.

---

[78] Ravioli-

- مەبەستم پێستی ئەو بوو.
- ئاها، پێستەکەی! ئەو تووشی نەخۆشی برص بووە. نیلی بێچارە! ئەو بە رەشی لەدایك بووە، بەڵام تا ئەو کاتەی دەمرێ دەبێتە سپی پێستێکی تەواو. بەڵام واباشترە لەبارەی ئەوەدا قسە نکەین. بوارگەلێکی زۆر هەن کە لەبارەیاندا بۆئەوەی بمانهەوێ لەبارەیاندا قسە بکەین.
- ئێوە باوکی منتان دەناسی؟
- بەڵێ، ئەوم زۆر بە باشی دەناسی، ئەلێکس. لە باشترین هاوڕێکانی من بوو و دەبێ ئەوەش بڵێم کە تۆش رێك وەکوو ئەوی. بەڕاستی زۆر بەلامەوە سەیرە کە لێرە لەگەڵ تۆ دانیشتووم. وا هەست دەکەم کە دوای پازدە ساڵ ئەو گەڕاوەتەوە.
- حەز دەکەم زانیارییەکی زیاترم لەبارەی ئەودا هەبێ.
- چی دەتوانم بڵێم کە تۆ پێشتر لە باوکت نەزانیوە.
- من هیچ زانیارییەکم لێی نییە جگە لەوەیکە یاسین گرگووریچ لەبارەیدا وتوویەتی.

ئەلێکس نەختێك وەستا. ئەوکاتەیە بوو کە لێیدەترسا.
- ئایا باوکم پیاوکوژێکی پیشەگەر بوو؟

بەڵام خاتوو رۆدمەن وەڵامی نەدایەوە. چاوەکانی لە لایەکی دیکە بڕی و وتی:
- یاسین تۆی بۆلای من نارد؟
- لەکاتی مردنی لەلای بووم.
- بۆ یاسین بەداخ بووم، وابزانم کوشتوویان.

ئەلێکس قسەی پێشووی دووبارە کردەوە.
- دەمهەوێ لەبارەی باوکم بزانم. ئەو بۆ رێکخراوێك بەناوی دووپشك کاری دەکرد. ئەو مرۆڤکوژ بوو. ئایا راست دەڵێم؟
- باوکت هاوڕێی من بوو.
- ئێوە وەڵامی پرسیاری من نادەنەوە.

ئەلێکس هەوڵی دەدا تووڕە نەبێ. خاتوو رۆدمەن زۆر هێور و لەسەرەخۆ و دۆستانە بوو، بەڵام ئەلێکس ئێستا دەیزانی کە ئەو زۆر دەوڵەمەند و لەوپەڕی بێ رەحمی دایە.

خاتوو رۆدمەن زۆر ئارام بوو.

– نامهەوێ لەبارەی ئەودا قسە بکەم. ئێستا زوویە، سەرەتا دەمهەوێ لەبارەی تۆدا زانیاریم هەبێ.

– لەبارەی مندا دەتهەوێ چی بزانی؟

– ئەلێکس، ئێستاش زۆر شت لەبارەی تۆدا دەزانم. تۆ ناوبانگێکی زۆرت هەیە. هەر بۆیەشە ئەمشەو لێرە بەیەکەوە دانیشتووین. من پێشنیارێکم بۆت هەیە کە رەنگە بەلاتەوە سەیر بێ. بەڵام هەر لە ئێستاوە دەمەوێ ئەوە بزانی کە بەتەواوی ئازادی. هەرکاتێك حەز دەکەی دەتوانی بڕۆی. من نامهەوێ ئازارێك بە تۆ بگەیەنم. زۆر بە پێچەوانە، تەنیا دەمەوێ گوێم لێبگری و دوایی بزانم بیروڕات چییە.

– دوایی لەبارەی باوکم زانیاریم دەدەیتێ.

– هەموو ئەم شتانەی کە دەتهەوێ بیزانی.

– زۆر باشە.

خاتوو رۆدمەن پەرداخی خواردنەوەکەی لەسەر مێز دانا و شێوازێکی جددیانەی بەخۆوە گرت.

– تا ئەوجێگەیەی بزانم، ماوەیەك بۆ (ئێم ئای٦) کارت دەکرد. لە رووداوی ململانێت لەگەڵ کۆمپیۆتەرەکانی گەردەلوولشکێن، دوایی رۆیشتنت بۆ قووتابخانە لە ئاڵپ لە فەڕەنسا و دواییش سەفەرت بۆ کوبا و لە کۆتاییدا رووداوەکەی دامیان کاری زانیاریم هەیە. پرسیاری من ئەوەیە کە بۆچی ئەم کارانەت کردووە و چیت پێگەیشتووە؟

– مەبەستت چییە؟

– ئایا مووچەت وەردەگرت؟

ئەلێکس سەرێکی بەنیشانەی نەخێر جووڵاند.

خاتوو رۆدمەن بیرێکی کردەوە.

- یانی نەتەوەپەرستی؟
- من ولآتی خۆمم خۆش دەوێ و ئەگەر شەڕێك روویدات، سەبارەت بە ولآتەکەم دەجەنگم. بەلآم خۆم بە نەتەوەپەرەست نازانم. نا.
- کەواتە، دەبێ وەلآمی پرسیاری من بدەیتەوە. بۆچی گیانت بۆ (ئێم ئای٦) لە مەترسی داوێی؟ بێشك خۆ مەبەستت ئەوە نییە کە خولیا و عاشقی ئەو ئالان بلێنت[٧٩] و خاتوو جۆنز[٨٠] ی. من ئەوانم بینیوە. ئەوان هیچ کارێکیان بۆ من نەکرد. تۆ گیانت سەبارەت بە ئەوانەوە لە مەترسی داوێی. ئەلێکس، تۆ زۆرجار چوویتە ناو مردن، بۆچی؟
ئەلێکس گێژ ببوو.
- دەتهەوێ بە چ ئەنجامێك بگەی؟ بۆچی ئەم پرسیارانە لەمن دەکەی؟
- چونکە دەمهەوێ پێشنیارێکت پێبدەم.
- چ پێشنیارێك؟
خاتوو رۆدمەن نەختێك لە خواردنەکەی خوارد.
- رات چییە بەرامبەر بەوەیکە بۆ من ئیش بکەی؟
- بۆ دووپشك؟
خاتوو رۆدمەن سەری بەنیشانەی بەڵێ هێنایەخوار.
- پێشنیارم پێدەدەی ببم بە مرۆڤ کووژ؟
خاتوو رۆدمەن بزەیەکی هاتێ.
- رەنگە. تۆ ئەلێکس، لێهاتوویەکی بەرچاوت هەیە. بە پێی تەمەنت کە چواردە ساڵەی، زۆر کاری سەرسوورهێنەر دەکەی. هەر ئەم تەمەنە کەمەت لە زۆر بواراندا دەتوانێ یارمەتیمان بدات. وابزانم هەر بۆیەشە کە بەڕێز "بلێنت" تا ئەوڕادەیە حەزی لە تۆیە. تۆ کاری ئاوا دەکەی و بۆ شوێنی ئاوا دەڕۆی کە کەسێکی پێگەیشتوو لە توانایدا نییە.

---

79 - Alan Blunt

80 - Mrs Jones

- دووپشك چییه؟ ئێوه له كونسانتۆدا چی دەكەن؟ لەم ڕێكخراوەدا چی بەرهەم دێنن؟ بۆچی ناچار بوون دکتۆر لیبەرمەن بکووژن؟
خاتوو ڕۆدمەن بەشی یەکەمی خۆراکەکەی خوارد و چەنگاڵەکەی خستە ناو قاپەکەی.
- چەندە پرسیار! ڕێکخراوی کونسانتۆ کۆمپانیایەکی بیوکیمیایی ئاساییە. ئەگەر بتهەوێ لەمبارەیەوە زانیاری زیاتر بەدەست بێنی، دەتوانی سەیری کتێبی ڕێنەوێنی تەلەفونات بکەی. سەنتەری ئەم ڕێکخراوەیە لە هەموو ئیتاڵیادا هەیە. بەڵام ئەوەیکە ئێمە لەوێ چیمان دەکرد، شتێکە کە ناتوانم پێت بڵێم. ئێستا ئێمە خەریکی پرۆژەیەکین بەناوی شەمشێری نادیار. بەڵام هیچ هۆیەك نابینم کە تۆ زانیاری لەمبارەوە بزانی. یانی هێشتا نابێ بزانی، بەڵام پێت دەڵێم کە بۆچی ناچار بووین دکتۆر لیبەرمەن بکووژین. زۆر سادەیە. هۆیەکەی ئەوە بوو نەماندتەوانی متمانەی پێبکەین. ئێمە پارەیەکی زۆرمان پێدابوو و تا لە بوارێکدا یارمەتیمان بکات. ئەو نیگەرانی کارەکەی بوو و هەر بۆیەش پارەیەکی زیاتری داوا کرد. کەسێکی وەکوو ئەو دەیتوانی بۆ ئێمە مەترسیدار بێت. دروستییەکەشی ئەوە بوو کە دەبوایە خۆمانی لێ دەرباز بکەین.
- بەڵام بگەڕێینەوە سەر پرسیاری یەکەمی تۆ. دەتویست زانیاری لەبارەی دووپشك بەدەست بێنی. هەر بۆیەش هاتویتە ڤێنیز و تا ئێرە بەدوام کەوتووی. زۆر باشە. بۆت باس دەکەم.
خاتوو ڕۆدمەن قومێك لە خواردنەوەکەی خواردەوە و پەرداخەکەی لەسەر مێز دانا. ئەلێکس ئاگاداری ئەوە بۆوە کە مێزەکەیان لە شوێنێك داناوە بۆئەوەی کەس گوێی لە قسەی ئەوان نەبێ. بەم حاڵەشەوە خاتوو ڕۆدمەن هەوڵی دا بە دەنگێکی ئارامتر بدوێت.
- هەر ئەمجۆرەی کە شکت کردووە، دووپشك تەشکیلاتێکی مەترسیداری تاوانکارانەیە. ئێمە لە کارەکانماندا سەرکەوتووین و ئەم ڕێکخراوە ئێمەی بەهێز کردووە. ئێمە لە هەموو جیهاندا چالاکیمان هەیە.

دەزگا ئاسایشەکانی جیهان بەرامبەر بە ئێمە ناتوانن هیچ کارێك بکەن. ئێمە پارە وەردەگرین و خزمەتی رێکخراو و دەزگەکانی دیکە دەکەین.
ئەلێکس کێرد و چەنگاڵی لەسەر مێز دانا.

- هەروەها ئێوە دەتانهەوێ ئیشتان بۆ بکەم؟ من وەکوو ئێوە نیم. بێشك ئەمجۆرە نیم.

- زۆر سەیرە، بەڵام باوکت وەکوو ئێمە بوو و وەکوو ئێمەش بیری دەکردەوە.

ئەلێکس لە بیستنی ئەم قسەیە تووڕە بوو. خاتوو رۆدمەن باسی کەسێکی دەکرد کە هیچکات هەلی ئەوەی پەیدا نەکردبوو لەبارەیدا زانیاری بەدەست بێنێت. بەڵام خاتوو رۆدمەن رێك لە خاڵی رەشی دا؛ و باسی باوکی کرد.

- ئەلێکس، دەبێ کەمێك گەورەتر بی و هەموو شت بە رەش و سپی نەبینی. تۆ بۆ (ئێم ئای٦) کار دەکەی. ئایا وا بیر دەکەیتەوە مرۆڤگەلێکی باشن. لە سەدەی بیست و یەکەمدا بوارەکان گۆڕاون. نەختێك بیر لە "ئالان بلێنت" بکەوە. جگە لە خەڵکانێکی زۆر کە لە سەرتاسەری دونیادا کووشتوویەتی، بزانە چۆن سوودی نابەجێ لەتۆ وەردەگرێت. ئایا بەرلەوەی تۆ لە قووتابخانە بێنێتەدەر و پۆلیسێکی نهێنیت لێ دروست بکات، قسەی لەگەڵ کردی؟ پێموانەبێ. سوودی نابەجێت لێوەردەگرێت. تۆ خۆشت ئەمە باش دەزانی.

- من پیاوکووژ نیم. هیچکاتیش ناتوانم مرۆڤکووژ بم.

- زۆر سەیرە کە ئەم قسەیە دەکەی. مەبەستت ئەوەیە کە من دامیان کاری لەسەر ئەم مێزە نابینم. یانی نازانم چی بەسەر هاتووە؟ لەبارەی دکتۆر گرێیف[٨١] چی دەڵێی؟ پێموانەبێ دوای ئەم کۆبوونەوەی کە لەگەڵ تۆ هەیبوو، توانای رزگار کردنی گیانی هەبووبێت.

- ئەمانە رووداو بوون.

[81]- Dr. Grief

- واپێدەچێ لە چەند مانگی رابووردوا زۆر رووداوی مەترسیدارت تاقی کردبێتەوە.

خاتوو رۆدمەن نەختێك بێدەنگ بوو. کاتێك دووبارە وەقسە هاتەوە، دەنگی هێورتر ببوو. ئێستا وەکوو مامۆستایەك بوو کە لەگەڵ قووتابییەکی باشی خۆی قسەی دەکرد.

- ئەمجۆرەی کە دەبینم، ئێستاش لەم رووداوە دڵگرانی کە بەسەر دکتۆر لیبەرمەن هات. لێگەڕێ با دڵنیات بکەمەوە کە ئەو هیچکات مرۆڤێکی باش نەبوو و کەسیش لە مردنی دڵگران نابێ. تەنانەت ئەگەر ژنەکەی کارتی سوپاس و پێزانینمان بۆ بنێرێت، بەلامەوە سەیر نابێ.

ئێستا خاتوو رۆدمەن پێکەنینێکی هاتێ. وەکوو ئەوە دەچوو کە نوکتەیەکی بۆ کەسێك گێڕابێتەوە.

- ئەو خۆی هەڵیبژارد. ئەگەر ئەو درۆی لەگەڵ کۆمپانیاکەی نەکردبا و کڵاوی لەسەر ئەوان دانەنابا بۆئەوەی لەگەڵ ئێمە کار بکات، ئێستا زیندوو بوو. هەموویشی خەتای ئێمە نەبوو.

- هەڵبەت کە خەتای ئێوە بوو، ئێوە کووشتتان.

- بەڵێ، راستە. بەڵام ئێمە رێکخراوێکی بازرگانیی گەورەین. رەنگە جاریوایە ئەمە رووبدات کە کەسانی سەر رێگەی خۆمان هەڵگرین و بە مردن کۆتایی بە کارەکەیان بێت. بەداخم، بەڵام ئێمە لە بارودۆخێکی ئەوتۆ داین.

خزمەتکارێکی رێستۆرانت هات و قاپە بەتاڵەکانی لەگەڵ خۆی برد. ئەلێکس ئاوە پرتەقاڵەکەی خواردەوە و ئومێدەوار بوو ساردی سەهۆڵەکە هزر و هۆشی روون بکاتەوە.

- بەم حاڵەوە ناتوانم کارتان لەگەڵ بکەم.

- بۆچی ناتوانی؟

- چونکە دەبێ بۆ قووتابخانە بچم.

ئێستا خاتوو رۆدمەن نەختێك خۆی لە ئەلێکس نزیکتر کردەوە.

– ئێمە قووتابخانەیەکمان هەیە. دەمهەوێ تۆ بۆ ئەم قووتابخانەیە بنێرم. ئێمە لە قووتابخانەکەماندا بابەتی گرنگتر لە بیرکاری و زمانی ئینگلیزی دەڵێینەوە. (مەبەست لە قووتابخانە فێرگەیە)

– بۆ نموونە چ وانەیەك؟

– ئەوەیکە چۆن مرۆڤ بکووژی. تۆ دەڵێی هیچکات ناتوانی مرۆڤ بکووژی، بەڵام چۆن دەتوانی تا ئەوڕادەیە متمانەت بەخۆت هەبێ. ئەگەر بۆ مالاگوستۆ[٨٢] بچی، خۆت بەم ئەنجامە دەگەی. نیل لە ئەستێرەکانی ئەم قووتابخانەیە بوو. ئەو مرۆڤکووژێکی تەواوعەیارە و یا دەبێتە مرۆڤکووژێکی تەواوعەیار. بەداخەوە، ئەو خاڵێکی لاوازی هەیە.

– مەبەستی ئێوە نەخۆشییەکەیەتی؟

– نا، خاڵە لاوازەکەی لەوە ناخۆشترە.

خاتوو رۆدمەن نەختێك وەستا.

– تۆ دەتوانی لە ئەو باشتر بی. نەختێك کاتی دەوێت. رەنگە قسەی من بەلاتەوە خۆش نەبێ، بەڵام باوکت مامۆستای ئەم قووتابخانەیە بوو. پیاوێکی بەتوانا بوو. کاتێك مرد، هەموومان پەرشوبڵاو بووین.

دیسانیش باسی باوکی کرا.

– لەبارەی باوکمدا بدوێ. من سەبارەت بەم مەسەلەیە هاتوومەتە ئێرە. چۆن بوو کە کاری لەگەڵ ئێوە بە کۆتایی گەیشت؟ چۆن مرد؟ تەنانەت نازانم دەنگی چۆن بوو. هیچ شتێك لەبارەی باوکمدا نازانم.

– ئایا زۆر حەز دەکەی بزانی؟ رەنگە زۆر دڵگران بی!

ئەلێکس بێدەنگ بوو.

ئێستا خزمەتکاری رێستۆران بە خۆراکی سەرەکی هاتە سەر مێزەکەیان. خاتوو رۆدمەن داوای کەبابی بەرخی کردبوو. خزمەتکارەکەی دیکە پەرداخی ئاوەپرتەقاڵەکەی پڕ کرد.

کاتێك خزمەتکار رۆیشت، خاتوو رۆدمەن وتی:

---

[82] - Malagosto

– زۆر باشــە، بــەڵام دەبــێ ســەرەتا خواردنەکــەمان تــەواو بکــەین. تــۆ دەتوانی لەبارەی بروکلەند لەگەڵ من قسە بکەی. حەز دەکەم بزانم حەزت لە چ مۆسیقایەکە و هاندەری کام یانەی تۆپی پێی. باشە، خواردنەکەت بخۆ. بەڵێنی ئەوەت پێدەدەم ئەمە باشترین کەبابی بەرخە کە تا ئێستا خواردووتە.

– کاتێــک خواردنەکــەمان خــوارد، تــۆ بــۆ نهــومی ســەرووتر دەبــەم تــا ئەوشتەی دەتهەوێ بیزانی بۆتی بگێڕمەوە.

## ئالبێرت بریج[٨٣]

خاتوو رۆدمەن ئەلێکسی بۆ ژوورێك لە نهومی سەرووتر رێنوێنی کرد. ژوورەکەی هیچ تەختێکی تێدا نەبوو. دوو کورسی، میزێك، دەزگایەکی بڵاوکردنەوەی ڤیدیۆ و چەند دۆسیە و ئەشیا، گشت ئەشیاکانی ژوورەکەی پێکدەهێنا.

– کاتێك زانیم کە تۆ لێرەی، هەموو ئەم ئەشیایانەم لە ڤێنیزەود بۆ ئێرە هێنا. بیرم لەوە کردەوە کە شتێکن بۆ ئەوەی بیانبینی.

ئەلێکس سەری بە نیشانەی بەڵێ داخست.

دوای خواردنی نانی شەو لە رێستۆرانتی ئایدیال، ئێستا لە ژورێکی گەورە، بە میچی بەرز، هەستی دەکرد کە لەسەر شانۆیە. بەتاڵ بوونی ژوورەکە وایدەکرد دەنگ بداتەوە. ئەلێکس بۆلای مێز چوو. تووڕە و بێ قەرار بوو. لەکاتی خواردنی نانی شەو چەند پرسیارێکی کردبوو و ئێستا بڕیارە وەڵامەکانی وەربگرێتەوە. ئایا ئەوەی گوێی لێدەبوو، پێی خۆش بوو؟

– خاتوو رۆدمەن لە تەنیشت ئەو وەستا. پاژنەی بەرزی پێڵاوەکەی لەسەر تەختایی مەرمەڕی ژوورەکە دەنگی تایبەتی دەدایەوە. زۆر بە ئارامی و ئاسایی لە تەنیشت مێزەکە وەستا و داوای لە ئەلێکس کرد دابنیشێت.

– دانیشە.

---

[83] - Albert Bridge

ئەلێکس کۆتەکەی دەرهێنا و هاویشتییە سەر کوورسییەك و دانیشت. خاتوو رۆدمەن لە تەنیشت مێزەکە دانیشت و سەیری ئەوی کرد. نەختێکی کێشا تا وەقسە بێت.

– ئەلێکس، ئەوەندەش درەنگ نەبووە. دەتوانی رات بگۆڕی.

– نا، نامهەوێ.

– ئەگەر لەبارەی باوکت قسە بکەم، رەنگە لە قسەکانم دڵگران بی و من حەز ناکەم تۆ دڵگران بی. ئایا رابردوو تا ئەو رادەیە گرنگە؟ یا هیچ جیاوازییەك پێکدێنێ؟

– بەڵێ، وابزانم ئەم کارە بکات.

– زۆر باشە؟

خاتوو رۆدمەن فایلێکی کردەوە و وێنەیەکی رەش و سپی لێدەرهێنا. وێنەی پیاوێکی جوان بە ئۆنیفۆرمی سەربازی نیشان دەدا. کڵاوێکی لەسەر بوو. راستەوخۆ سەیری کامێرای دەکرد. دەستەکانی بۆ ناوقەدی بردبوو. رووخسارێکی تراشراوی هەبوو و چاوەکانی زیرەك دەهاتنەبەرچاو.

– ئەمە باوکی تۆیە لە بیست و پێنجساڵیدا. ئەم وێنەیە پێنج ساڵ بەر لەدایك بوونت گیراوە. ئایا بەڕاستی هیچ زانیارییەکت لەبارەی باوکتەوە نییە.

– مامم نەختێك لەبارەی ئەودا زانیاری پێداوم. دەمزانی لەناو سوپادا خزمەتی دەکرد.

– رەنگە بتوانم لەمبارەوە زانیارییەکت پێبدەم. بێشك ئەوە دەزانی کە لە لەندەن لەدایك بووە و قۆناغی دواناوەندی بۆ وستمینستر(٨٤) چوو. دوایی رێگەی ئەکسفۆرد(٨٥)ی گرتەبەر و لە بەشی مافی سیاسی و ئابووری خوێندی. بەڵام هەمیشە حەزی دەکرد لەناو سوپادا خزمەت بکات و ئەم

[84] Westminster-

[85] - Oxford

کارەشی کرد. ئەو چووە ناو هێزی پەڕەشووت کە بۆ ئەو سەرکەوتنێکی گەورە بوو. کەس ناتوانێ بە ئاسایی بچێتە ناو ئەم گروپە. ئەو سێ ساڵ لەم هێزەدا مایەوە و لە چەند چالاکی جۆراوجۆردا بەشداری کرد کەبۆنموونە دەتوانم ئاماژە بە رووداوی دوورگەکانی فالکلەندا(٨٦) لەساڵی ١٩٨٢ بکەم.

ئەو لەژێر ئاگری دوژمندا توانی سەربازێکی بریندار لەناو گۆڕەپانی شەڕ رزگار بکات و بەهۆی ئەم بوێرییە مەدالیای ئازایەتی پێدرا. هەروەها بە پلەی ئەفسەری گەیشت.

ئەلێکس لە رابردوودا ئەم مەدالیایەی بینیبوو. ئیان رایدەر هەمیشە ئەم مەدالیایەی لەناو کەشەوی مێزەکەی هەڵدەگرت.

– دوایی بۆ ئینگلتەرا گەڕایەوە و ژیانی هاوسەری پێکهێنا. ئەو دایکتی لە ئەکسفۆرد بینیبوو. دایکت پزیشکی دەخوێند و لە کۆتاییشدا بوو بە نێرس. بەڵام لەبارەی ئەودا زانیارییەکی ئەوتۆم نییە. ئێمە هیچکات یەکترمان نەبینی و باوکیشت زۆر بە کەمی لەبارەی ئەودا قسەی دەکرد.

بەهەرحاڵ، هێشتا ماوەیەکی زۆر لە ژیانی هاوسەریان نەگوزەرابوو کە کێشەگەلێك زۆری هاتەپێش. هەڵبەت من دایکت سەرزەنشت ناکەم، بەڵام چەند هەفتە دوای پێکهێنانی ژیانی هاوسەریان باوکت لە رێستۆرانتێکی لەندەن گوێی لێبوو کە کەسانێك شەڕی فالکلەند بە فشە وەردەگرن. باوکت بە بیستنی قسەکانیان لەگەڵیان تووشی شەڕ دەبێ.

لەم شەڕەدا یەکێکیان بەدەستی باوکت دەکووژرێ. لێدانی دەستی باوکت بە ئەوکی یەکێکیان دەکەوێ و دەیکووژێت.

لێرەدا خاتوو رۆدمەن رۆژنامەیەکی لەنێوان فایلەکە دەرهێنا، کە مانشێتەکەی ئەوە بوو:

---

٨٦ - Falkland

*"زیندانی بۆ سەربازێکی قارەمان کە ڕێگەکەی ون کرد"*

وێنەیەکی دیکە لە جۆن رایدەر بوو کە ئێستا لەناو جلکی غەیری سەربازی دابوو. وێنەگرێکی زۆر دەورەیان دابوو. ڕووخساری باوکی نیشانی دەدا کە چەندە ناڕەحەتە و سەبارەت بە ڕووداوێك ئازار دەبینێ.

ئەلێکس بابەتەکەی خوێندەوە.

جۆن رایدەر کە فەرماندەکەی ئەو بە سەربازێکی بێ کەموکوڕی و بوێر دەزانێ، نۆ مانگ دوای کوشتنی ئێد ساڤیت[87]، کە لە شەڕێکی شەوانە لە ڕێستۆران گوژرا، بە چواردە ساڵ زیندانی سزا درا. رایدەر بە لێدانێك ئێد ساڤیتی کووشت کە شوفێر بوو. وادیارە رایدەر ئاشنا بە زۆر لە هونەرەکانی وەرزشی ڕەزمییە.

دادوەر گیلیان پێدگام[88] وتی:

– ئەفسەر رایدەر سەبارەت بە شێتایەتێکی لەناکاو پیشەی خۆی لەناو سوپا لەدەست دا. من لە ڕاگەیاندنی سزای رایدەر گشت سەرکەوتنەکانیم وبەرچاو گرتووە، بەڵام بەهەرحاڵ ئەو تووشی پیاوکووژی بووە و کۆمەڵگا چاوەڕوانی ئەوەیە کە ئەویش تاوانەکەی بداتەوە.

خاتوو بە دەنگێکی ئارام وتی:

– زۆر بەداخم. تۆ ئەمەت نەدەزانی.

ئەلێکس وتی:

– مامم جارێك مەدالیاکەی پێ نیشان دابووم.

بوغزێکی پڕ لە دڵگرانی ئەوکی گرتبوو.

– بەڵام هیچکات ئەمەی نیشانی من نەدابوو.

– خەتا لە باوکت نەبوو. ئەو ناخوازراو تووشی ئەم کێشەیە ببوو.

– دوایی چی ڕووی دا؟

---

[87] - Ed Savitt

[88] - Gillian Padgham

- ئەو کەوتە زیندان. زۆرکەس بە قازانجی ئەو کردیانە هەراوهوریا، بەلاّم بەهەرحاڵ راستییەکە ئەوەیە کە ئەو کەسێکی کووشتبوو. دادوەر چارەیەکی نەبوو.

- دوایی چی روویدا؟

- دوای ساڵێك ئەو لە زیندان بەردرا. ئەمکارە بەبێ دەنگی رووی دا. دایکت لە پەنای وەستابوو، ئەو هیچ کات بڕوا و متمانەی بەنسبەت باوکت لەدەست نەدا و بە ژیانکردن لەگەڵ ئەو بەردەوام بوو. بەداخەوە، باوکت ئیتر نەیتوانی لە مانەوە لە سوپادا بەردەوام بێت.

ئەلێکس بە دەنگێکی سارد وتی:

- بەردەوام بە.

- دۆزینەوەی کار بۆ ئەو سەخت و دژوار بوو. خەتای ئەو نەبوو، بەلاّم چارەیەکی دیکەی نەبوو. لەمکاتەدا ئەو کەوتە بەرچاوی پیاوانی ئێمە.

خاتوو رۆدمەن نەختێك وەستا و بەردەوام بوو:

- دووپشك هەمیشە بەدوای بەتواناکاندا دەگەڕێت. ئێمە دەمانزانی بەخراپی لەگەڵ باوکت رووبەڕوو بوونەتەوە. بیرمان لەوە کردەوە کە ئەو دەتوانێ بۆ ناو گروپی ئێمە ئایدیال بێت.

- ئێوە پەیوەندیتان لەگەڵ گرت؟

- بەڵێ. باوك و دایکت لەمکاتەدا پارەیەکی کەمیان هەبوو. زۆر بێ هیوا بوون. یەکێ لە پیاوەکانی ئێمە باوکتی بینی و دوای دوو هەفتە بۆ هەڵسەنگاندن سەردانی کردین.

خاتوو رۆدمەن بزەیەکی هاتێ.

- ئێمە ئەندامانی تازەمان تاقی دەکەینەوە، ئەلێکس. ئەگەر بڕیار بدەی هاوکاریمان لەگەڵ بکەی، کە هیوادارم ئەمە رووبدات، تۆ بۆ ئەم شوێنە دەبەین کە باوکتمان بۆ ئەوێ برد.

- ئەوێ کوێیە؟

- ناوەکەییم پێ وتی. مالاگوستو. لە ڤێنیز نزیکە.

خاتوو رۆدمەن نەیدەویست رێکتر لەوە قسە بکات. لە بەردەوامی قسەکانیدا وتی:

- باوکت نیشانی دا کە پیاوێکی زۆر قورس و ئازایە و توانایی بەرچاوی هەیە. لە هەر تاقی کردنەوەیەکدا بە لێهاتوویی سەرکەوتنی بەدەستهێنا. ئێمە دەمانزانی کە ئەو برایەکی بەناوی ئەیان رایدەر هەیە کە بۆ (ئێم ئای٦) کار دەکات. هەمیشە بەلامەوە سەیر بووە کە بۆچی کاتێك باوکت کێشەی بۆهاتەپێش، ئەیان یارمەتی نەدا. بەڵام وابزانم کە ئەو هیچ کارێکی لەدەست نەهاتبوو. بەهەرحاڵ، هیچ جیاوازییەکی نەبوو. ئەم دووە برای یەکتر بوون. باوکت لەڕاستیدا بۆ ئێمە ئایدیال بوو و دوای ئەو رووداوەی کە بۆی هاتەپێش، ئێمەش بۆ ئەو زۆر باش بووین.

ئەلێکس کەم کەم ماندوو دەبوو. نزیك بە کاتژمێر ١١ بوو، بەڵام ئەمەشی دەزانی تا هەموو شت لەبارەی باوکی نەزانی، ئەوا لەم ژوورە ناچێتە دەرەوە.

ئەلێکس وتی:

- بەم پێیەوە هاتە ناو گرووپی دوویشك.

- بەڵێ، باوکت وەکوو پیاوکووژێك بۆئێمە کاری دەکرد. ئەو چواردە مانگ دەورەی بینی.

- چەند کەسی کووشت.

- پێنج یا شەش کەس. ئەو زیاتر حەزی دەکرد لە قووتابخانەی ئێمە وەکوو مامۆستایەك خەڵکی پەروەردە بکات. رەنگە بەلاتەوە سەیر بێت کە بزانی یاسین گرگورروویچ لەو پیاوکوژانە بوو کە لای باوکت دەورەی بینیبوو. جارێك کاتێك لە دارستانی ئامازۆن[٨٩] بوون، باوکت یاسینی لە مردن رزگار کربوو.

ئەلێکس دەیزانی خاتوو رۆدمەن راست دەکات. یاسین بەر لە مردنی تا ئێرەی بۆ گێڕابۆوە.

[89] -Amazon

- من باوکتم زۆر باش دەناسی. ئێمە زۆرجار بەیەکەوە خواردنی شەومان خواردبوو. تەنانەت جارێك لەم هوتێلە خواردنمان بەیەکەوە خوارد. ئەو بۆمن زۆر باش بوو. پیاوێکی جوان و شیرین و رێك بوو. هەروەها بەهۆش بوو و هەندێ جار منی وەپێکەنین دەخست. زۆر بەداخ بووم کە لەگەڵ دایکت ژیانی هاوسەری پێکهێنابوو.

- ئایا دایکم دەیزانی ئەو چی دەکات. ئایا زانیاری لەتۆ هەبوو؟

- هیوادارم هیچ زانیارییەکی لەمن نەبووبێ.

خاتوو بە دەنگێکی جددیانە وتی:

- ئێستا کاتی ئەوە هاتووە پێت بڵێم کە باوکت چۆن مرد. بریا داوات لێنەکردبام کە باسی ئەمەت بۆبکەم. ئایا زۆر حەز دەکەی بزانی ئەو چۆن مردووە؟

- بەڵێ.

- زۆر باشە.

ئێستا خاتوو رۆدمەن هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی.

- (ئێم ئای٦) ئەوی دەویست. ئەو لە باشترین پیاوەکانی ئێمە بوو و خەڵکی دیکەی پەروەردە دەکرد تا بەڕادەی خۆی لێهاتوییان هەبێت. لەم رووەوە، بڕیاریان دا کە بیکووژن. نامەوێ بچمە ناو وردەکارییەکانەوە، بەلام لە ماڵتا[90] بۆسەیان بۆ دانایەوە. "یاسین گرگورەوویچ"یش لەوێ بوو. ئەو رایکرد، بەلام باوکت دەستبەسەر کرا. وامانزانی ئیتر کاری تەواوە و ئێمە ئیتر ئەو نابینین. رەنگە وابیر بکەیەوە کە سزای لەسێدارەدان لە ئینگلتەرا هەڵگیراوە، کەچی رووداوی بە پلان هەڵنەگیراوە. بەلام لەم کاتەدا شتێك روویدا.

- دوویشك کوورێکی هەژدەساڵەی یەکێك لە هاوولاتیانی بەناوبانگی ئینگلتەرای دزی. ئەم پیاوە لە ناو حکوومەتی ئینگلتەرا دەستی هەبوو و یا ئێمە وامان بیردەکردەوە. جارێکی دیکە چیرۆکێکی تێکەڵاوە و

[90] - Malta

درنگیشه. هەر بۆیەش ناچمە ناو وردەکارییەکانەوە. بەڵام ئیتر پێمان وت ئەگەر باوکی کوورەکە بە قسەی ئێمە نکات، ئەوا کوورەکەی نابینێتەوە و دەیکوژین.
ئەلێکس پرسی:
- کاری ئێوە هەر ئەمەیە، مەگەر نا؟
- پێکهێنانی گەندەڵی و مرۆڤکووژی، ئەلێکس. ئەمە بەشێك لە کارێکە کە ئێمە دەیکەین. بەڵام ئێمە زۆر بە زوویی زانیمان باوکی ئەو کوورەی کە ئێمە دزیبوومان، ناتوانێ ویستی ئێمە بەجێ بگەیەنێ. بەداخەوە مانای ئەوە بوو کە دەبوایە کوورەکەی بکووژین. ناتوانی هەڕەشە بکەی و دوایی کارکە نەکەی.
چونکە ئەگەر ئەمکارە بکەی، ئیتر کەس حسێبت بۆ ناکات و لێت ناترسێ. کەواتە بڕیارمان دا بە قیزەونترین و وەحشیانترین شێوە بیکووژین. بەڵام لەهەمان کاتدا (ئێم ئای٦) پەیوەندی پێوە گرتین و پێشنیارێکی پێداین.
- ئەوان جۆن رایدەریان پێدەداین و ئێمەش کوورەکەمان ئازاد دەکرد.
هەیئەتی بەڕێوەبەری دووپشك، کۆبوونەوەیەکیان پێکهێنا. ئێمە بە دەنگێکی کەم بەم ئەنجامە گەیشتین ئەم پێشنیارە قبووڵ بکەین. ئێمە ئەمجۆرە معامەلانە قبووڵ ناکەین، بەڵام باوکت بەڕادەیەك بایەخی بۆ ئێمە هەبوو کە ئامادە بووین بەقسەیان بکەین. بڕیار بوو کاتژمێر شەشی سەر لەبەیانی گۆڕینەوەکە بکرێ. مانگی مارس بوو. پیلانی گۆڕینەوە دەبوایە لەسەر ئالبێرت بریج بەڕێوە بچێت.
- مانگی مارس؟ چ ساڵێك بوو؟
- چواردە ساڵ پێش، ئەلێکس: ١٣ی مارس. تۆ ئەوکات درو مانگە بووی.
خاتوو رۆدمەن خۆی هاویشتبووە سەر مێزەکە و دەستی لەسەر تەلەڤزیۆن دانا.
ئەو وتی:

– دووپشك هەمیشە گشت چالاكییەكانی تۆمار دەكات. هۆیەكی باشمان بۆ ئەم كارە هەیە. ئێمە رێكخراوێكی تاوانكاریین. هەربۆیەش هیچكەس بڕوامان پێناكات، تەنیا ئەوانەی پەیوەندیشمان پێوە دەگرن ئەمكارە ناكەن. وابیر دەكەنەوە كە ئێمە درۆ دەكەین، دەغەڵكاری دەكەین و یا زۆرشتی ئەمجۆرە. ئێمە لە گشت بەرنامەكانی خۆمان فیلم هەڵدەگرێینەوە بۆ ئەوەی بسەلمێنین راستگۆین. لەم روویەوە، لە پیلانی گۆڕینەوە لەسەر ئالبێرت بریجیش فیلمما ن هەڵگرتەوە. ئەگەر كووڕی ئەو پیاوە ناوداره شتێكی لێهاتبایە، ئەوا دەمانتوانی ئەوە بسەلمێنین كە خەتا لە ئێمەوە نەبوو.

خاتوو رۆدمەن تەلەڤزیۆنەكەی پێكرد. وێنەیەكی نمایش دەكرد كە لە زەمەنێكی دیكە گیرابوو. كاتێك ئەلێكس تەمەنی تەنیا هەشت هەفتە بوو. سەرەتا فیلمی پردەكەی ئالبێرت بریج هاتە سەر شاشە. دیار بوو كە هەوا زۆر سارد بوو.

خاتوو رۆدمەن وتی:

– ئێمە سێ كامێرامان هەبوو. دەبوایە زۆر بەرێكی دایانبنێین. بۆئەوەی (ئێم ئای٦) پێیان نەزانێ. بەڵام ئەمجۆرەی كە دەبینی، ئەم كامێرایانە هەموو شت نیشان دەدەن.

لە فیلمی یەكەمدا، سێ پیاو بە كوت و پانتۆڵ و پاڵتۆ دەبینران. لە تەنیشت ئەوان پیاوێكی لاوی لێبوو كە دەستەكانی بەسترابوون. ئەمە دەبێ كووڕەكە بێ. واپێدەچوو كەمتر لە هەژدەساڵ تەمەنی هەیە. لە سەرمان دەلەرزی.

– تۆ وا سەیری بەشی باكووری پردەكە دەكەی. ئێمە ئەمجۆرە پێكهاتبووین. نوێنەری ئێمە دەبوایە كووڕەكە لە لای پاركەوە بێنێ. (ئێم ئای٦) و باوكت لەملای پرد بوون. دوولایەن دەبوایە لەسەر پردەكە بگەیشتبانە یەكتر و لەوێ گۆڕینەوە رووی دابا. یانی ئاوا بە ئاسایی.

– قەرەباڵغییەك لەئارادا نییە.

- کاتژمێر شەشی بەیانی؟ هەڵبەت ئەگەری قەرەباڵغییەکی کەم هەبوو. بەڵام پێموابێ (ئێم ئای٦) ڕێگەی بەستبوو.
- ئێستا فیلمەکە گۆڕا. ئەلێکس هەستی بە دڵگرانییەکی زۆر کرد. کامێرا ئێستا باوکی نیشان دەدا. ئەمە یەکەم وێنەی باوکی بوو کە بەشێوەی فیلم دەیبینی. کۆتێکی ئەستووری لەبەر بوو. سەیری دەورووبەری خۆی دەکرد. ئاگای لە هەموو شتێك بوو. ئەلێکس حەزی دەکرد کامێرا لە نزیکەوە باوکی نیشان بدات. بۆئەوەی ڕووخساری باوکی جوانتر و باشتر ببینێ.
خاتوو ڕۆدمەن بەردەوام بوو:
- ئەمە شێوەیەکی کلاسیك لە گۆڕینەوە دایە. پرد شوێنێکی بێ لایەنە. دوولایەن - لەم بارودۆخەدا بەتایبەت ئەم کوورە لاوە و باوکت - ئازاد دادەنرێن. نابێ هیچ کێشەیەك بێتە ئاراوە.
خاتوو وێنەکەی ڕاگرت.
- ئەلێکس باوکت لەسەر ئالبێرت بریج کووژرا. دەزانم هیچکات ئەوت نەبینیبوو. کاتێك ئەمە ڕووی دا، تۆ مەلۆتەکەیەکی شیرەخۆرە بووی. بەم حاڵەوە، بەباشی نازانم ئەم ڕووداوە ببینی.
- نا، بێشك دەمهەوێ بیبینم.
خاتوو ڕۆدمەن سەرێکی جووڵاند و فیلمەکە لە نیشاندانی ڕرووداوەکە بەردەوام بوو.
فیلمەکە کە ئێستا لەلایەن کامێرا شاراوەکان گیرابوو، ئەوەندە بەجوانی ڕووداوەکەی نەگرتبوو. سێ پیاو لەگەڵ کووڕی فەرمانبەری ناوداری حکوومەییەوە لە لایەکی پردەکە بوون و باوکیشی لە لایەکەی دیکە. ئەلێکس دەیتوانی ئەم سێ کەسە ببینێ کە لەپشت باوکی وەستابوون، ئەوان پیاوی (ئێم ئای٦) بوون. فیلمەکە زۆر خراپ بوو.
تازە ڕووناکایی بەیانی وڵاتی داگرتبوو. ڕووناکی زۆر کەم بوو. ئاوی ڕووبارەکەش بێ ڕەنگ بوو. وادیار بوو ئیشارەیەك کرابوو، چوونکە پیاوە

لاوەکە بەرەوپێش بەڕێکەوت. لەم کاتەدا، جۆن رایدەریش لە گرووپەکەی خۆی جیا بۆوە. دەستەکانی ئەویش لە پێشەوە بەسترابوون.
ئەلێکس حەزی دەکرد شاشەی تەلەڤزیۆنەکە لەمس بکات و دەستی پێدابێنێت. ئەو باوکی دەدیت کە بۆ لای پیاوەوکانی دووپشك بەڕێکەوت. بەڵام وێنەکە، بەرزاییەکی نزیك بە یەك سانتی مەتری هەبوو. ئەلێکس دەیزانی ئەمە وێنەی باوکێتی. رووخساری وەکوو ئەم وێنانە بوو کە بینیبووی، بەڵام مەودای باوکی ئەو لەگەڵ ئەو گەلێ زۆر بوو. دیار نەبوو کە جۆن رایدەر تووڕەیە یا بزەیەکی لەسەر رووخسارە. ئایا ئەگەری ئەوەی هەبوو کە بزانێ چ شتێك دەیهەوێ روو بدات؟
جۆن رایدەر و کووڕەکە لەناوەڕاستی پردەکە گەیشتنە یەکتر. نەختێك وەستان و واپێدەچوو چەند وشەیەك لەگەڵ یەکتر دوابن. بەڵام تەنیا دەنگی باران و جاروبارە دەنگی ئۆتۆمبێلێك دەبیسرا کە دیار نەبوو. جارێکی دیکە ئەم دووە بەڕێکەوتن. کووڕە لاوەکە لای باشووری پردەکە بوو، لایەك کە (ئێم ئای٦) کۆنترۆڵی دەکرد. جۆن رایدەر بۆ لای باشوور دەچوو. ئێستا خێرایی هەنگاوەکانی زیاتر کرد. دەچوو تا خۆی بگەیەنێتە ئەو پیاوانەی چاوەڕوانیان دەکرد.
خاتوو رۆدمەن بەدەنگێکی نەرم وتی:
- ئاگات لێی بێت کە ئێرەیە رووداوەکە لێی روویدا.
باوکی ئەلێکس لەحاڵی راکردندا بوو. وادیار بوو هەستی بەوە کردبوو کە کێشەیەك لەئارادایە. بەشێوەیەکی سەیر رایدەکرد. دەستەکانی هێشتا لە پێش جەستەی بەسترابوونەوە. لە لای باکووری پرد، پیاوێکی (ئێم ئای٦) بێسیمێکی هەڵگرت و قسەیەکی کرد. دوای ماوەیەکی کوورت، دەنگی گوللە بەرز بۆوە. جۆن رایدەر چەند هەنگاوێکی نایەوە و کەوتە خوارێ.
- دەتهەوێ تەلەڤزیۆنەکە بکوژێنمەوە، ئەلێکس؟
- نا.

ئەلێکس بینی کە باوکی لەسەر تەنیشت کەوتەخوارێ. سێ پیاوەکەی دووپشك ئێستا سیلاحی خۆیان دەرهێنا و بۆلای کوورەکەی پیاوە ناودارەکە رایان کرد. ئەلێکس نەیدەزانی بۆچی ئەم کارە دەکەن. بەرهەرحاڵ، ئەم کوورە لاوە خۆ هیچ تاوانێکی نەبوو. دوایی رووداوەکە بۆی روونتر بۆوە. (ئێم ئای٦) بەڵێنییەکەی شکاندبوو و جۆن رایدەری کووشتبوو. لەم روویەوە دەبوایە کوورکەش بکووژرێت.
بەڵام ئەو خێرایی لەخۆی نیشان دا و دەیزانی بڕیارە چی روویدات. گوللەی پیاوەکانی گروپی دووپشکی پێ نەکەوت. دوایی لەناکاو دەنگێکی بڵند بەرز بۆوە. رشاشێك دەستی بە تەقەکردن کرد. چراکانی سەر پرد تێکشکان و ورد بوون. کوورە لاوەکە گەیشتە لایەکەی دیکەی پردەکە. ئۆتۆمبێلێك گەیشتێ. دەرگای کرایەوە و کوورەکە بۆناو ئۆتۆمبێلەکە کێشرا.
خاتوو رۆدمەن لێرە فیلمەکەی راگرت.
- واپێدەچوو (ئێم ئای٦) کوورەکەی دەویست، بەلام ئامادە نەبوو هیچ شتێکی لەپێناو بدات. یانی باوکت ئازاد بکات. هەر ئەمجۆرەی بینیت، ئەوان ئێمەیان فریو دا. خۆشت ئەمەت بینی.
ئەلێکس هیچ قسەی نەکرد. واپێدەچوو کە ژوورەکە تاریکتر بووە. هەستی دەکرد لەسەری تا نووکی پێی سەهۆڵی بەستووە.
خاتوو رۆدمەن بەردەوام بوو.
- تەنیا بەشێکی دیکە لە فیلمەکە ماوە. لە وتنی بێزارم. بەڵام تۆ کە تا ئێرەی فیلمەکەت بینیوە، خراپ نییە دواییەکەشی ببینی.
دوایین بەشی فیلمەکە، دوایین کاتەکانی ژیانی جۆن رایدەری بە نمایش دەردەهێنا. ئەو جارێکی دیکە هاتبووە سەر پێیەکانی و لە کاتێکدا کوورە لاوەکە بۆ لایەکەی دیکە رای دەکرد، ئەویش دەستی بە راکردن کرد.
خاتوو رۆدمەن وتی:
- سەیری ئەم پۆلیسە نهێنییەی (ئێم ئای٦) بکە کە ئەمری تەقەکردن دەدات.

ئەلێكس سەیری ئەو كەسانەی كرد كە لەسەر پردەكە بوون.
خاتوو رۆدمەن وتی:
- هەوڵمان دا فیلمەكە بە گەورەتر نیشان بدەین.
ئێستا كۆمپیوتەر لە نزیكترەوە نیشان دەدات. ئەلێكس ئەمەی بینی پۆلیسی نهێنی (ئێم ئای٦) كە بێسیمێكی بەدەستەوە بوو، ژنێكە كە بارانییەكی رەنگ رەشی لەبەر بوو.
- دەتوانین دیسانیش نزیكتری بكەینەوە.
كامێرا دیسانیش فیلمەكەی نزیكتر و گەورەتر كرد.
- نزیكتر.
ئەم هەوڵە بۆ سێیەمین و چوارەمین جار دووبارە بۆوە. ژنەكە بێسیمەكەی بەدەستەوە گرتبوو، بەلام ئێستا رووخساری شاشەكەی پڕ كردبوو.
ئەلێكس بە دیتنی جووڵەی لێوەكانی ژنەكە هەستی بەوەكرد كە دەڵێت:
- تەقەی لێبكەن.
خاتوو رۆدمەن وتی:
ئەوان چەند تاك تیرهاوێژیان لە لایەكی پردەكە دانابوو. بەلام تۆ ئەم ژنە دەناسی.
ئەلێكس ئەم ژنەی دەناسی. چواردە ساڵ لە ئێستای لاوتر بوو، بەلام گۆڕانكارییەكی زۆری بەسەردا نەهاتبوو.
ئەو خاتوو جۆنز، جێگری چالاكییەكانی تایبەتی (ئێم ئای٦)، بوو.
خاتوو جۆنز لە تەواوی ماوەی هاوكاری ئەلێكس لەگەڵ (ئێمە ئای٦)، وای دەنواند كە هاوڕێیەتی. دوای گەڕانەوە بۆ لەندەن و لە باروئۆخێكدا كە بە توندی لە رووداوی دامیان كاری ماندوو ببوو، هەوڵی دابوو یارمەتی بدات. وتبووی كە نیگەرانی ئەوە و لە تەواوی ئەم ماوەیەدا درۆی لەگەڵ كردبوو. لەلای دانیشتووە و قسەی لەگەڵ كردبوو. دەیزانی كە چەند هەفتە دوای لەدایك بوونی، باوكی لێ كووشتووە.
خاتوو رۆدمەن تەلەڤزیۆنەكەی كووژاندەوە.
بێدەنگییەكی زۆر ژوورەكەی داگرت.

ئەلێکس بە دەنگێکی گیراو و نووساو وتی:

- پێیان وتبووم کە باوکم لە ڕووداوێکی نا فڕۆکەدا گیانی لەدەست داوە.
- بەڵێ ئەوان نەیاندەویست تۆ ئاگاداری ڕووداوەکە بی.
- چی بەسەر دایکم هات؟

لەناکاو هەستێکی پڕ لە ئومێدی پەیدار کرد. ئەگەر لەبارەی باوکی درۆیان لەگەڵ کردووە، ئەگەری ئەوە هەیە دایکی ئێستاش زیندوو بێ.

- بەداخەوە، ئەلێکس. کەوتنەخواری فڕۆکە لەئارادا نەبوو. ئەم ڕووداوە چەند مانگ دواتر ڕووی دا. دایکت بە فڕۆکەیەکی تایبەتی بۆ فەڕەنسا دەچوو. بەداخەوە، ئەلێکس. هەموویان درۆیان لەگەڵ کردووی. ئەگەر دەتهەوێ بۆ ئینگلتەرا بگەڕێیتەوە و بۆ قوتابخاتە بچی، حاڵ و بارودۆخت درک دەکەم. بێشك باش دەزانم کە دەتهەوێ هەموومان لەبیر بکەی. بەڵام ئەگەر ئەم قسەیەی من نەختێك خەمەکانت کەم دەکاتەوە، ئەوە باش بزانە کە هەمیشە باوکتم ستایش کردووە. ئێستاش بۆی دڵگرانم. ئەو پێش ئەوەی لە ماڵتا لە تەڵە بکەوێ، ئەمەی بۆ ناردم.

ئێستا خاتوو ڕۆدمەن فایلێکی دیکەی کردەوە و کارت پۆستاڵێکی دەرهێنا. وێنەی کەناری دەریا و ئاوابوونی خۆری نیشان دەدا. ئاوا بەم شێوەیەی لێنووسرابوو.

*جولیای ئازیزم،*

*بێ تۆ بە سەختی و ناخۆشم بۆ دەگوزەرێ. بێ سەبرانە چاوەڕوانم کە لە کۆشکی بێوەژندا تۆ ببینم.*

*جۆن ئار.*

ئەلێکس دەست و خەتەکەی ناسییەوە. بێ دوودڵی ناسییەوە کە نووسراوە ئی باوکی بوو. بەڵام بە دەست و خەتی خۆیشی دەچوو.

خاتوو ڕۆدمەن وتی:

- باشە، درەنگە و دەبێ بخەوی. دەتوانین بەیانی دووبارە لەمبارەیەوە بەیەکەوە قسە بکەین.

ئەلێکس سەیری تەلەڤزیۆنی کرد. هەستی بەوە کرد  کە خاتوو جۆنز ماوەی چواردە ساڵە فریوی داوە. ماوەیەك بە بێدەنگی تێپەڕی و دوایی لە جێگەکەی هەستایە سەرپێ.

– دەمهەوێ بێمە ناو ڕێکخراوی دووپشك.

– ئایا، بە دڵنیاییەوە قسە دەکەی؟

– بەڵێ.

یاسین پێشتریش پێی وتبوو:

*بۆ ڤێنیز بچوو. دووپشك بدۆزەوە. ئەوکات چارەنووسی خۆت دەدۆزییەوە.*

ئەمەش ڕووداوێك بوو کە ڕووی دابوو. بڕیاری دابوو. ڕێگەی گەڕانەوەشی نەبوو.

## چۆنییەتی نووشتن

دوورگە چەند مایلێك لە ڤێنیز دوور بوو، بەڵام سەد ساڵێك دەبوو کە لەبیر کرابوو. ناوی مالاگوستو بوو و دەکرا ئەوە بڵێین بە هێمای مانگی نوێ دەچوو و درێژاییەکەی بە نیو مایل دەگەیشت. لەم دوورگەیەدا، شەش بینا دەبینــرا کــە لــە دەروبــەری هــەر بینایــەك لــە رووەکــی رەحشــی داپۆشــرابوو. گــەورەترینی ئــەم بینایــە دێرێــك بــوو کــە لــە تەنیشــت گۆڕستانێك دروست کرابوو. بوورجێکی دروست کراو لە خشتی سوور لە نزیکــی دەبینــرا. نەخۆشــخانەیەك و چــەند ئاپارتومــان بــە پەنجــەرەی پەردەکێشراوەوە دەبینران. چەند بەلەمێك لە نزیك مالاگوستو تێدەپەڕین، بــەڵام هیچــکامێکیان لــەوێ نەدەوەســتان. ئــەم کــارە قەدەغــە بــوو. ئــەوە ئەگەری ئاشکرابوونێکی خراپی هەبوو.

ســەردەمێك کۆمەڵگەیــەکی بچــووك لــەم دوورگەیــەدا دەژیــان. بــەڵام ئەمــە تایبەت بە سەدەکانی ناوین بوو. ئەم دوورگەیە لە ساڵی ١٣٨٠ لە شەڕ لەگەڵ جێنوا[٩١] وێران و تالان کرابوو و لەو کاتەوە بەدواوە نەخۆشەکانی تاعون بۆ ئەم شوێنە دەهێنران.

پروپاگەندەی ئەوە هەبوو کە وەختایەك هەر کەسێك لە ڤێنیز بپژمیبا، ئەوا بۆ مالاگوستویان دەنارد. کاتێك نەخۆشی تاعون لە سەدەی هەژدە بنبڕ کرا، لەم شوێنە وەکوو قەرەنتینە کەڵکیان وەردەگرت. دوای ئەوە، شوێنێك بۆ مانەوەی شێتەکان بوو و لە کۆتاییشدا دوورگەکەیان چۆڵ کردبوو. بەڵام ماسیگرەکان باسی ئەوەیان دەکرد کە لە شەوەکانی ساردی زستاندا گوێیان لە دەنگی بەرز و پێکەنینی شێتەکان بووە.

---

91 - Genoa

مالاگوستو شوێنێکی باش بۆ ناوەندی پەروەردە و هەڵسەنگاندنی دووپشک بوو. ئەوان لە ناوەڕاستی دەیەی هەشتا ئەم دوورگەیان لە حکوومەتی ئیتاڵیا کڕیبوو و لەم کاتەوە بۆدواوە ئەوێیان بەدەستەوە گرت. ئەگەر کەسێك پرسیاری کردبا کە چە کەڵکێك لەم دوورگەیە وەردەگرن، لە وەڵامدا دەیانوت ئێرە شوێنێکە کە بازرگانەکان، بانکدارەکان، یاسادانەرەکان و بەڕێوەبەرەکان بۆ پشوو و حەسانەوە رووی تێدەکەن، هەڵبەت ئەمە درۆ بوو. تەشکیلاتی دووپشك پیاوانی نوێی خۆیان بۆ پەروەردەکردن و مەشق و راهێنان بۆ مالاگوستو دەهێنا. لێرە فێری چۆنییەتی کووشتن دەبوون.

ئەلێکس رایدەر لە پێش بەلەمێکی مۆتۆڕی دانیشتبوو کە بەرەبەرە لە دوورگە نزیکتر دەبۆوە. ئەمە هەمان بەلەمە مۆتۆڕییەکە بوو کە ئەوی بەرەو کۆشکی بێوەژن رێنوێنی کردبوو. ئێستا وێنەی دووپشکی سیلڤەر لەژێر خۆر، لەسەر هەیکەل و بەدەنەی بەلەمەکە بریقەی دەدایەوە. نیل بەرامبەر بە ئەو دانیشتبوو. پانتۆڵێکی سپی و کۆتێکی بیلزری پۆشیبوو و زۆر ئارام و لەسەرەخۆ دەهاتەبەرچاو.

نیل سەبارەت بە دەنگی بەلەمەکە بە دەنگی بەرز هاواری کرد:

- من سێ مانگ لێرە مەشقم کردووە و دەورەم بینیوە. کاتەکەی بۆ ماوەیەکی زۆر درەنگتر لە باوکت دەگەڕێتەوە.

ئەلێکس بێ ئەوەی قسە بکات، سەری جوولاند. کەم کەم بوورجی سەر تەپۆڵکە لە پشت دارەکان بەدیار کەوت.

جولیا رۆدمەن پێش ئەوان و بەیانی زوو پوزیتانۆی جێهێشتبوو و بۆ ڤێنیز رۆیشتبوو. کارێك بوو کە بوونی لەوێدا پێویست بوو. ئەو و ئەلێکس دوای خواردنی نانی بەیانی یەکتریان بینیبوو و ئەمجارەیان زۆر جددیتر و بەشێوەی فەرمی لەگەڵ ئەلێکس رووبەڕوو ببۆوە. ئەو وتبووی کە ئەلێکس دەبێ چەند رۆژێك لە مالاگوستو بێت. بڕیار نەبوو لەم ماویەدا بخرێتە بەر تاقی کردنەوەی تەواو و کامڵ، بەڵام دەبوایە هەڵیسەنگێنن. بۆنموونە ئەم هەڵسەنگاندنە، پشکنینی پزیشکی، تاقی

کردنـــەوەی دەروونـــی و بەدەســـتهێنانی زانیـــاری لـــەبارەی ئامـــادەیی جەسـتەیی و تواناکـان و شایسـتییەکانی بـوو. هـەروەها، ئـەم هەلـەی بـە ئەلێکس دەدا کە لەبارەی بڕیارەکەی باشتر بیر بکاتەوە.
هـزر و هۆشـی ئـەلێکس کـاری نـەدەکرد. ئـەو بڕیـاری خـۆی دابـوو و تـا ئەوجێگەیەی پەیوەندی بە ئەو هەبوو، هیچ شتێك بۆ ئەو گرنگ نەبوو. لە شەوی پێشتر خاڵێکی گرنگی لەبیر نەکردبوو: تام هریس و براکەی. ئەوان لـە دوێنێـوە کـە ئـەو بـۆ کونسـانتۆ چـووبوو، هـیچ هـەواڵێکیان لێـی نـەبوو. بەڵام خـاتوو رۆدمـەن بـەڵێنی دابـوو کـە ئـەم مەسـەلەیە چارەسـەر دەکـات و ئاگاداریان دەکاتەوە. باسی مانەوەی هەموو ئەشیاکانی برای تـام کـرا کـە لەسـەر بیناکـە مـابۆوە کـە خـاتوو رۆدمـەن بـەڵێنی دا ئـەم مەسـەلەیەش بەشێوەیەکی باش چارەسەر بکات.
خاتوو رۆدمەن بە ئەلێکسی وتبوو کە پەیوەندیان پێوە بگرێت و هـەروەها پێویست بەوە ناکات لە نەبوونی ئەلێکس لە هەموو شوێنێ باسی بکەن و کێشەیەك پێکبێنن. دوایی باسی ئەوەشی کردبوو کە پارەی پەرەشووت و ئەشیاکانی دیکەی دەداتەوە و بە زیاتریش. خاتوو رۆدمەن وتبووی:
- پێنج هەزار یۆرۆ بەش دەکا؟
دوایی بەدەم ئەلێکسەوە پێکەنیبوو:
- هەر ئەمجۆرەی دەبینی ئەلێکس، ئێمە زۆرمان حەز لە تۆیە و خۆشمـان دەوێی و بەلامانەوە گرنگی.
دوای رۆیشتنی خاتوو رۆدمەن، ئەلێکس لە ژوورەکەی خۆی پەیوەندی بە تامـەوە گـرت. تـام لەوەیکـە گـوێی لـە دەنگـی ئـەلێکس بـوو، زۆر خۆشـحاڵ بوو.
ئەو وتبووی:
- خۆهەڵدانی تۆمان تەماشا کرد و زانیمان کە بە سەلامەتی گەیشـتویەتە خوارەوە. دوایـی هـیچ شـتێك رووی نـەدا و دوایـی دەنگێکـی مەترسـیداری تەقینەوەمان بیست. ئایا تۆ ئەم کارەت کرد؟
ئەلێکس وەڵامی دایەوە:

- نا، کاری من نەبوو.
- ئێستا لە کوێی؟
- من لە پوزیتانۆم. زۆر باشم، بەڵام تام گوێ بگرە کە چیت پێ دەڵێم.
- بەڵێ، ئەوە دەزانم کە ناتهەوێ لەگەڵ من بۆ قووتابخانە بگەڕێیتەوە.
- تا ماوەیەك.
- دیسانیش (ئێم ئای٦)؟
- ئەی، بەجۆرێك. رۆژێ دێت و باسی هەموو شتێکت بۆ دەکەم.

کە ئەمە هەڵبەت درۆ بوو. ئەلێکس دەیزانی کە ئیتر هاوڕێیەکەی نابینێتەوە.

- بە جێری بڵێ ئەم رۆژانە چەکەیەکی بەدەستی دەگات سەبارەت بەو ئەشیایانەی پێیدام. لە لایەن منەوە سوپاسی بکە.
- ئەی بروکلەند چی لێدێتەوە؟
- ئاساییترین شت ئەوەیە کە پێیان بڵێی منت نەبینیوە. بەرهەرحاڵ ئەوان دەزانن کە من لە ڤێنیز ون بوومە. هەر ئەوەندەش بزانن بەسییانە.
- ئەلێکس، زۆر بەسەیری قسە دەکەی. ئایا هیچ کێشەیەکت بۆ نەهاتووەتە پێش، ئایا بارودۆخت باشە؟
- بەڵێ. زۆر باشم، تام، ماڵئاوا.

ئەلێکس تەلەفۆنەکەی داخست و خەمێکی گەورە دڵی داگرت. تام دوایین بازنەی پەیوەندی ئەم دونیایە بوو کە دەیناسی.

بەلەمەکە وەستا. شوێنێك بۆ دابەزین هەبوو کە هاتن و چوونەدەر لەم شوێنە بۆ دووڕگە نەدەبینرا. نیل زۆر بە زیرەکی خۆی هاویشتە وشکایی. ئەلێکس وەبیر یاسین گرگورووپچ کەوتەوە کە ئەویش ئاوا زیرەك بوو.

- لەم لایەوە، ئەلێکس.

ئەلێکس بەدوای کەوت. دوو کەسی رێگەیەکیان بڕی کە لەژێر دارەکان تێدەپەڕی. بۆ ماوەیەك بیناکان نەدەبینران.

نیل لە کاتێکدا بزەیەکی لەسەر لێوان بوو، وتی:

- دەتوانم قسەیەکت پێ بڵێم. زۆر خۆشحاڵم لەوەیکە ویستت بێیتە ناو گرووپی ئێمە. زۆر باشە کە تۆمان لەناو براوەکاندا هەبێ.
- سوپاست دەکەم!
- بەڵام هیوادارم کە بڕیارت نەگۆڕی، ئەلێکس. هیوادارم بیر لە فریودانی ئێمە نەکەیتەوە. بەڵام متمانەم پێتە کە ئەم کارە ناکەی. ئێستاش سەبارەت بە رووداوەکەی ناو کۆشکی بێوەژن زۆر بەداخم. لەوەش زۆر دڵگران دەبم ئەگەر ناچار بە کووشتنت بم.
ئەلێکس ویستی بەجۆرێك قسەی ئەو قبووڵ بکات و وتی:
- بەڵێ، بیرەوەرییەکەی جاری پێشوو خۆش نەبوو.
- لەڕاستیدا دڵگرانم دەکات. خاتوو رۆدمەن متمانەیەکی زۆری پێتە و چاوڕوانیت لێدەکات. هیودارم ئابڕوی خۆت نەبەی.
ئێستا گەیشتبوونە دێرەکە. دیواری بەرز و بەرینی دێر بەهۆی ئاگاداری نەکردن، پەڵەپەڵە و بەرەو وێرانی دەچوو. دەرگایەکی گەورەی قورسی دروستکراو لە دار و دەرگایەکی بچووك لە ژێری دەبینرا. لەسەر دەرگاکە کامێرایەکی ڤیدیۆیی دانرابوو و بۆ کردنەوەی دەرگا پێویستی بە زانینی ژمارەی نهێنی هەبوو کە ئامێرەکەی بە دیوارەوە بوو. نیل ژمارەی نهێنی لێدا، دەنگێك بەرز بۆوە و دەرگا بچووکەکە کرایەوە.
- بۆ قووتابخانە بەخێرهاتی.
ئەلێکس دوودڵی پێوەدیار بوو. کۆرسی نوێی بروکلەند تا چەند رۆژێکی دیکە دەست پێدەکات. بەڵام ئەو لێرە بۆ قووتابخانەیەکی دیکە لە شوێنێکی دیکە و بۆ ئامانجێکی دیکە هاتبوو. بەڵام بۆ گۆڕانکاری لەو بەرنامەی هەڵیبژاردبوو، نەختێك درەنگ بوو. ئەو بەو رێگەیەدا دەڕۆیشت کە باوکی بۆی کردبۆوە.
ئێستا ئەلێکس گەیشتبووە ناو حەوشەی دێر. لە سێ لای حەوشەدا، بینا دەبینران. لەسەر دێریش زەنگێکی گەورە دەبینرا. پێنج پیاو کە جلی سپیان لەبەر بوو، لە دەوری راهێنەرێك وەستابوون. راهێنەرەکە پیاوێکی بەتەمەن بوو کە جلی رەنگی رەشی لەبەر بوو. کاتێك ئەلێکس و نیل

چوونە ژوورەوە، پیاوە سپی پۆشەکان هەنگاوێك بەرەوپێشەوە چوون و هاوارێکیان کرد. راهێنەر بە زاراوەی رووسی یا ئەورووپای رۆژهەلأت خەریکی قسەکردن بوو.

نیل بە ئەلێکسی وت:

– ئەوە پرۆفیسۆر یرمالۆڤ[92]ە. کاتێك لێرە بووم، مەشق و راهێنانی پێکردووم. جارێك بینیم کە بە پەنجەیەك کۆتایی بە رکابەرییەکەی هێنا.

ئێستا حەوشەیان کۆتایی پێهێنا و گەیشتنە ژوورێکی گەورە کە تەختایی ژوورەکە بە کاشی رەنگاورەنگ رازابۆوە. دینگەکانی لە دار بوون کە بەدەست دروستکرابوون و شووشەکانیان بریقەدار بوون. واپێدەچوو ئێرە سەردەمانێك بۆ دوعا و رێورەسمی ئایینی بووبێت، ئێستاش بۆ دیداری تایبەت کەڵکی لێوەردەگیرێت. لە لایەکی ژوورەکە دەرگایەکی لێبوو. نیل بۆلای ئەم دەرگایە چوو و لە دەرگای دا.

کەسێك کە بە زمانی فەرەنسی قسەی دەکرد، وەلأمی دایەوە:

– وەرە ژوورێ.

دەنگێکی دۆستانە و هاورێیانەی هەبوو.

چوونە ژوورێك کە میچی بانەکەی زۆر بەرز بوو. پێنج دیوار لە هەشت دیواری ژوورەکە بە کتێب چنرابوو. میچی ژوورەکە بە رەنگی شین و بە ئەستێرەی سیلڤەر (رەساسی) رەنگ کرابوو. میچەکە لانی کەم بیست مەتر بەرزایی هەبوو. نێردێوانێك لە ژوورەکە بوو کە لەسەر تایە هاتووچۆی دەکرد و درێژاییەکەی تا قەفەسەکانی کتێبەکان دەگەیشت. لەناوەراستی قووتابخانە، مێزێکی قورس دەبینرا کە دوو کوورسی سەردەمی کۆن و کوورسییەکیش لەپشتیان دانرابوو. پیاوێکی چەماوە کە کۆت و پانتۆلێکی لەبەر بوو، لەپشت مێزەکە دانیشتبوو و کاری بە لابتۆپێك دەکرد. پەنجەکانی بە خێرا لەسەر لابتۆپەکە دەجوولأ. ریشێکی

92 - Professor Yermalov

ڕەشـی ڕێـك ڕووخسـاری داپۆشـیبوو کـە دەگەیشـتە ژێـر چـەناگەی، مووەکانی دیکەی ماش و برنجی بوو.

– ئەلێکس رایدەر، تکایە وەرە ژووریٚ......

پیاوەکە سەیری ئەلێکسی کرد. پیاوێکی ماقووڵ دیار بوو.

– هەر یەکەمجار تۆم ناسییەوە. من باوکتم زۆر باش دەناسی و تۆ زۆر بە ئەو دەچی.

گەرچی زاراوەی فەرەنسی هەبوو، بەڵام زۆر بە باشی بە زمانی ئینگلیزی قسەی دەکرد.

– ناوم ئۆلیڤەر دارك[٩٣]ە. دەکریٚ بڵێین کە من بەڕێوەبەری ئەم فێرگەیەم. دەکریٚ ئەمەش بڵێین کە بەڕێوەبەری ڕاهێنەرانم. وا خەریك بووم لە ئینتەرنێت چەند زانیارییەکم لەبارەی تۆدا دەخوێندەوە.

ئەلێکس لەسەر کوورسیەك دانیشت. دارك پێکەنینێکی هاتیٚ.

– ئەوە دەزانم کە خاتوو ڕۆدمەن پێی وتووی باوکت مامۆستایەکی ئەم قووتابخانەیە بووە. من هیچ کارێکم بە ئەو نییە. ئەو هاوڕێیەکی باشی من بوو. بەڵام لە خەونیشدا بیرم لەوە نەدەکردەوە کە ڕۆژێك کووڕەکەی ببینم. ئەوەش نیلە کە تۆی بۆ ئێرە هێناوە. نیل چەند ساڵ پێش کۆتایی بە دەورەکانی ئەم قووتابخانەیە هێناوە. ئەو قووتابییەکی زۆر باش بوو. ئەو لە وانەکاندا پلەی دووهەمی بەدەست بوو.

ئەلێکس سەیرێکی نیلی کرد و بۆ یەکەمجار هەستی ناڕەحەتی و خەمی لە ڕووخساری ئەودا بینی. دوایی وەبیر خاتوو ڕۆدمەن کەوتەوە کە وتبووی نیل هەندیٚ خاڵی لاوازی هەیە. بۆ ئەلێکس ئەم پرسیارە هاتە ئاراوە کە چ شتێك ڕووی داوە بۆئەوەی نیل نەتوانیٚ پلەی یەکەمی ناو قووتابییەکان بەدەست بێنێت.

دارك پرسی:

---

93 -Oliver Dark

- دوای ئەم گەشتە نینوت نییە؟ هیچ دەخۆیتەوە بۆت بێنم؟ رەنگە ئاوی هەنار خراپ نەبێ؟

ئاوی هەناری سوور، ئەوکاتە کە لە فەرەنسا بوو، زۆری حەز لە ئاوی هەناری سوور بوو. ئایا دارک ئەم زانیارییەشی لە ئینتەرنێتەوە بەدەست هێنابوو؟

- باوکت هەمیشە ئەم ئاو میوەیەی دەخواردەوە.

- زۆر سوپاس.

- کەواتە با بەرنامەی ئێرەت بۆ شی بکەمەوە. نیل تۆ بەو کەسانە دەناسێنیٚ کە لەم فێرگەیەدا پەروەردە دەکرێن. هیچکات ژماری قووتابیانی ئێرە لە پازدە کەس تێناپەڕیٚ، ئێستاش زیاتر لە پازدە کەسمان نییە. نۆ پیاو و دوو ژن. تۆشیان پێوە زیاد دەبی و چەند رۆژیتر رادەی پێشکەوتنت دیاری دەکریٚ. لە کۆتاییدا، ئەگەر من بەم ئەنجامە گەیشتم توانای ئەوەت هەیە بێیتە ناو گروپی دووپشك، راپۆرتێك لەبارەی تۆدا دەنووسم و ئەوکات دەورەی جددی دەست پێدەکات. بەڵام من لە ئاستی تۆدا دوودڵ نیم، ئەلێکس. تۆ زۆر لاوی، تەنیا چواردە ساڵی. بەڵام تۆ کووڕی جۆن رایدەری و ئەو لەڕاستیدا زۆر باش بوو.

ئەلێکس وتی:

- هیچ شتێك هەیە کە دەبیٚ پێتی بڵێم.

دارك پاڵی دایەوە.

- تکایە هەرچی دەتهەویٚ، بیڵیٚ.

- من دەمهەویٚ بێمە ناو رێکخراوی دووپشك، دەمەویٚ ئەو کەسە بم کە کارەکانی ئێوە بەڕێوەدەبەم، بەڵام هیچکات ناتوانم کەس بکووژم. من ئەوەشم بە خاتوو رۆدمەن وت، بەڵام ئەو بڕوای پێنەکردم. ئەو وتی من کاری باوکم بەڕێوەدەبەم. بەڵام من ئاگاداری ناخی خۆمم و ئەوەش دەزانم کە لەگەڵ باوکم جیاوازم.

ئـەلێکس نەیـدەزانی ئـەم قسـەیەی لەسـەر دارک چ جـۆرە کاردانەوەیـەکی دەبێ. بەڵام واپێدەچوو ئەوەندەی گوێ نەداوەتە قسـەکەی ئەلێکس. ئەو وتی:

- دووپشـك زۆر چـالاکی جۆراوجـۆری هەیـە کـە بێشـك هـەموویان بـە کووشتن کۆتاییان پێنایەت. بۆ نموونە بۆ مەترسی خستنەسەر کەسێك یا کەسـانێك دەتـوانی هاوکاریمـان بکـەی، یـا دەتـوانی کـاری دیکـەمان بـۆ ئەنجام بدەی. بۆنموونە کێ شك و گومـانی لـە منـداڵێکی بچووك دەبـێ کە مـادەی بێهۆشـکەر، یـا تەقینـەوەی پـێ بێـت؟ تـۆ تـازە کـارت دەسـت پێکـردووە، تـازە سـەرەتای کـارە. دەبێ متمانـەمان پـێ بکـەی. ئێمـە بـەم ئەنجامە دەگەین کە تۆ چ کارێکت لەدەست دێت و چیت پـێ ناکرێ. ئێمـە کارێکت پێ دەسپێرین کە پێت خۆش بێ.

نیل وتی:

- کاتێك یەکەم کەسم کووشت، تەمەنم هەژدە ساڵە بوو. تەنیا چوار ساڵ لە ئێستای تۆ گەورەتر بووم.

دارك وتی:

- بـەڵام نیل، تـۆ هەمیشـە ئایـدیال و بـەتوانا بوویـە. کەسـانی وەکـوو تـۆ دەگمەنن.

دەنگی دەرگـا هـات و ژنێـك هاتـە ژوورەوە. تایلەنـدی بـوو. زۆر باریکەڵـە و لاواز و کورتەبالاَ بوو. نەختێك لە ئەلێکس کوورتتر بوو. چاوەکانی رەش، بـەڵام بـەهۆش دیـار بـوو. لەجێگـەی خـۆی وەسـتا و بەشـێوەی تایلەنـدی سلاَوی کرد. دەستەکانی لەسەر یەك دانـا وەکـوو ئەوەیکـە دوعـا دەکـات و سەری داخست.

- لە دیتنت خۆشحاڵم، ئەلێکس.

ئەویش وەکوو دارك بەسەر زمانی ئینگلیزیدا زاڵ بوو.

دارك وتی:

- ئەمە خاتوو "بیناگ"[٩٤]ە.
- ناوی بچووکم "ئیجیت"[٩٥]ە. دەتوانی جیت بانگم بکەی. هاتووم بۆ ژوورەکەت ڕێنوێنیت بکەم.
- دەتوانی نیوەڕۆی ئەمڕۆ پشوو بدەی. دووبارە لەکاتی خواردنی نانی شەو یەکتر دەبینین.

دارك لە جێگەی خۆی هەستا. بالآیەکی زۆر کورتی هەبوو. ردێنی نوك تیژی دەگەیشتە نزیك مێزەکە.

- لەوەیکە لێرەی زۆر خۆشحاڵم، ئەلێکس. بەخێرهاتی بۆ مالاگوستو.

ئەم ژنەی کە بەناوی جیت بانگیان دەکرد، ئەلێکسی بەرەو ژوورەکەی ڕێنوێنی کرد.

ئەلێکس پرسی:

- ئێوە لێرە چی دەکەن؟
- من وانەی رووەکناسی دەڵێمەوە.
- رووەکناسیی؟

ئەلێکس بەلایەوە سەیر بوو.

- وانەیەکی زۆر گرنگە. زۆر رووەك هەن کە بۆ ئیشەکەی ئێمە بەسوودن. بۆنموونە، ئامارژە بە گەلآی خزرهرە بکەم. دەکریٚ ژەهرێك لە گەلآی ئەم رووەکە دەربێنین کە مێشکی مرۆۤ لەکار دەخات و مردنێکی خێرا پێکدێنیٚ. رووەکی داروااشیش مردنی خێرای بەدواوەیە.
- سبەی دەتوانی بێیتە ماڵە سەوزەکەی من، ئەلێکس. هەر رووەکێکی کە لەویٚ هەمە، دەتوانیٚ ڕێوڕەسمێکی مردن پێکبێنیٚ؟

زۆر بە دڵنیاییەوە قسەی دەکرد. جارێکی دیکە ئەلێکس هەستی بەوە کرد کە بەشێوەیەك ئاسوودە و ئاساییی نییە، بەلآم هیچی نەوت.

---

[94] - Binnag

[95] - Eijit

لە ژووری وانە تێپەڕین، کە ڕەنگە وەختایەك دڕبر بووە بۆ دوعاکردن. وێنەکێشراوەکانی سەر دیوار کاڵ دەهاتنەبەرچاو. پەنجەرەی تێدا نەبوو. مامۆستایەك رووبەڕووی تەختەڕەش وەستابوو و لەگەڵ پێنج قووتابی دەدوا. دوو لەوان ژن بوون. خشتەیەکی تێکەڵاوی لەسەر تەختەڕەش کێشابۆوە. هەر قووتابییەك شتێکیان لەسەر مێزی پێش خۆیان دانابوو، کە زۆر بە پاکەتی جگەرە دەچوو.

ڕاهێنەر خەریکی وانە وتنەوە لەبارەی مەواددی تەقینەوە لە قاڵب بۆمبی پلاستیکیدا بوو.

جیت بۆ کاتێکی کەم لەقەراخ دەرگا وەستا و بە سەبری وتی:

– ئەمە مامۆستا گۆردون راس[96]ە. پسپۆری هونەری. ئەو خەڵکی وڵاتی ئێوەیە، لە گلاسکۆ[97]وە هاتووە. ئەمشەو ئەویش دەبینی.

لە ڕێگەیان بەردەوام بوون. ئەلێکس دووبارە گوێی لە دەنگی مامۆستا راس بوو.

– خاتوو گریگ[98]. تکایە هۆشت لەسەر خۆت بێت. نامانهەوێ تۆ بەم تەقینەوەیە هەموومان لەناوبەری.

لەبینای سەرەکی چوونە دەرەوە وگەیشتنە یەکەم بینای دیکە.

ئەلێکس کاتێك سواری بەلەم ببوو، ئەم بینایەی بینیبوو. جارێکی دیکە ئەم بینایە لە دەرەوە وەکوو خانوویەکی وێران دەچوو، بەڵام ناوەکەی جوان و مۆدێرن بوو. جیت، ئەلێکسی بۆ ژوورێك لە نهومی دووهەم برد کە هەواکەشێکی گەورەی تێدابوو. ژوورێکی گەوەر بوو کە تەختێکی خەوتنی گەورە، قەنەفە و مێزی نووسینی تێدابوو. پەنجەرەکانی

---

96 - Gordon Ross

97 - Glasgow

98 - Graig

فەڕەنسەوی و هەیوانێکی روو بە دەریای هەبوو کە ژوورەکەیان رازاندبۆوە.
جیت وتی:
- کاتژمێر پێنج بەدواتدا دێم. پەرەستار دەتبینێ. خاتوو رۆدمەن ئەمری کردووە کە زۆر بە باشی پشکنینت بۆ بکرێ. کاتژمێر شەش خواردنەوەیەك دەخۆین و خواردنیش رێك کاتژمێر حەوت دەخورێ. ئەمشەو مەشقمان هەیە. قووتابییەکان دەبێ خۆیان هەڵدەن، بەڵام تۆ نیگەران مەبە، بڕیار نییە تۆ ئەمکارەی بکەی.
بۆ جاری دووهەم سەری دانەواند و لە ژوورەکە چووە دەرەوە. ئەلێکس بە تەنیا مایەوە. لەسەر کوورسییەك دانیشت و سەیرێکی ژوورەکەی کرد. بەفرگرێك، تەلەڤزیۆنێك و دەزگەیەکی یارییەکانی کۆمپیۆتەریش لە ژوورەکە دانرابوون. رەنگە ئەمەیان سەبارەت بە ئەلێکس بە ژوورکەوە زیاد کردبێ.
خۆی لە چ کێشەیەکی گەورە هاویشتبوو؟ ئایا کارێکی دروستی بەڕێوەبردبوو؟ شك و گومان هزری داگرتبوو. وەبیر ڤیدیۆیەك کەوتەوە کە نیشانیان دابوو، ئەم رووداوە مەترسیدارەی کە بینیبووی. وەبیر ئەم دوو وشەقسەیە هاتەوە کە خاتوو جۆنز بە بێسیم وتبووی. ئەلێکس چاوەکانی داخست.
لەدەرەوە، شەپۆلەکان خۆیان لە دوورگە دەکووتا.
حەوت سەد مایل دوورتر ژنێك بەوپەڕی نیگەرانییەوە بیری لە ئەلێکس دەکردەوە، سەیرێکی وێنەکەی کرد. لاپەڕەیەکی پێوە زیاد کرد. لەسەر هەردووکیان مۆری زۆرنهێنی بەڕەنگی سوور لێدرابوو. ژنەکە دەیزانی ئەم وێنەیە چ مانایەکی هەیە. نەیدەتوانی رێگەی بدات کە هەست و ئیحساسات بەسەریدا زاڵ بێ. زاڵ بوونی هەست هەڵە لەگەڵ خۆی پێکدێنێت و بەپێی ئەو کار و پیشەیەی هەیبوو، هەڵە بەلای لێدەکەوتەوە. خاتوو جۆنز چاویلکەی تایبەت بە خوێندنەوەی لەسەر چاوی هەڵگرت و دەستێکی بەچاوەکانی داهێنا. ئەو ئەم وێنە و راپۆرتەی چەند خوولەك

پێشتر وەرگرتبوو. دوای ئەوە، دووجار زەنگی لێدابوو. ئومێدەوار بوو هەڵەیەك رووی دابێ، بەلام دوودڵییەك لەئارادا نەبوو. بەڵگە رێك لەبەردەستی دابوو. دوگمەیەكی سەر مۆبایلەكەی پاڵدا و دەستی بە قسە كردن كرد.

– ویلیام، ئایا بەرێز "بلێنت" لە ژووری خۆیەتی؟

لەژوورێكی دیكە، ویلیام دیرلی[99] سەیری مۆنیتۆری كۆمپیوتەرەكەی دەكرد. ئەو بیست و سێ ساڵە و دەرچووی زانكۆی كەمبریج[100] بوو و لەسەر كوورسییەك دانیشتبوو.

– هێشتا لەژووری خۆیەتی، خاتوو جۆنز.

– كۆبوونەوەیەك لەئارادایە؟

– نا، هیچ بەرنامەیەكی ئەوتۆمان نییە.

دەبوایە كارەكەی بەرێوەبردبا. خاتوو جۆنز وێنە و نامەی تایپكراوی دەست دایە و لە رێرەوی نهومی شازدەی بینایەكە بەرێكەوت كە وا نیشان دەدرا بەرواڵەت بینای بانكێكی نێودەوڵەتییە. ئێرە بنكەی چالاكیی تایبەتی (ئێم ئای٦) بوو. ئالان بلێنت بەرێوەبەری خاتوو جۆنز بوو. ئەو نەیدەزانی كاتێك ئەوە ببیسێ كە ئەلێكس رایدەر چووەتە ناو گرووپی دووپشك، چ كاردانەوەیەكی دەبێ.

ژووری بەرێز بلێنت لە كۆتایی رێرەوەكەدا بوو. خاتوو جۆنز بێ ئەوەیكە لە دەرگا بدات، چووە ناو ژوورەكە. پێویستی بە لەدەرگادان نەبوو. ویلیام رۆیشتنی خاتوو جۆنزی بۆ ژوورەكەی پێ راگەیاندبوو. هەر بۆیەش دیتنی خاتوو جۆنز بەلای بەرێز بلێنتەوە سەیر نەبوو. بەرێز بلێنت خەریكی خوێندنەوەی راپۆرتێكی چەند لاپەرەیی بوو.

خاتوو جۆنز ئاگاداری ئەوە بۆوە كە لە راپۆرتەكەدا بابەتە گرنگەكانی بە قەڵەمی سەوز دەستنیشان كردووە.

---

[99] - William Dearly

[100] - Cambridge

بەڕێز بلێنت سەیری خاتوو جۆنزی کرد:

– چ باسە؟

– هەر ئێستا ئەمەم بەدەست گەیشت. وابزانم دەبێ بیبینن.

ئەمەی وت و وێنە و ڕاپۆرتەکەی بە بەڕێز بلێنت دا.

لەکاتێکدا بەڕێز بلێنت ڕاپۆرتەکەی دەخوێندەوە، خاتوو جۆنز بە وردی سەیری ڕووخساری دەکرد. خاتوو جۆنز حەوت ساڵ بوو کە جێگری بەڕێز بلێنت بوو. پێش ئەوەیش بۆماوەی دە ساڵێك بۆ بەڕێز بلێنت کاری کردبوو. خاتوو جۆنز هیچکات بۆ ماڵی بەڕێز بلێنت نەچووبوو. هیچکات ژنەکەی نەدیتبوو. بەم حاڵەوە، باشتر لە هەر کەسێك ئەوی دەناسی. ئەو نیگەرانی بەڕێز بلێنت بوو. ئەم ماوەیە ئەو هەڵەیەکی زۆر گەورەی کردبوو و نەیویستبوو قسەکانی ئەلێکس لە ڕووداوی دامیان کێری قبووڵ بکات. لەئەنجامدا دامیان کێری تا مەودای چەند خولەکی لەناوبردنی نیوەی جیهان پێشکەوتبوو. بەڕێز بلێنت لەلایەن بەرپرسانی ئاسایشیی وڵات خرابووە ژێر پرسیارەوە. پێیان وتبوو کە مێرمنداڵێکی تەمەن چواردە ساڵە لەئەو زیاتر دەزانێ. خاتوو جۆنز نەیدەزانی بەڕێز بلێنت تا چ ماوەیەك لەم پلەیەدا دەمێنێتەوە.

ئێستا ئەو سەیرێکی وێنەکەی کرد. چاوەکانی لەپشت چاویلکەکە زەق ببوو. وێنە دوو کەسی نیشان دەدا. پیاوێك و کوڕێك کە لە بەلەمێك دەهاتنە خوارەوە. وێنە بە ماهوارە و لە سەرووی مالاگوستو کێشرابوو. ڕووخساری هەردووکیان نەختێك تار و لێڵ بوو.

– ئەلێکس ڕایدەرە؟

– وێنەکە لەلایەن ماهوارەیەك گیراوە. بەڵام سمیترز[١٠١] لەسەر کۆمپیوتەرەکەی سکەنی کردووە و بێشك ئەمە ئەلێکسە.

– ئەم پیاوەی کە لەگەڵێتی، کێیە؟

---

101 - Smithers

- بەبڕوای ئێمە، ئەو لە پیاوەکانی دووپشکە. ناوی نیلە. دیار نییە کە چـی ڕووی داوە. وێنـە ڕەش و سـپییە. مـن وردەکارییـەکانیم بـۆ وەرگرتووی.
- یانی مەبەستت ئەوەیە کە ئەلێکس جیبهەی خۆی گۆڕیوە؟
- من لەگەڵ ئەو ژنەی کە پارێزگاری لێدەکات، قسەم کردووە، ئەو وتی چەند ڕۆژێـك لەمەوبـەر لەگـەڵ کۆمـەڵێك قووتـابی بـۆ ڤێنیـز چـووە و لەوکاتەوە نادیارە.
- لەکوێ ون بووە؟
- ئەو زانیاری لەمبارەیەوە نەبوو. زۆر سەیرە کە هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ ئەو نەگرتووە.
- ئایا ئەگەری ئەوە هەیە کە ئەلێکس بەشێوەی نەخوازراو لەگەڵ گرووپی دووپشك تووشی کێشە بووبێ و ئەوان دەستبەسەریان کردبێ؟
- حەز دەکەم ئەمە باوەڕ بکەم. بەڵام ئەگەری ئەوە هەبووە کە یاسین گرگوروویچ پێش مردنی قسەی لەگەڵ ئەلێکس کردبێ. کاتێك دوای ڕووداوی کێری، ئەلێکسم بینی، هەستم کرد کێشەیەك ڕووی داوە. وابزانم یاسین باسی جۆن رایدەری بۆ کردبێ.
- ڕووداوی ئالبرت بریج؟
- بەڵێ.
- زۆر جێگەی داخە.

بێدەنگییەك لەناو ژوورەکە حاکم بوو. خاتوو جۆنز دەیزانی کە بەڕێز بلێنت زۆر شت لەناو مێشکیدا لێکدەداتەوە.

بەڕێز بلێنت وتی:

- دووپشك لەم دواییەدا ئەوەندە چالاك نەبووە.
- بەڵێ، ئەمجۆرەیە. زۆر بێدەنگ بوون، بەڵام وابزانم لە خەرابکاری ڕێکخراوی کونسانتۆ دەستیان هەبێ. ڕووداوێکە کە دوێنێ شەو ڕووی داوە.
- مەبەستت ئەو ڕێکخراوە دەرمانییەیە؟

- بەڵێ، تازە راپۆرتی ئەم رووداوەمان بەدەست گەیشتووە. وابزانم پەیوەندییەك لەنێوان ئەم رووداوانەدا هەبێت.
- ئەگەری ئەوە هەیە دووپشك لە ئەلێکس دژ بە ئێمە کەڵك وەربگرێت.
- بەڵێ، دەزانم.

بەڕێز بلێنت بۆ دوایین جار سەیری وێنەکەی کرد.

- ئەمە مالاگوستوستە. ماناکەی ئەوەیە کە ئەو زیندانی ئەوان نییە. ئەوان دەیانهەوێ پەروەردەی بکەن. وابزانم دەبێ رێژەی نیگابانانی تۆ زیاتر بکەین.
- پاسەوانی لە ئێوە چی؟
- من لە ئالبر بریج نەبووم.

ئێستا بەڕێز بلێنت وێنەکەی لەسەر مێزەکە دانا.

- هەموو پیاوەکانی ئێمە لە ڤێنیز ئاگادار بکەنەوە لە ئامادەباشیدا بن. گشت فڕۆکەخانەکانی وڵات کۆنترۆڵ بکەن. دەمهەوێ هەرچی زووتر ئەلێکس رایدەر بۆ ئێرە بگەڕێننەوە. بەساغ و سەلامەتی، بێ ئەوەی زیانی پێبگات.

بەڕێز بلێنت سەیرێکی خاتوو جۆنزی کرد.

- بەهەر شێوەیەك کە بکرێ.

## بوورجی دێر

- دەی، پێم بڵێ بزانم چی دەبینی؟
ئەلێکس لەسەر کوورسییەکی دروستکراو لە چەرم لە ژوورێکی ناو دێر دانیشتبوو. ئەو لە لایەکی کوورسییەکە دانیشتبوو. بەرامبەر بەئەو پیاوێکی مامناوەند بە پێکەنینەوە دانیشتبوو. ناوی ئەم پیاوە دکتۆر کارل ستاینێر[102] بوو و لەگەڵ ئەوەیکە تارادەیەك ئاشنا بە زمانی ئەڵمانی بوو، بەڵام لە ئەفریقای باشوورەوە بۆ ئەم دوورگەیە هاتبوو. ئەو دکتۆری دەروونناسی بوو و رووخساریشی ئەمەی نیشان دەدا. دکتۆر ستاینێر کاغەزێکی سپی بەدەستەوە بوو کە وێنەیەکی رەشی لەسەر بوو. ئەمە وێنەیەکی تایبەت نەبوو، تەنیا چەند پەڵەی رەشی کێشراوە بوو. بەڵام ئەلێکس دەبوایە شی بکردبایەوە.
ئەلێکس بۆ ماوەیەکی کوورت بیری کردەوە کە ئەمە هەمان تاقی کردنەوەی رورشاچ[103]ە کە پێشتر لەناو فیلمێکدا بینیویەتی.
وایزانی کە دەبێ تاقی کردنەوەیەکی گرنگ بێت. بەڵام متمانەشی بە بینینی خۆی نەبوو کە شتێکی بینیبێ، بەهەرحاڵ ئەلێکس بڕیاری دا قسەیەك بکات.
- وابزانم پیاوێکە و لە ئاسماندا دەفڕێت. ئەو کۆڵەپشتییەکیشی لەپشتە.
دکتۆر ستاینێر کارتەکەی لەسەر مێز دانا.
- بژی، زۆر باش بوو.
دوایی کارتێکی دیکەی دەست دایە.

102 Dr Karl Steiner-

103 - Rorschac

- چۆن لەبارەی ئەمەیان بیر دەکەیتەوە؟
وێنەی دووهەم شکڵێکی ئاسانتر بوو.
- تۆپی پێیە کە دەیانهەوێ بای تێبکەن.
- زۆر باشە، سوپاست دەکەم!
- دکتۆر ستاینێر کارتەکەی لەسەر مێز دانا و نەختێك بێدەنگی بەسەر ژوورەکەدا حاکم بوو. لەدەرەوە دەنگی تەقە دەهات. قووتابییەکانی دیکە خەریکی مەشق و راهێنان بوون. بەڵام لەم جێگەیەی کە ئەلێکس دانیشتبوو، هیچ شتێك نەدەبینرا. رەنگە دەروونناس هەر بۆیە ئەم شوێنەی هەڵبژاردبوو.
- ئێ، مانەوەت لێرەدا چۆن دەبینی؟
- هیچ کێشەیەك لەئارادا نییە.
- دڵەڕاوکێت نییە؟ هیچ شتێك نییە کە بتهەوێ لەبارەیدا قسە بکەی؟
- نا، هیچ کێشەیەکم نییە. زۆر باشم. سوپاس، دکتۆر ستاینێر.
- زۆر باشە، یانی لەوە باشتر نابێ.
دەروونناس هەوڵی دەدا بەشێوەی پۆزەتیڤ قسەی لەگەڵ بکات. ئەلێکس نەیدەزانی کە ئایا گفتوگۆکەیان کۆتایی پێهاتووە یا نا. بەڵام لەم کاتەدا دکتۆر ستاینێر فایلێکی کردەوە.
- وەڵامی پشکنینیەکانی پزیشکیتم وەرگرتۆتەوە.
ئەلێکس بۆ کاتێکی کەم بێقەراری بە رووخسارییەوە دیار بوو. رۆژی یەکەمی هاتنی بۆ ئەم دوورگەیە بە تەواوی پشکنینی بۆکرابوو. نموونەی میز و خوێنیان لێگرتبوو. رێژەی پەستانی خوێن، توانایی بیستن و دیتنیشی تاقی کرابۆوە. ئەلێکس نەیدەزانی ئایا هیچ کێشەیەك لە وەڵامی تاقیکردنەوەکاندا هەیە یا نا.
بەڵام دکتۆر ستاینێر پێکنینێکی بە رووخسارەوە دیار بوو.
- بارودۆخی جەستەییت زۆر باشە، ئەلێکس. خۆشحاڵم کە ئاگاداری خۆت بوویە. هەموو جۆرە خواردنێکت نەخواردەوە، جگەرەش کە ناکێشی، زۆر عاقڵانەیە.

دکتۆر ستاینێر کشەوی مێزەکەی کێشایەدەر. ئەلێکس بەس سەیری دەکرد. دکتۆر ستاینێر دەرزی خستە ناو بوتلێکەوە و پڕی کرد.

ئەلێکس پرسی:

– ئەمە چییە؟

– بەپێی راپۆرتی پزیشکی، نەختێك ماندووی. هەڵبەت دەبوایە چاوەڕوانی ئەمە بین. دوای ئەم رووداوانەی کە بەسەرت هاتوون، ئەمە درکی پێدەکرێت. پەرەستار پێشنیاری داوە کە نەختێك ڤیتامین وەربگری. شتێکی دیکە لەئارادا نییە. دەکرێ قۆڵت هەڵکەی؟

– وامزانی ئێوە دەروونناسن.

دکتۆر ستاینێر وەڵامی دایەوە:

– مەترسیّ دەزانم دەرزی لێبدەم. نەکا لە دەرزی بترسێی؟

– نا، هیچ ترسێکم نییە.

ئەمەی وت و قۆڵی هەڵکرد.

دوای دوو خولەك لەناو حەوشە بوو. ئەو بەهۆی بینینی دکتۆر مەشقی تەقەکردنی لەدەست دابوو. راهێنان لای رۆژئاوای دوورگە بوو، ئەم لایەی کە رووی لە شاری ڤێنیزەوە نەبوو. لەگەڵ ئەوەیکە دووپشك بەشێوەی یاسایی رێگەی پێدرابوو لە مالاگوستۆ بێت، بەلام نەیاندەویست بە دەنگی تەقە شك و گومان پێکبێنن. بەشی پڕ لە دار و دارستانی دوورگە بۆ ئەم مەبەستە شوێنێکی باش بوو.

گوردون راس، پسپۆری هونەری، کە واپێدەچوو بەشێکی زۆری لێهاتووییەکەی لە زیندانی سکۆتلەندا(١٠٤) بەدەست هێنابوو، بەرنامەی تیرهاوێژی سەرپەرەشتی دەکرد. بە دیتنی ئەلێکس سەرێکی جووڵاند.

– بەیانی باش، بەڕێز رایدەر. ئێ، ئەنجامی قسەکردنت لەگەڵ دەروونناس گەیشتە کوێ؟ پێی وتی کە شێتی؟ ئەگەر شێت نەبێ، بەلامەوە سەیرە کە تۆ لێرە چی دەکەی.

---

104 - Scotlanda

چـــەند قووتابییـــەك دەورەیـــان دان. ســـیلاحەكانیان ڕێكدەخســـت و فیشەكەكانیان دەردەهێنا. ئەلێكس ئێستا هەموویانی دەناسی. یەكێكیان كـلاوس[١٠٥]ی ئـەڵمانی بـوو كـە لەگـەڵ تاڵـەبان[١٠٦] لـە ئەفغانسـتان[١٠٧] دەورەی دیتبوو. والكر[١٠٨]یش پێنج ساڵ لە واشنگتۆن[١٠٩] كاتی خۆی بەسەر بردبوو. یەكێ لە دوو ژنەكان نزیك بە ئەلێكس وەستابوو. ئەلێكس وای بیر كردەوە كە ڕەنگە ئەم ژنە تەنیا بۆ پارێزگاری و ئاگاداری كردن لە ئەو هەڵبژێردراوە. ناوی ئاماندا[١١٠] بوو.

بـۆ ئـەلێكس سـەیر بـوو كـە ئـاوا بـە ئاسـانی لەگـەڵ ژیـانی مالاگوسـتو ڕاهـاتووە. ئـەلێكس وەبیر ئـەم كاتـە كەوتـەوە كـە (ئـێم ئـای٦) ئـەویان بـۆ دیتنی دەورەیەكی پەروەردەیی بۆ ئێس ئای ئێس[١١١] لە ڤێڵز[١١٢] ناردبوو. ناردبوو. لەهەمان سەرەتاوە وەكوو كەسێكی غەریب هەڵسووكەوتی لەگەڵ دەكرا. هەستی ئەوە بوو كە منداڵێك چووەتە ناو دونیای گەورەساڵانەوە. لێرەش تەمەنی لە هەموویان كەمتر بوو. بەڵام لێرە تەمەن شتێكی ئەوەنـدە گـرنگ نـەبوو، زۆریـش بـە پێچـەوانە. ئـەویان بـە باشـی وەرگرتبـوو و قووتابییـەكانی دیكـە بەشایسـتەیی سـەیریان دەكـرد. ئـەو كـووڕی جـۆن ڕایدەر بوو. هەموویان باش دەیانزانی كە ئەمە مانای چییە.

گوردون ڕاس وتی:

– كـاتێكی گونجـاوە كـە بـەر لـە خـواردنی نـانی نیـوەڕۆ توانـایی خـۆت نیشـان بـدەی كـە چ كارێكـت لەدەسـت دێـت. پێـرێ كـە خـاڵێكی زۆرت

---

105 - Klaus
106 - Taliban
107 - Afghanistan
108 - Walker
109 - Washington
110 -Amanda
111 - SAS
112 - Wales

وەرگرت. لەڕاستیدا پلەی دووهەمت بەدەستهێنا. بزانم ئەمڕۆ چ دەکەی. بەڵام ڕەنگە ئەمڕۆ نەختێك تووشی سەرسووڕمان بی.
ئەو، دەمانچەی ناوقەدی بە ئەلێکس دا - دەمانچەیەکی دروستکراوی بەلجیکیای نیوە ئۆتۆماتیك. ئەلێکس لەناو دەستیدا دەمانچەکەی لەرووی کێشەوە هەڵسەنگاند. دەیویست هاوسەنگییەك لەنێوان خۆی و دەمانچەکەی پێکبێنێ. ڕاس پێشتر بۆی شی کردبۆوە کە ئەم کارە بۆ ئەو شێوەکارە ڕاهێنانەی کە ئەو پەروەردەی دەکا، زۆر پێویستە.
- لەبیرت بێ، دەبێ بەخێرایی تەقە بکەی. ناتوانی بۆ نیشانەگرتن کات بەفیڕۆ بدەی. ئەگەر ئەم کارە بکەی، گیانت لەدەست داوە. لە شەڕی ڕاستەقینەدا کاتت لەبەردەستدا نییە. تۆ و سیلاحەکەت یەکێکن.
ئەگەر بڕوات وابێ کە دەتوانی لە نیشانە بدەی، ئەوە بزانە کە دەتوانی ئەم کارە بکەی. ئێستا ئەلێکس هەنگاوێکی بەرەو پێشەوە هەڵگرت. دەمانچەکەی لە تەنیشت خۆی ڕاگرتبوو و سەیری دەرگا و پەنجەرەکانی مەشق کردنی دەکرد. دەیزانی کە ڕاگەیاندنێك لەئارادا نابێ. لەناکاو نیشانە دەردەکەوت و ئەو دەبوایە تەقەی لێبکات.
ئەلێکس چاوەڕوان مایەوە. دەیزانی کە قووتابییەکانی دیکە بە وردی سەیری دەکەن. لە سیلەی چاوی سەیرێکی گۆردون ڕاسی کرد. ئایا بزەیەك لەسەر لێوەکانی مامۆستا هەبوو؟
جووڵەیەکی لەناکاو ڕووی دا.
لە یەکێك لە پەنجەرەکانی ڕیزی سەرەوە نیشانەیەك دەرکەوت. نیشانەیەك بەوێنەی شکڵی پیاوێکی لاو. ئەلێکس نەیدەزانی کە ئەو کێیە، بۆی گرنگ نەبوو. ئەو نیشانەیەك بوو. مرۆڤی ڕاستەقینە نەبوو.
کاتی دوودڵی نەبوو.
ئەلێکس دەمانچەکەی بەرز کردەوە و تەقەی کرد.
کەمێك دواتر لەم ڕۆژەدا، ئۆلیڤەر دارك، بەڕێوەبەری فێرگە و ناوەندی هەڵسەنگاندنی دووپشك، لە ژووری خۆی لە مالاگوستو دانیشتبوو و لەگەڵ جولیا ڕۆدمەن قسەی دەکرد. وێنەی خاتوو ڕۆدمەن لەسەر

لابتۆپەکەی دارك دەبینرا. خاتوو رۆدمەن هیچکات بۆ ئەم دوورگەیە نەهاتبوو. ئەو دەیزانی کە ئەم دوورگەیە لەژێر کۆنترۆڵی ماهوارەکانی ئەمریکی و ئینگلیزی دایە و هیچ دوور نییە کە بیانهەوێ رۆژێك بە بۆمبێکی غەیری ناوەکی ئەم دوورگەیە لەناوبەرن. زۆر مەترسیدار بوو.

ئەمە دووهەم جار بوو دوای هاتنی ئەلێکس، پێکەوە دوابوون. کاتژمێر رێك حەوتی شەو بوو. خۆر کەم کەم ئاوا دەبوو.

خاتوو رۆدمەن پرسی:

- پێشوەچوونی چۆنە؟

دارك دەستێکی بەسەر ردێن و رووخساری داهێنا.

- کورێکی زۆر وردبین و بەتوانا و نوخبەیە. هەڵبەت مامی ئیان رایدەر زۆر شتی فێر کردووە. دەبێ ئەمە بڵێم کەکارەکەی زۆر سەرکەوتووانە بووە.

- چیتر؟

- زۆر بەهۆشە. خۆش خووڵقە. لێرە هەمووکەس خۆشیان دەوێ. بەڵام لەبارەی بەسوود بوونی هێشتا ئەوەندە دڵنیا نیم.

- لە بیستنی ئەم قسەیە زۆر بەداخم، پرۆفیسۆر دارك. دەکرێ زیاتر بۆم شی بکەیتەوە.

- دوو نموونەت بۆ شی دەکەمەوە، خاتوو رۆدمەن. ئەلێکس بۆ گۆڕەپانی تەقەکردن هات. داوام کرد لە مەشق و راهێناندا بەشێوەی غەیری ئیرادی و غەریزی بەشداری بکات. پێشتر ئەم کارەی نەکردبوو. دەبێ ئەوە بڵێم کە چەند هەفتەیەکی دەوێ کە قووتابیان لەم بوارەوە لێهاتوویی بەدەست بێنن، بەڵام ئەلێکس دوای یەك دوو کاتژمێر توانی ئەنجامی زۆر باش بەدەست بێنێ. ئەو ئەمرۆ ٧٢٪ی بەدەستهێنا:

- باشە، ئەمە چ کێشەیەکی تێدایە.

دارك لەناو کوورسییەکەیدا جووڵەیەکی کرد؟

- ئەمڕۆ شکڵی نیشانەکانمان گۆڕی. لەجیاتی نیشانە، وێنەی مرۆڤمان دانا و دوایی داوام لە ئەلێکس کرد کە تەقە لە شوێنە هەستیارەکانی وێنە، بۆ نموونە مێشك، دڵ یا نێوان دوو چاو بکات.
- ئێ، ئەنجامی کارەکەی چۆن بوو؟
- گرفتەکە لێرە دایە، خاڵەکانی بۆ ٤٦٪ دابەزی. چەند نیشانەی بە تەواوی لەدەست دا.

دارك چاویلکەکانی دەست دایە و بە دەسرەیەك شووشەکەی خاوێن کردەوە.

- ئەنجامی تاقی کردنەوەی دەروونناسی رورشاچیشمان لێگرت. داوای لێکرابوو سەیری چەند شکڵ و وێنە بکات و رای خۆی سەبارەت بە ئەوانەوە دەربڕێت.
- پرۆفیسۆر من هیچ زانیارییەکم لەبارەی تاقی کردنەوەی رورشاچەوە نییە.
- هەڵبەت، بمبوورن. یەکێ لە وێنەکان کە هەر قووتابییەکی دێتە ئێرە، زۆر بە ئاسانی دەزانێ چییە، پیاوێکە کە لەسەر دەریایەك خوێن خەوتووە. بەڵام ئەلێکس بە درووستی نەیزانیوە وێنەکە چی نیشان دەدات. ئەو وتبووی ئەمە پیاوێکە بە کۆڵپشتییەکەوە. وێنەیەکی دیکە لەڕاستیدا پیاوێك نیشان دەدات کە دەمانچەی بەرەو سەری کەسێك راگرتووە، ئەلێکس پێیوابوو ئەمە کەسێکە کە با لە تۆپێك دەکات. ئەو هەر لە یەکەم دیدارماندا پێی وتم کە ناتوانێ کەسمان بۆ بکووژێت و من لە روانگەی دەرونییەوە دەڵێم کە ئەو بەشێوەی غەریزی حەزی لە کووشتن نییە و ناتوانێ کەس بکووژێت.

بێدەنگییەکی دوورودرێژ لەنێوانیان رووی دا.

دارك بەردەوام بوو.

- هیچ ئومێدێکم پێی نییە. کاتێك ئەلێکسم بینی، وام هەست کرد کە مرۆڤکووژێکی مێرمنداڵ بۆ ئێمە بەسوود دەبێ. دەتوانین لە کەسێکی ئاوا

بەڕادەیەکی زۆر کەڵك وەربگرین. وابزانم باشتر وایە کەسێکی دیکە بدۆزینەوە.

- لەوە دوودڵم کە بتوانین مێرمنداڵێك بدۆزینەوە کە ئەزموون و توانایی ئەلێکسی هەبێت.

- بەڵی، منیش ئاماژەم بەم مەسەلەیە کرد. بەم حاڵەشەوە....

بێدەنگییەکی دیکە حاکم بوو. خاتوو رۆدمەن بە ئەنجامێکی باش گەیشت.

- ئایا ئەلێکس دکتۆر ستاینێری بینیوە.

- بەڵێ، رێك ئەمجۆرە هەڵسووکەوتمان کرد کە وتبووت.

خاتوو رۆدمەن سەرێکی بەنیشانەی قبووڵ کردن دانواند.

- زۆر باشە. ئێوە دەڵێن ئەلێکس کەسمان بۆ ناکووژێ. رەنگە لە هەڵەدا بن. گرنگ ئەوەیە نیشانەیەکی پێ بدەین. ئەمجارە من لەبارەی کاغەز قسە ناکەم.

- دەتانهەوێ ئەرکێکی بکووژی پێبسپێرن ؟

- هەر ئەمجۆرەی کە دەزانن، شەمشێری نادیار گەیشتووەتە قۆناغی کۆتایی. کاتەکە زۆر ئەستەم و قەیرانییە. زیادکردنی ئەلێکس بە پێکهاتەی کەسەکان دەتوانێ ببێتە هۆی دوور خستنەوەی هۆش و هزر. ئەگەر ئەو بتوانێ، کە دەتوانێ، زۆر ئێمە بە سوود دەبێ. کاتێکی لەوە باشترمان لەبەردەستدا نییە.

جولیا رۆدمەن بەرەو پێشەوە خوار بۆوە، بەجۆرێك کە چاوەکانی بە تەواوی شاشەی کۆمپیوتەری پڕ کرد.

- ئەمە ئەو کارەیە کە دەمهەوێ بەڕێوەی ببەی....

بوورجی دێر دووسد و جەوت پەیژەی هەبوو. ئەلێس ئەمەی دەزانی، چونکە ئەو هەموویانی ژماردبوو. خوارووی بوورجەکە بەتاڵ بوو. تاك ژوورێك بە دیواری خشت و بۆنی نم و شێ. بە روونی دیار نەبوو کە چەند ساڵ لەمەوپێش بەتاڵ کراوە. زەنگەکان واتە زەنگووڵە گەورەکانی سەر

بووورجی دێر یا دزرابوون، یا کەوتبوونە خوارەوە و خراپ ببوون. پەیژەکان لە بەرد و بەشێوەی مارپێچ بوون. پەنجەرەی بچووک لە لەخوودی بوورجەکەدا دروست کرابوون، بەڕادەیەك بوون کە ناوەکەیان رووناك دەکرد. لە سەرەوە دەرگایەك هەبوو. ئەلێکس نەیدەزانی ئەم دەرگایە داخراوە یا نا. لەم بوورجە بۆ دیدەوانی کەڵکی لێوەردەگیرا. کاتێك قووتابیان دەبوایە لە لایەکی دوورگە لەسەر سینگ بۆ لایەکی دیکە دەڕۆیشتن، کەڵکی لێوەردەگیرا. پۆستێکی دیدەوانی باش بوو، بەڵام پێشتر بۆ سەرووی بوورجەکە نەڕۆیشتبوو.

دەرگا کرابۆوە. گەیشتە سەکۆیەکی چوارگۆشە کە دە مەتر بەرین بوو. ئەم سەکۆیە لە شوێنێکی کراوەدا بوو. دەوراودەوری ئەو بە ئاسن پارێزرابوو کە زۆربەیان خراپ ببون. ئێستا ئەگەر ئەلێکس چەند هەنگاو بەرەو پێشەوە چووبا، دەکەوتە خوارەوە و بێشك دەکوژرا.

ئەلێکس زۆر بە لەسەرەخۆیی خۆی گەیاندە لێوی سەکۆکە و لەوێوە سەیری خوارەوەی کرد. ڕێك لەسەر حەوشەی دێر بوو. لەوێوە دەیتوانی مەکیوارا(١١٣) ببینێ کە دوانیوەڕۆی ئەم رۆژە چەقاندبوویان. سەرووی دیرەکیان بەڕادەی بەرزایی سەری مرۆڤ بە چەرم داپۆشیبوو. لە ئەو بۆ مەشق و ڕاهێنانی کیك – بۆکسینگ(١١٤) و لێدانەکانی کاراتی کەڵکیان وەردەگرت. هیچ کەس لەم شوێنە دیار نەبوو. وانەکانی ئەمڕۆژە کۆتاییان پێهاتبوو و قووتابیان پێش خواردنی نانی ئەو خەریکی پشوو و حەسانەوە بوون.

ئەلێکس سەیری ئەو دارستانەی کرد کە دێرەکەی دەورە دابوو. تاریك بوو و واپێدەچوو کەس ناتوانێ دەستی پێڕابگات. خۆر لە دوورەوە دەچووە ناو دەریا و دوایین ڕووناکی بەسەر ئاوی ڕەشدا بڵاو دەکردەوە.

---

113 - Makiwara

114 - Kick - Boxing

لە دوورەوە چرا و رووناکی ڤێنیز دیار بوو. ئێستا لەوێ چی رووی دەدا؟ گەشتیارەکان خەریکی جێهێشتنی هۆتێلەکانی خۆیان بوون. سەردانی رێستۆرانتەکانیان دەکرد و دەچوونە ناو کافەتریاکان. لە هەندێ دێرەکاندا کۆنسێرت بلاو دەبۆوە. بەلەم سوارەکان خەریکی رێکخستنی بەلەمەکانیان بوون. کاتێکی زۆر تا زستان مابوو، بەلام بەم حالەوە کەش و هەوا ئەوەندە سارد بوو کە کەس حەزی لە سواربوونی کەشتی نەبوو بۆ ئەوەی چێژ لە گەشت و گوزارەکەی وەربگرێت.

بۆ ئەلێکس جێگەی سەرسوورمان بوو کە دوورگەیەکی ئاوا مەترسیدار و سەیر تا ئەو رادەیە لە شارێکی بەناوبانگی گەشتیاری نزیک بێ. دوو جیهانی جیاواز، نزیک بە یەک، بەلام یەکێکیان هیچ زانیارییەکی لەویتر نەبوو.

ئەلێکس بێ جوولە لەوێ وەستا. هەستی بە بایەکی سارد دەکرد کە لەنێوان پرچی سەری تیدەپەڕی. تەنیا کراسێکی قولدرێژی لەبەر بوو و پانتۆلی جینی لەپێ بوو. سەرمای سەرەتای شەوی هەست پێدەکرد. وای هەست دەکرد بووەتە بەشێك لەم بوورجە –پەیکەرێك، یا سولاوکێك. ئەو سەبارەت بەوە بۆ مالاگوستو هاتبوو، چونکە شوێنی دیکەی نەبوو بۆ ئەوەی بچێت و لێی بحەسێتەوە. ئیتر هیچ هەلبژاردنێکی دیکەی لەبەردەستدا نەبوو.

بیری لەم چەند هەفتەی رابردوو دەکردەوە. چ ماوەیەکە لەم دوورگەیەیە. بەهیچ شێوە ئەمەی نەدەزانی. بەشێوەیەك هەستی دەکرد بۆ قووتابخانە دەچێ. پۆلی وانەوتنەوە و مامۆستاکان و جۆری وانەکان جیاوازیان هەبوو، وانەکانی ئێرە بەهیچ شێوە وەکوو وانەکانی بروکلەند نەدەچوون. بەر لە هەموو شت وانەی مێژوو بوو کە ئەویش لەلایەن دکتۆر گۆردون راس دەوترایەوە. بەلام ئەو بەهیچ شێوەی لە مێژوودا باسی پاشا و مەلەکە و شەڕێ نێوان حکوومەتەکانی نەدەکرد. راس پسپۆری مێژووی چەك و تەقەمەنی بوو.

– ئەمــە چــەقوویەکی دوولایــەی کۆماندۆییــە کــە لــە شــەڕی دووهــەمی جیهــانی لەلایــەن فیربــایرن(١١٥) و ســایکز(١١٦) چــاك کــراوە. یــەکێك لــەوان پسپۆڕی کوشتن لە بێدەنگیدا بوو و ئەویتریان تیرهاوێژێکی گەورە. ئایا بەم جوانییە نالێن؟ هەر ئەمجۆرەی کە دەبینی، تیغەی ئەو حەوت و نیو ئینچە کە لەبەشی ناوەڕاستی تیغەکەیدا ددانەی هەیە.

جۆرێك دروست کراوە کە لەناو دەستدا جێگە دەگرێت. ڕەنگە بۆتۆ نەختێك قوورس بێ، ئەلێکس. چونکە دەستەکانی تۆ هێشتا بە تەواوی گەشەی خۆیان نەکردووە. بەلآم ئەمە باشترین سیلاحی کووشتنە کە تا ئێستا چاك کراوە. بەلآم چەقۆی کۆماندۆ باشترین هاوڕێی ئێمەیە. کاری خۆی بەباشترین شێوە بەڕێوەدەبات. هیچکات مەعتەلت ناکات.

دوایی وانەکانی زانستی لەگەڵ پرۆفیسۆر یرمالۆڤ بوو. هەر ئەمجۆرەی کە نیل وتبووی ئەو لەگشت کارمەندەکانی دیکە سەختگیرترە. پیاوێکی نزیك بە پەنجا ساڵ کە کاتی ئەوتۆی بۆ کەس نەبوو، بەلآم ئەلێکس زۆر زوو ئاگاداری هۆکارەکەی بۆوە. یرمالۆڤ خەڵکی چێچێن(١١٧) بوو و هەموو ئەندامانی بنەماڵەکەی لەشەڕ لەگەڵ رووسیا(١١٨) لەدەست دابوو.

ئەو وتی:

– ئەمڕۆ پێت نیشان دەدەم کە چۆن خۆت نادیار بکەی.

ئەلیکس بزەیەکی هاتە سەر لێوانی؟ یرمالۆڤ بزەی سەر لێوانی ئەلێکسی بینی.

– وا هەست دەکەی گاڵتەت لەگەڵ دەکەم، بەڕێز رایدەر. وادەزانی لەبارەی کتێبی منالآن قسەت بۆ دەکەم؟ نا، لەهەڵە دای. دەمهەوێ

[115] -Fairbairn
[116] -Sykes
[117] - Chechnya
[118] - russia

لێهاتوویی نینجا[119] کانت فێر بکەم، گەورەترین پۆلیسانی نهێنی کە تا ئێستا ژیاون، ئەمەیان بۆ دەرکەوتووە کە نینجاکانی ژاپۆنی لەهەوادا خۆیان ون دەکەن. ئەوان لە پێنج خاڵی راکردن و خۆشاردنەوەی بەناوی گوتنپۆ[120] کەڵکیان وەردەگرت. هیچ سێحرێك لەئارادا نەبوو.
کارەکەیان زانستی بوو. ئەگەری ئەوە هەبوو لەژێر ئاو خۆیان بشارنەوە و بە یارمەتی بۆرییەك هەناسە بکێشن. ئەگەری ئەوە هەبوو چەند سانتی مەترێك خۆیان لەژێر خۆڵدا بشارنەوە. جلی تایبەتیان لەبەر دەکرد، جاریوایە پەیژەیەکی نادیاریان هەڵدەگرت. کاری دیکەش هەبوو کە دەیانکرد. بۆنموونە بە دووکەڵ یا مەواددی کیمیایی چاوی دوژمنەکانیان کوێر دەکرد و خۆیان نادیار دەمانەوە. ئەمە رێك ئەم شتەیە کە ئێستا نیشانتی دەدەم. ئەمرۆ خاتوو بیانگ نیشانت دەدا کە چۆن دەتوانی لە تۆزی بیبەری تیژ بۆ نابیناکردن کەڵك وەربگری.
مەشق و راهێنانی دیکەش لەئارادا بوون. ئەوەیکە بە چاوی بەستراوەوە چۆن سیلاحێك بکەیتەوە و تێکنێیتەوە. چۆن دەتوانن لە ترس کەڵك وەربگرن. چۆن دەتوانن سەرسوورهێنەر بن. بۆ هەموو ئەمانە کتێب و دەفتەر و نووسین و تەختەڕەش هەبوون و تاقی کردنەوەش لەئارادا بوو. ئەوان لە پۆلی وانەوتنەوە لەسەر کورسی ئاسایی دادەنیشتن. تەنیا جیاوازییەکە ئەوە بوو کە ئێرە قووتابخانەی کووشتن بوو.
دوایی بەرنامەی نمایش کردن بەڕێوەدەچوو و ئەمە ئەو شتە بوو کە ئەلێکس هیچکات لەبیری نەدەکرد.
دوانیوەڕۆی رۆژێك قووتابیان لە حەوشەی سەرەکی کۆببونەوە. ئۆلیڤەر دارك نزیك لە نیل وەستابوو کە جلێکی رەنگ سپی وەرزشی جۆدۆ و قایشبەندێکی رەشی بەستبوو.

---

119 - Ninja

120 - Gotonpo

دارك وەكوو شی كردنەوەیەك وتی:

– نیل یەكێك لە باشترین قووتابییەكانی ئێمە بووە. ئەو لەو ماوەیەی كە لێرەبوو توانیبووی چەند ئەركێكی نهێنی بۆ دووپشك لە واشنگتۆن، لەندەن[121]، بانكۆك[122]، سیدنی[123] و شوێنەكانی دیكە بەڕێوەببات. ئەمڕۆ دەیهەوێ چەند هونەرێكمان نیشان بدات. بێشك هەمووتان شتەهایەكی لێ فێر دەبن.

دوایی رووی لە نیل كرد و وتی:

– سوپاست دەكەم، نیل.

– لە سی خوولەكی دواییدا، ئەلێكس شایەدی هونەرێكی زۆر بوو كە ئاماژەیەك بوو بە لێهاتوویی جەستەیی نیلەوە و ئەو هیچكات لەبیریان ناكات.

ئەو چالاكییەكی زۆر سەیری نمایش دەكرد و بەم حاڵەشەوە خاڵی لاوازی هەبوو كە شاراوە بوو و هیچكەس پێینەدەزانی. ئەلێكسیش ئاگاداری خاڵی لاوازی نیل نەبوو. بەلاّم بەم هەموو لێهاتوویی و ورەبەرزییەوە، بۆ ئەلێكس بەدیار كەوت كە چۆن بە ئاسانی لە كۆشكی بێوەژندا شكستی دابوو. لە ململانێ لەگەڵ پیاوێك بە تایبەتمەندی نیل، ئەو كەمترین بەختی بەخۆی دەدا.

بەلاّم لانیكەم ئەوان ئەندامی گروپێك بوون.

ئایا بڕیارێكی دروستی دابوو؟ بەلاّم هەموو شت زۆر ساكار و سادە دەهاتەبەرچاو. یاسین گرگوروویچ راستییەكانی پێوتبوو. خاتوو رۆدمەن فیلمەكەی نیشان دابوو. بەمحاڵەوە، هێشتا متمانەیەكی ئەوتۆی پێنەبوون. لەم كەش و هەوا فێنكەی شەوانە دەنگێك لە گوێیدا

[121] - London
[122] - Bangkok
[123] - Sydney

دەیسـریواند کـە هەڵەیـەکی زۆر مەترسـیداری کـردووە و هێشـتا هـەلی ئەوەی هەیە لێرە بڕوات. بـەڵام دەیتـوانی بۆ کوێ بڕوات؟ چۆن دەیتوانی بەم زانیارییەی بەدەستی هێناوە بۆ ئینگلتەرا بگەڕێتەوە؟
ئالبێرت بریج، نەیدەتوانی وێنەی ئەم پردە لـە هزریـدا پاك بکاتـەوە. سـێ پۆلیسی نهێنی دووپشك لە چاوەڕوانیدا. خاتوو جۆنز لەکاتی قسـە کـردن بـە بێسـیمێك. خیانـەت، هـەنگاو نانـەوە بـەرەو پێشـەوەی جـۆن رایـدەر و دوایی ئارام ئارام کەوتنە خوار و مردن.
ئەلێکس هەستی دەکرد کە نیفرەت و تووڕەیی هـەموو گیانی داگرتـووە. ئەمـە بـەهێزترین ئـەزموونێك بـوو کـە تـا ئێسـتا بەدەسـتهێنابوو. ئـەم پرسیارەی لا دروست ببوو کە ئایا ئەگەری ئەوە هەیە رۆژێك بتوانێ بـۆ ژیـانی ئاسایی خۆی بگەڕێتـەوە. واپێدەچوو هـیچ شـوێنێکی بـۆ رۆیشتن نەبوو. رەنگە ئەگەر هەنگاوێکی دیکە بەرەو پێشـەوە دەچوو، بە قازانجی هەموویان کاری کردبوو. هەر ئێستا رێك لەسەر لێواری سەکۆ وەستابوو. بۆچی رێگە بە شەو نەدا بۆئەوەی گیانی لێ بستێنێ؟
– ئەلێکس؟
دەنگی نزیك بوونی کەسی گوێ لێ نەببوو. سەیری دەوروبەری خۆی کرد و نیلی بینی کـە لـە تەنیشـتی وەستاوە و دەسـتێکی بـە چوارچێوەکەوە گرتووە.
– بەدواتدا دەگەڕام، ئەلێکس. چی دەکەی؟
– خەریك بووم بیرم دەکردەوە.
– پرۆفیسۆر یرمالۆۆ وتی تۆی بینیوە کە بۆ ئێرە هـاتووی. نـابێ بـۆ ئێـرە بێی.
ئـەلێکس چاوەڕوانی ئـەوە بوو نیـل هـەنگاوێکی دیکـە بـۆ پێشـەوە بچـێ، بەڵام ئەو لە شوێنی خۆی وەستابوو.
ئەلێکس وتی:
– تەنیا دەمویست لەگەڵ خۆم تەنیا بم.

- وابزانم باشتر وایە بێیتە خوارەوە. ڕەنگە بکەوی.

ئەلێکس نەختێك وەستا و دوایی سەری بە نیشانەی بەڵی دانەواند.

- زۆر باشە.

ئەلێکس بەدوای نیل لە پەیژەکان چووە خوارەوە تا بە تەواوی گەیشتنە خوارەوە.

نیل وتی:

- پرۆفیسۆر دارك دەیهەوێ بتبینێ.

- کە ڕەتم بکاتەوە.

- بۆچی دەبێ ئاوا بیر بکەیتەوە. تۆ زۆر باش بوویە. هەموویان لێت ڕازین. دوو هەفتە نابێ کە لێرەی، بەلام پێشکەوتنێکی بەرچاوت هەبووە. پێکەوە و بەپێیان بەرێکەوتن. چەند قووتابی لە تەنیشتیانەوە تێپەڕین و سلاویان کرد. ڕۆژی پێشتر ئەلێکس ئەوانی بینیبوو کە بە شەمشێر ڕکابەریان دەکرد. مرۆڤکووژی مەترسیدار بوون. هاوڕێی ئەو بوون. ئەلێکس بەدوای نیل چووە ناو دێر و چوونە ناو ژووری دارك.

وەکوو هەمیشە، بەڕێوەبەری فێرگە لەپشت مێزەکەی دانیشتبوو. وەکوو هەمیشە وردبینانە سەیری دەکرد. ڕیشی بەڕێکی شانە کردبوو.

- تکایە دانیشە، ئەلێکس.

دوایی پەنجەی خستەی سەر چەند دوگمەی لابتۆپەکەی و لە پشت چاویلکەوە سەیری مۆنیتۆری کۆمپیوتەرەکەی کرد.

- ئەنجامەکانی تۆم لێرە بینی. بێشك زۆر خۆشحاڵ دەبی کە بڵێم هەموو مامۆستاکان لەبارەی تۆدا زۆر بەباشی دەدوێن.

دوایی بە دەنگێکی جددیانەتر وتی.

- تەنیا کێشەی تۆ بارودۆخی دەروونییە.

ئەلێکس قسەیەکی نەکرد.

دارك وتی:

- ئەم بەرنامەی کووشتن. کاتێك یەکەمجار تۆم بینی، قسەکانتم گوێ دایە. زۆر کار هەیە کە بتوانی بۆ دووپشك بەڕێوەیان ببەی. بەڵام ئێمە لەگەڵ بوارێك ڕووبەڕووین، کوڕی خۆشەویستم. تۆ لە کووشتن دەترسێی، کەواتە لە دووپشك دەترسێی. تۆ بەجۆرێك لەگەڵ ئێمە نی و لەوەش دەترسێم کە تا کۆتاییش لەگەڵمان نەبی. ئەمە جێگەی ڕەزامەندی نییە.
- یانی دەڵێن لێرە بڕۆم؟
- نا، بەهیچشێوە. تەنیا ئامۆژگاری من بەتۆ ئەوەیە کە نەختێك زیاتر متمانەمان پێ بکەی. من بەدوای ڕێگەیەك دەگەڕێم کە تۆ هەست بکەی بە تەواوی لەگەڵ ئێمەی و وابزانم وەڵامەکەیشم وەرگرتووەتەوە.

دارك کۆمپیوتەرەکەی کووژاندەوە و لە پشت مێزەکەی هاتەدەر. کۆت و پانتۆڵێکی دیکەی لەبەر بوو. ئەو هەر ڕۆژەی کۆت و پانتۆڵێکی نوێی لەبەر دەکرد.

- دەبێ فێری کووشتن بی. دەبێ بێ کەمترین دوودڵی بتوانی مرۆڤ بکووژی. کاتێك جارێك کەسێك بکووژی، ئاگاداری ئەوە دەبییەوە کە ئەوەندەش سەخت و دژوار نییە. وەکوو ئەوە دەچێ خۆت هەڵدەیتە ناو مەلەوانگەیەك. بەم ئاسانییە. بەڵام ئەگەر بتهەوێ یەکێك لە ئێمە بی، دەبێ لەم بەربەستە تێپەڕی، ئەلێکس.

دارك دەستی بەرز کردەوە.

- دەزانم کە زۆر جاحێڵی. دەزانم کە کارێکی ئاسان نییە. بەڵام دەمهەوێ یارمەتیت بدەم. دەمهەوێ کارێی بکەم بۆتۆ دژوار نەبێت و وابزانم توانایی ئەمکارەم هەیە.
- بەیانی بۆ ئینگلتەرا دەتینێرم. هەمان شەو تۆ یەکەمین ئەرکی پێسپێردراوی خۆت بۆ دووپشك بەڕێوەدەبەی. ئەگەر ئەرکەکەت بەتەواوی بەجێگەیاند، دەزانی کە ئەندامێکی دووپشکی و ئێمەش دەتوانین متمانەت پێ بکەین. بەڵام هەواڵێکی خۆشم پێیە.

دارك بزەیەکی هاتێ.

– ئێمە کەسێك هەڵدەبژێرین کە تۆ دەزانی لەڕاستیدا شایستەی مردنە. ئەو کەسەیە کە دەبێ حەقی خۆتی لێ بستێنی. هیوادارم لە کارەکەتدا سەرکەوتوو بی.

– خاتوو جۆنز، جێگری چالاکیی تایبەتی (ئێم ئای٦). ئەو هەمان کەسەیە کە لە کووشتنی باوکتدا بەرپرسیارە.

– ئێمە دەزانین لە کوێ دەژیت. یارمەتیت دەدەین کە ئەو بدۆزیتەوە. ئەو هەمان کەسەیە کە دەمانهەوێ بیکووژی.

## "سەرۆک وەزیرانی ئازیز...."

ڕێك بەر لە کاتژمێر چواری دوانیوەڕۆ پیاوێك لە وایت هال[١٢٤] لە تاکسی هاتەخوار، بیست پاوندییەکی نوێی لە گیرفانی دەرهێنا و پارەی تاکسیەکەی دا و دوایی بەپێیان مەودای کەم تا شەقامی داونینگ[١٢٥]ی پێوا. ئەو گەشتەکەی لە پدینگتۆن[١٢٦] دەستپێکرد، بەڵام لە پدینگتۆن نەدەژیا. بە شەمەندەفەریش بۆ لەندەن نەهاتبوو. نزیك بە سی ساڵ تەمەنی هەبوو، مووی کورت و کۆت و پانتۆڵ و ریباتی لەبەر بوو.

بەپێ ڕۆیشتن تا شەقامی داونینگ نەدەکرا. چونکە مارگارێت تاچێر[١٢٧] بەربەست و دەروزایەکی زۆری دژە تیرۆریستیی لەم ڕێگەیە دانابوو. وەکوو هەمیشە، پۆلیسێك لەوێ وەستابوو. لە کۆتایی پۆستەکەی کە دەبووە کاتژمێر هەشت، نزیك بوو.

پیاوەکە بۆلای ئەو چوو و پاکەتێکی سپی لە باشترین جۆری کاغەزی پێدا. دوایی کاتێك پاکەتەکەیان گەڕا، دیار بوو کەسێك لە ناپلەوە ناردوویەتی.

لەگەڵ ئەوەیکە ئەو کەسەی کە پاکەتەکەی هێنابوو، پەنجەوانەی لەدەست نەبوو، بەڵام هیچ نیشانەیەکی پەنجەی لەسەر نەبوو. پەنجەکانی بە نەشتەرگەری ساف و لووس کرابوو بۆئەوەی هیچ شتێك لەخۆی بەجێنەهێڵێ.

– ئێوارە باش.

---

124 - Whitehall

125 - Downing

126 - Paddington

127 - Margret Thatcher

- من نامەیەکم بۆ سەرۆك وەزیران پێیە.

پۆلیسەکە زیاتر لە سەد جار ئەم رستەیەی گوێ لێببوو. زۆرکەس پێویستی بە یارمەتی بوو. نامەکانیان بۆ ئێرە دێنا و ئومێدەوار بوون کە بە دەستی سەرۆك وەزیران بگات. پۆلیسەکە بەپێی فێرکرانەکەی بۆکاتی ئاوا، هاورێیانە دەدوا.

- سوپاست دەکەم، بەرێز. نامەکەم بدەیە بۆئەوەی بیگەیەنمە دەست سەرۆك وەزیران.

پۆلیسەکە نامەکەی وەرگرت. تەنیا نیشانەی پەنجەکانی پۆلیس لەسەر پاکەتەکە دەمایەوە.

*بۆبەرێز سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا، ژمارەی ١٠، شەقامی داونینگ.*

پۆلیس نامەکەی بەرێکرد بۆئەوەی ئەوەی بگاتە دەست یەکێك لە سکرتێرەکانی کە دەبوایە بیخوێنێتەوە و ئەگەر پێویست بوایە، نامەکەی دەدایە بەشی تایبەت. وەکوو هەمیشە ئەو کەسەی نامەکەی دەنارد، لە ماوەی چەند خوولەکێك وەلامی وەردەگرتەوە.

بەلام ئەم نامەیە لەگەل نامەکانی دیکە جیاواز بوو.

کاتێك ئەفسەری کێشکگر پاکەتەکەی وەرگرت، سەیرێکی کرد و چاوی لە وێنەی دووپشکی رەنگ سیلڤەر لە لایەکەی دیکەی پاکەتەکە کەوت. زۆربەی تاوانکاران و رێکخراوەکانی تیرۆریستی لە وێنەکانی جۆراوجۆری ئاژەلان وەکوو ئارمو لۆگۆ کەلکیان وەردەگرت. مەبەستیان ئەوەیە خێرا بناسرێن بۆئەوەی بەرپرسان بە جددی وەربگرن. ئەفسەری کێشك ئێستا بە دیتنی وێنەی دووپشك دوگمەی زەنگی مەترسی پالدا و پێنج شەش پۆلیسی دەرەوەی بە حالەتی ئامادەباش دەرهێنا.

- چ کەسێکئەم نامەیەی هێنا؟
- کەسێکی ئاسایی.

ئەو پۆلیسەی کە نامەکەی وەرگرتبوو، تەمەنێکی مامناوەندی هەبوو واپێدەچوو دوایین رۆژەکانی کاری خۆی تێپەرێنێت و ئێستا بە

وەرگـرتنی ئـەم نامەیـە، رەنگـە زەمـەنی کۆتـایی کارەکـەی زۆر نـزیکتر بووبێت.
پیاوێکی گەنج بوو، کۆت و پانتۆڵ و ریباتی پۆشیبوو.
– برۆن و ئەم دەوروبەرە بگەڕێن. رەنگە بتوانن بیدۆزنەوە
بەلام ئیتر زۆر درەنگ ببوو. هەر کە پیاوەکە نامەکەی بە دەستی پۆلیس گەیاندبوو، تاکسییەکی دیکە گەیشتبوو و لەوێ دووری کردبۆوە. ئـەم تاکسییە لەڕاستیدا تاکسیەکی فەرمی نەبوو. ژمارەکەشی دەستکرد بوو. نیو مایل ئەولاتر، پیاوەکە دووبارە لە تاکسی هاتبووەخوارێ تا لەنێوان ژماری زۆری جەماور کە لە وێسگەی چرینگ کراس(١٢٨) دەهاتنە دەرێ، ون بێت. مووی سەری ئێستا بەرەنگی قاوەیی پڕرەنگ بوو، کۆتکەی گۆڕیبوو و چاویلکەی دژە خۆری لەچاو دابوو. ئیتر کەس ئـەوی نەدەناسییەوە. تا کاتژمێر پێنج و نیوی دوانیوەڕۆ کاری پشکنینی پاکەتی نامەکەیان بە کۆتایی گەیاندبو، بەلام هیچ نیشانەیەکیان لە جێپەنجە نەدۆزیبۆوە. سەرۆك وەزیران لەناو ولاتدا نەبوو، ئەو بۆ مەکسیکۆ سیتی(١٢٩) رۆیشتبوو بۆئەوەی لەگەڵ رێبەرانی دیکەی جیهان لە کۆبوونەوەیەك لەبارەی ژینگەپارێزی بەشداری بکات.
بەلام لەناوەندی کۆبوونەوەکەدا ئەویان بانگ کردە دەرەوەی هۆڵی کۆبوونەوە بۆئەوەی باسی نامەکەی بۆ بکەن. ئێستا ئەو بۆ ولات دەگەڕایەوە.
لەم کاتەدا، دوو پیاو لە ژووری تایبەتی دانیشتبوون. یەکێك لەوان سکرتێری هەمیشەیی کابینە بوو. ئەویتریان بەرێوەبەری پەیوەندییەکان بوو. هەرکام نوسخەیەکیان لەم نامە بەدەستەوە بوو.
لەناو نامەکەدا ئاوا نووسرابوو:

---

128 - Charing Cross
129 - Mexico sity

سەرۆك وەزیرانی بەڕێز،
بەوپەڕی داخەوە، دەمانهەوێ تیرۆر و مەتەرسی بۆ ولاتی ئێوە بێنین.
ئێمە لەلایەن ولاتێکی بیانی بۆ ئەم کارە راسپێردراوین کە دەیەوێ هاوسەنگییەکی نوێ لە هێز و دەسەلاتی جیهانی پێکبێت. داواکارییەکانی ئەم ولاتە بەم شێوەیەیە.
١- ئەمریکاییەکان دەبێ هەموو هێزی خۆیان لە گشت ولاتەکانی جیهان بێننەدەر. ئەمریکاییەکان ئیتر مافی ئەوەیان نییە وەکوو رۆلی پۆلیسی نێودەولەتی رۆل بگێرن.
٢- ئەمریکاییەکان دەبێ خێرا رابگەیەنن کە تەواوی بەرنامەکانی تایبەت بە بەرهەمهێنانی سیلاحی ناوەکی وەلادەنێن. ئێمە شەش مانگ کاتیان پێ دەدەین. لە کۆتایی ئەم شەش مانگە ئەوان دەبێ سیلاحی ناوەکیان نەمێنێ.
٣- بڕی یەك ملیار دۆلار بدرێتە بانکی جیهانی بۆئەوەی بدرێتە ئەو ولاتانەی کە لە شەڕەکانی ئەم دواییە زیانیان پێ گەیشتووە.
٤- سەرۆك کۆماری ئەمریکا دەبێ خێرا واز لە سەرۆکایەتی بێنێ.
سەرۆکی وەزیران رەنگە بەلاتانەوە سەیر بێ کە بۆچی ئەم نامەیە بۆ ئێوە ناردراوە. هۆیەکی زۆر سادە وئاسایی هەیە. ئێوە باشترین دۆستی ئەمریکان. ئێوە پشتگیری لە سیاسەتی ئەوان دەکەن. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە ئەوانیش بەم رادەیە بەئێوە وەفادار بن.
ئەگەر ئەوان بەپێی ویستی ئێمە هەلسووکەوت نەکەن، ئێوە تاوانەکەی دەدەنەوە.
ئێمە دوو رۆژ سەبر دەکەین و ئەگەر رێکتر بلێین، چل و هەشت کاتژمێر کاتت دەدەینێ. دەسپێکی ئەم چل و هەشت

کاتژمێره لەوکاتەوە دەست پێدەکات کە ئەم نامەیە دراوەتە ئێوە. لەم ناوەدا، چاوەڕوانی ئەوەین کە سەرۆك کۆماری ئەمریکا بە پێی ویست و داخوازی ئێمە بجووڵێتەوە. ئەگەر ویلایەتی ئەمریکا ویستی ئێمە پێشێل بکات، ئێمە خەڵکی بەریتانیا بە توندترین شێوە سزا دەدەین.

دەبێ ئەمەش بڵێین، جەنابی سەرۆك وەزیران، کە ئێمە سیلاحێکی نوێمان دروست کردووە کە ناوی "شەمشێری نادیار"ە. ئەم سیلاحە ئێستا چالاکی خۆی دەست پێکردووە. ئەگەر سەرۆك کۆماری ئەمریکا لەماوەی دیاریکراودا هەر چوار داخوازی ئێمە بەڕێوەنەبات، ڕێك کاتژمێر چواری دوانیوەڕۆی ڕۆژی پێنجشەمە ژمارێکی زۆر لە قووتابیانی لەندەنی دەکووژرێن؟ قسەی من قبوول بکەن کە ئەمە راست و درووستە. تەکنەلۆژی ئامادەیە و ئامانجەکان دیاری کراون. ئەمە هیچکات هەڕەشەیەکی لەخۆوە نییە.

هەڵبەت ئاگاداری ئەوە هەین کە ڕەنگە بە هێزی شەمشێری نادیار دوودڵ بن. هەربۆیەش بەرنامەیەکمان بۆ نمایش سەبارەت بە جەنابت پێکهێناوە. ئەمشەو هەڵبژاردەی دووهەمی ئینگلتەرا لە نیجریا[130] بۆ بەریتانیا دەگەڕێتەوە. کاتێك ئێوە ئەم نامەیە دەخوێننەوە، ئەوان گەشتەکەیان دەست پێکردووە و لە ئاسمان دان.

ئەوان بڕیارە کاتژمێر حەوت و پێنج خوولەك بگەنە ناو فڕۆکەخانەی هیترۆ. لە کاتژمێر حەوت و پازدە خوولەکی ئەمشەو هەر هەژدە یاریزان لەگەڵ راهێنەرەکەیان دەکووژرێن.

---

130 -Nijiria

*ئێوە ناتوانن پێش لە کوژرانیان بگرن. تەنیا دەتوانن چاویان لێبکەن کە چۆن دەمرن. هیوادارم بەم هەواڵەی ئێمە بزانن کە دەبێ قسەکانی ئێمە بە جددی وەربگرن. پێویستە بە خێرایی ڕەزامەندی ئەمریکا پێکبێنن کە بەگوێمان بکات. تەنیا بەم شێوەیە دەتوانن پێش لە کووشتنی ژمارێکی زۆر لە لاوەکانی خۆتان بگرن.*
*ئێمە نوسخەیەکمان لەم نامەیە بۆ بالیۆزخانەی ئەمریکا لە ئینگلتەرا ناردووە. ئێمە گوێ لە تەلەڤزیۆنی ئێوە رادەگرین. پێویستە وەڵامی ئێمە بە راگەیاندنێك بدەنەوە. پەیامی دیکەتان لەلایەن ئێمە بەدەست ناگات. جارێکی دیکە دووبارەی دەکەینەوە، خواستی ئێمە بۆ دانوستان نابێ. ژماری پێچەوانە پێشتر دەستی پێکردووە.*

*بەرێزەوە*
*دوویشك*

بێدەنگییەکی تەواو ژوورەکەی گرتەوە. تەنیا دەنگی تیك تاکی کاتژمێری قەدیمی سەر دیوار بێدەنگی دەشکاند. دوو پیاو بۆ چوارەمین و پێنجەمین جار نامەکەیان خوێندەوە. هەر دووکیان ئاگایان لە یەکتر بوو کە بزانن چۆن کاردنەوەیان دەبێ. ئەم دووە جیاوازی سەرەکیان بەیەکەوە هەبوو و کەیفیان بە یەکتر نەدەهات.
سێر گراهام ئەدێر[١٣١] ماوەیەکی زۆر پێشوو لە فەرمانبەرەکانی حکوومی بوو. ئەو ئەندامی حکوومەتێکی تایبەتی نەبوو، بەڵام هەمیشە بۆ حکوومەت کاری دەکرد.

---

[131] - Sir Graham Adair

راوێژکار بوو و بە وتەی هەندێ کەس بابەتی ئەوتۆی کۆنترۆڵ دەکرد. بەڵام ئێستا قۆناغی شەستساڵی تێدەپەڕاند. مووی سەری سپی و ماش و برنج بوو و ڕووخساری هەستەکەی بە نمایش دەردەهێنا. ئەو وەکوو هەمیشە بەشێوەکانی پێشوو کۆت و پانتۆڵێکی کۆنی لەبەر بوو. ئەو هیچکات تا لەبارەی بوارێك بەباشی لێکدانەوەی نەکردبا، هیچ قسەیەکی نەدەکرد و ڕای خۆی دەرنەدەبڕی. ئەو لەماوەی خزمەتی خۆیدا کاری لەگەڵ شەش سەرۆك وەزیر کردبوو و لەبارەی ئەواندا بیروڕای جیاوازی هەبوو. بەڵام جۆری بیرکردنەوەی خۆی، تەنانەت لای ژنکەشی باسی نەدەکرد. ئەو فەرمانبەرێکی بێ کەموکوڕی بوو. ئەو لەکاتێدا یەکێك لە بەهێزترین کەسی وڵات بوو، شانازی بەوە دەکرد کە زۆر بە دەگمەن کەس ناوی دەزانێ.

کاتێك سێر گراهام بۆ یەکەمینجار هاتە ناو شەقامی داونینگ، بەڕێوەبەری پەیوەندییەکان هێشتا لەدایك نەببوو. مارك کێلنر[١٣٢]، لەو ڕاوێژکارانە بوو کە سەرۆك وەزیران ڕەزامەندی لە ڕاوێژی ئەو بوو. ئەو پیاوێکی بەدەسەڵات بوو. مارك لەگەڵ هاوسەری سەرۆك وەزیران لە زانکۆیەك وانەی ئابووری و زانستی سیاسی خوێندبوو. ئەو ماوەیەك لە تەلەڤزیۆن کاری کردبوو، تا ئەوەیکە بانگ کرا پۆستێك لەناو حکومەت وەربگرێت و بەختی خۆی تاقی بکاتەوە. ئەو پیاوێکی کورتەباڵا بوو کە چاویلکەی لێدەدا. ئەویش کۆت و پانتۆڵی لەبەر کردبوو. وردە کرێژی سەری ڕژابوونە سەر شانەکانی.

ئەوە کێلنر بوو کە بە وشەیەك بێدەنگی شکاند. سێر گراهام سەیری کرد. ئەو هیچکات وشەی ئەمجۆرەی بەکار نەدەهێنا.

ئێستا کێلنر وەقسە هات.

- ئێوە بڕوا بەم گاڵتەجاریانە ناکەن؟

سێر گراهام وەڵامی دایەوە:

---

132 - Mark Kellner

– ئەم نامەیە لەلایەن دووپشکەوە نووسراوە. لە رابردوودا بەشێوەی راستەوخۆ لەگەڵیان رووبەڕوو بوومەتەوە و تا ئەو جێگەیە دەزانم، ئەوان هەر لەخۆیانەوە هەڕەشە ناکەن.

– یانی ئەوە قبووڵ دەکەن کە سیلاحێکی نەناسراویان داهێناوە. شەمشێرێکی نادیار؟

مارك کێلنر نەیدەتوانی شێوازی گاڵتەجاری ناو دەنگی بشارێتەوە.

– بەم پێیەوە، دەیانەوەی چی بکەن. گۆچانێکی سێحراوی بجووڵێنن و هەموو کەس بمرێ؟

– هەر ئەمجۆرەی کە پێشتر وتم، بەڕێز کێلنر، بە بڕوای من دووپشك ئەگەر شتێکی لەبەردەستدا نەبوایە، ئەم نامەیەی نەدەنووسی. ئەوان مەترسیدارترین تەشکیلاتی تاوانکاری لە جیهان دان. لە مافیا[١٣٣] گەورەترن. زۆر بێ رەحمن.

– باشە، ئێوە بڵێن چ جۆرە چەکێك دەتوانێ بوونی هەبێ کە منداڵان بکاتە ئامانجی خۆی؟ هەزاران قووتابی – ئەمە ئەو قسەیە کە ئەوان دەیکەن. بەم حسێبە، دەیانهەوێ چی بکەن؟ ئایا دەیانهەوێ لە یاریگای منداڵاندا بۆمب بتەقێننەوە؟ رەنگیشە بیانهەوێ بە قومبەلەی دەستی هێرش بکەنە قووتابخانەکان.

– ئەوان دەڵێن سیلاحەکەیان چالاك کراوە!

کێلنر یەك دووجار نامەکەی بە تووڕەیی راوەشاند کە لەناو دەستی دابوو.

– هیچ چەك و سیلاحێك لەئارادا نییە و تەنانەت ئەگەر سیلاحێکیش بوونی هەبوایە، داواکارییەکەیان شتێکی لەخۆوە و فشە بوو. سەرۆك کۆماری ئەمریکا واز لە پۆستەکەی ناهێنێ.

دوایی ئایا دووپشك پێیوایە ئەوان بە هەڕەشەی ئەم رێکخراوە تیرۆریستیە چەك لەخۆیان دادەماڵن. ئەمریکییەکان عاشقی چەك و

---

133 - Mfia

سیلاحن. ئەوان زیاتر لە هەموو وڵاتێك سیلاحیان کۆ کردووەتەوە. ئەگەر ئەم نامەیەیان پێ نیشان بدەین، پێمان پێدەکەنن.

– (ئێم ئای٦) پێیوایە ئەم سیلاحە بوونی هەیە.

– ئێوە قسەتان لەگەڵ ئەوان کردووە.

– ئێوارەی ئەمڕۆ تەلەفۆنی قسەم لەگەڵ ئالان بلێنت کردووە. نوسخەیەك لە نامەکەشم بۆ ئەو ناردووە. ئەویش وەکوو من پێیوایە کە دەبێ ئەم بارەدۆخە زۆر بەجددی وەربگرین.

کێلنر وتی:

– سەرۆك وەزیران گەشتەکەی بۆ مەکسیك کوورت کردووەتەوە. ئێستا کە بەیەکەوە قسە دەکەین، ئەو لەناو فڕۆکە دایە. هیچ شتێکمان لەوە جددیتر پێشك نایات!

سێر گراهام وتی:

– دەبێ خۆشحاڵ بین کە سەرۆك وەزیران گەشتەکەی کوورت کردووتەوە. بەڵام بەبڕوای من ئەم فڕۆکەیە دەبێ بخرێتە چاودێری کە یاریزانەکان دێنێیەوە. من لەگەڵ کۆمپانیای برتیش ئایرویز[١٣٤]یش قسەم کردووە. فڕینی ژمارە ٠٠٧٤ لە لاگوس[١٣٥] وەستانی هەبووە و ئەمڕۆ دوانیوەڕۆ فڕینی دەست پێکردووە. کەمێکی ماوە بۆ کاتژمێر دوازدە بە کاتی ئێمە. دەبێ پێنج خوولەك دوای کاتژمێر حەوت لە هیترۆ بنیشێ. ڕێك ئەمجۆرەی کە نامە دەڵێت. هەڵبژاردەی دووهەمی تۆپی پێی ئینگلتەراش لەناو فڕۆکەکە دان.

کێلنر پرسی:

– باشە، پێشنیارت چییە دەبێ چی بکەین؟

[134] - British Airways

[135] - Lagos

- بوارەکە زۆر سادەیە. هەرەشە لە فرۆکە کراوە کە لە هیترۆیە. دووپشك لانیکەم یارمەتی داین تا ئاگاداری شوێن و کاتەکەی ڕووداوەکە بین. بەم حسێبەوە، باشترە خێرا ڕێگەی هاتنی فڕۆکەکە بگۆڕین.
- دەتوانین فڕۆکەکە لە بیرمنگام[136] یا مانچستەر[137] بنیشێنین. یەکەم شت کە دەبێ گرنگی پێبدەین، دەبێ ئاگاداری سەلامەتی یاریزانەکان بین.
- بەداخەوە رای جیاوازم لەگەڵ تۆ هەیە.

سێر گراهام سەیری بەڕێوەبەری پەیوەندییەکانی کرد. زۆر بەسەیری. ئەو زۆر بە وردی قسەی لەگەڵ ئالان بلێنت کردبوو. هەر دووکیان بەرنامەیەکی ئەوتۆیان پێ باش بوو.

کێلنر وتی:

- ڕێگەم بدەن بیروڕای خۆم بڵێم. دەزانم کە ئێوە لە دووپشك دەترسن. ئەمەتان بە باشی نیشان داوە. من داواکارییەکانی ئەوانم خوێندووتەوە و دەزانم کە چەندە گێلانە قسە دەکەن. بەڵام بەهەرحاڵ ئەوان هەلێکیان بە ئێمە داوە تا دەستی ئەوان بخوێنینەوە. ڕێگەی گۆڕینی فڕۆکە و بردنی ئەم یاریزانانە بۆ یاریگایەکی دیکە، دوایین کارە کە دەیکەین. دەتوانین ڕێگە بدەین فڕۆکەکە کاری خۆی بکات. لێگەڕێن ئەوانیش شەمشێری نادیاری خۆیان تاقی بکەنەوە. ئەگەر شازدە خولەك دوای کاتژمێر حەوت هیچ شتێ ڕووی نەدا، ئەوکاتەیە کە دەبێ نامەی دووپشك بخەینە ناو زبڵدانەوە.
- یانی ئێوە ڕەزامەندیتان لەسەر ئەوەیە کە گیانی یاریزانان لە مەترسی بهاوێژین؟
- مەترسییەك لەئارادا نییە؟ دەوروبەری فڕۆکەخانە بەشێوەیەکی ئەمنیانە دەورە دەدەین بۆئەوەی هیچکەس نەتوانێ خۆی لەوێ نزیك بکاتەوە. ئەمجۆرەی لەنامەکەدا هاتووە، یاریزانان کاتژمێر حەوت و نیو

---

136 - Birmingham
137 - Manchester

دەکەونە ژێر هێرشەوە. دەتوانین ڕێك دیاری بکەین کە کێ لەناو فڕۆکە دایە. کاتێك فڕۆکە نیشت، سەد سەربازی چەکدار ئامادە دەکەین. دووپشك دەتوانێ سلاحەکەی خۆی دەربێنێت و ئێمەش پیلانی خۆمان دەبێ. هەرکەس بیهەوێ هەنگاوێك بەرەو فڕۆکەخانە بچێ، ئەوا دەستبەسەری دەکەین و دەیخەینە ناو زیندان. کۆتایی چیرۆکی هەڕەشەیەکی جددی.

سێر گراهام پرسی:

- چۆن دەتوانن سەد نیگابانی نوێ بنێرنە فڕۆکەخانە. بەمکارە خەڵکی دەترسێنن.

کێلنر بەدەم پێکەنینەوە وتی:

- وابیر دەکەنەوە توانایی ئەم کارەم نییە؟ دەڵێم بەرنامەیەکی ڕاهێنانم هەیە. هیچ کەس دوودڵی لا دروست نابێ.

ڕاوێژکاری هەمیشەیی کابینە ئاخێکی هەڵکێشا. جاریوایە بیری لەوە دەکردەوە کە بۆ ئەمجۆرە کارانە زیاتر لەڕادە پیر نەبووبێ. ئەمجارەش بەم ئەنجامە گەیشتبوو. تەنیا پرسیارێك مابوو کە ئەویش وەڵامەکەی دەزانی. ئەو پرسی:

- ئایا ئەم پیلانەت لەگەڵ سەرۆك وەزیران باس کردووە؟

- بەڵێ، لەکاتێکدا ئێوە قسەتان لەگەڵ (ئێم ئای٦) دەکرد، منیش لەگەڵ سەرۆك وەزیران قسەم دەکرد. ئەو بیروبۆچوونی منی بەدڵە.

- ئایا ئەو ئاگاداری ئەو مەترسییە هەیە کە ئەگەری ڕوودانی هەیە؟ ئەگەر هەر ئێستا دەست بەکار نەبین، ئیتر دوایی زۆر درەنگ دەبێ. ئەگەر ئەمجۆرەی من دەڵێم هەڵسووکەوت بکەین، دووپشك ناچار دەکەین کە دەستی روو بکات و خۆی نیشان بدات.

سێر گراهام ئەدێر لەجێگەی خۆی هەستایە سەرپێ.

- وا پێدەچی جێگەی گفتوگۆی تێدا نەماوە.

- باشترە پەیوەندی لەگەڵ (ئێم ئای٦) بگرن.

سێر گراهام بۆلای دەرگا بەڕێکەوت.

- هەڵبەت.
دوایی نەختێك وەستا و سەیری پشت سەری کرد.
- بەڵام ئەگەر ئێوە هەڵەتان کردبێ، چی روو دەدات؟ ئەگەر ئەم یاریزانانە بەڕاستی بکووژرێن، چی روو دەدات؟
کێلنر شانەکانی هەڵاویشت.
- لانیکەم ئاگادار دەبینەوە کە لەگەڵ چ کەسێك رووبەڕووین. لەمە بگوزەرێ، ئەوان گشت یارییەکانیان لە نیجریا دۆڕاندووە. بێشك توانای پێکهێنانی هەڵبژاردەیەکی دیکەمان هەیە.

ئەو فڕۆکەیەی کە لە فڕۆکەخانەی لەندەن نیشت، فڕۆکەیەکی بوینگی ٧٤٧ بە فڕینی ژمارە بی ئەی ٠٠٧٤ بوو. شەش کاتژمێر و سی و پێنج خولەك لە هەودا بوو. درەنگ فڕیبوو. نەختێك لە لاگوس مەعتەل ببوو. واپێدەچوو کێشەکە فەننی بووبێت، کە بێشك دووپشك پێکیهێنابوو. بۆیان گرنگ بوو کە فڕۆکە بەشێوەیەك بفڕی کە ئەوان دەیانهەوێ. فڕۆکە دەبوایە کاتژمێر حەوت و پێنج خوولەك بنیشێ. بەڵام فڕۆکە پێنج خوولەکی مابوو بۆ حەوت لە فڕۆکەخانە نیشت.
هەژدە یاریزانی تۆپی پێ لە بەشی دەرەجە یەکەمی فڕۆکە دانیشتبوون. سەبارەت بە دۆڕاندنەکانیان و ماندوویی سەبارەت بە مەعتەل بوونیان، هەستیان بە ماندوویی دەکرد. ئەم گەشتە هەر لە دەسپێکەوە تا کۆتایی کێشەیەکی گەورە بوو. یارییەکان گشتیان دۆستانە و نمایشی بوون، ئەنجامیشیان نەبوو، بەڵام ئەم گەشتە وەرزشییە تاڕادەیەك ئەوانی شەرمەزار کردبوو.
لەکاتێکدا کە یاریزانەکان لە ناو فڕۆکەدا فڕۆکەخانە و چراکانیان سەیر دەکرد، دەنگی فڕۆکەوان بەرز بۆوە.
- شەو خۆش بەڕێزان. بۆ فڕۆکەخانەی هیترۆ بەخێر بێن. جارێکی دیکە سەبارەت بەم دواکەوتنە داوای لێبوردنتان لێدەکەین. من هەر ئێستا لەگەڵ بوورجی ئاگاداری قسەم کرد و ئەوان وتیان بەهۆی چەند

هۆکارێکەوە دەبێ نەختێك دوورتر فڕۆکەکە بنیشێنم. لەم رووبەوە، چەند خوولــەکێك دەکێشـــێ تـــا بگەینـــە شـــوێنی دیـــاریکراو. تکایـــە لـــە کوورسییەکانی خۆتاندا بمێننەوە و قایشەکان بە بەستراوی بهێڵێنەوە. هەوڵ دەدەین لە کەمترین کاتدا گەشتیارەکان دابەزێنین.

ئێستا رووداوێکـی غـەریب رووی دا. لەکاتێکـدا فڕۆکـە بـۆلای پێشـەوە دەڕویشت، دوو جیپـی سـەربازی لـە دوولای فڕۆکـە بەڕێکـەوت. لـە پشـت جیپەکان، سەربازەکان بە موسەلسەلەوە دانیشتبوون. بە ئەمری بوورجی ئاگاداری، فڕۆکە لـە بینـا سـەرەکییەکان دوور کەوتـەوە. دوو جیـپ هێشـتا بەدوای فڕۆکەکەدا بوون.

ئـالان بلێنـت لەپشـت شووشـەیەك سـەیری دەکـرد و بـە دووربینەکـەی فڕۆکـەی ٧٤٧ی تەماشـا دەکـرد. ماوەیـەك بـوو نـە لەگـەڵ کـەس قسـەی کردبوو و نە غیرەتی هەناسە هەڵکێشانی هـەبوو. مەترسیدارتر لەوە نییە کە حکوومەتێك ئیهتمام بە بەشی خزمەتکاری ئاسایش و ئەمنیەتی خۆی نەدات. بلێنـت دەیزانی کـە سـەرۆك وەزیـران لـە دوو رێکخـراوی ئەمنیـەتی (ئێم ئای٥)١ و (ئێم ئای٦) دڵخۆشییەکی ئەوتۆی نییە. ئەنجامەکـەی ئەمـە بوو کە دەیبینی.

– باشە، ئێستا دەبێ چی بکەین؟

سـێر گراهـام ئـەدێر لای ئـەو وەسـتابوو. ئـەو ئـالان بلێـنتی زۆر بـاش دەناسـی. ئـەوان مـانگێ جارێـك کۆبوونەوەیـەکیان بەیەکـەوە دەبـوو تـا لـەبارەی بـواری ئاسایشـیی قسـە بکـەن، بـەڵام لـە یانەیـەکیش چـالاکی وەرزشیان هـەبوو و بەیەکـەوە یـاریی بریجیان دەکـرد. ئێسـتا ئـەو جارێـك سەیری ئاسمان و جارێك سەیری هێڵی فڕۆکەخانـەی دەکـرد. واپێدەچوو ئەگەری ئەوە هەبوو موشەکێك بە فڕۆکە بکەوێت کە بـە ئـارامی بـەرەوپێش دەچوو.

– بڕیارە تەماشای کووژرانی هەژدە کەسی بکەین.

– کێلنـر مرۆڤێکـی گێلـە، بـەڵام مـن نـازانم ئـەوان چـۆن ئـەم بەرنامەیـە بەڕێوەدەبن.

سێر گراهام نەیدەویست بڕوا بە قسەی ئەو بکات.

- فڕۆکە هەر لە کاتژمێر شەشەوە کەوتە ژێر کۆنتڕۆڵی تایبەتەوە. ژمارەی فەرمانبەرانی پاراستنمان سێ بەرامبەر کردووە. هەموویان ئامادەن و ئاگایان لە هەموو لایەکەوە هەیە. سەیری لیستی گەشتیارانت کردووە؟

بلێنت زانیاری لەبارەی هەموو ئەوانەدا هەبوو کە لەناو فڕۆکەکەدا بوون. سەدان پۆلیسی نهێنی لێکۆڵینەوەیان لەسەر دۆسیەی ئەم کەسانە کردبوو. زۆر بە وردی هەموو بوارەکەیان هەڵسەنگاندبوو. ئەگەر لەناو فڕۆکەدا تیرۆریست یا تاوانکارێکی تێدابا، دەبوایە بەناوی خوازراوەوە بێت و بەشێوەی غەیری فەرمی سوار بووبێت. هەروەها، فڕۆکەوان و میواندار ئاگادار کرابوونەوە کە هەر شتێکی بە گومانیان بینی، ئەوا ئاگاداریان بکەنەوە.

بلێنت بە دەنگێکی پڕ لە بێ قەراری وتی:

- پێشتر ئەم کارەم کردووە.

- هەروەها؟

- گەشتیارەکان، بازرگانەکان، بنەماڵەکان، دوو پسپۆری بواری کەش و هەوا، چێشتلێنەرێکی ناودار. واپێدەچێت کەس نازانێ ئێمە بەدوای کێدا دەگەڕێین.

- بەڵێ، پێم بڵێ.

- دووپشک هەر لەخۆوە قسە ناکات و ئەمشەو شایەدی ڕووداوێکی دڵتەزێن دەبین. بوارەکە بەم ئاسانییە نییە. ئەوان هیچکات نەبووە کارێک بڵێن و بەڕێوەی نەبەن.

سێر گراهام سەیری کاتژمێرەکەی کرد. نۆ خولەک لە کاتژمێر حەوت تێپەڕیبوو.

- ڕەنگە ئەمجارە ئەوەندە بۆیان ئاسان نەبووبێ. ڕەنگە ڕاگەیاندنی ئەم مەترسییە بەئێمە هەڵە بووبێت.

- ئەوان بۆیە ئەم مەترسییەیان ڕاگەیاندووە، چونکە دەزانن هیچ شتێک لەدەست ئێوە نایەت.

فڕۆکـه وەسـتا. دوو جیپەکـەش لـە دوولای فڕۆکەکـە وەسـتان. ئێسـتا چـەکدارێکی زیـاتر گەیشـتنە لای فڕۆکەکـە. دەورووبـەری فڕۆکـە پـڕ لـە پیـاوی چـەکدار بـوو. تـاك تیرهاوێـژ بـە دووربـینی سـەر تفەنگـەکانیان، پـۆلیس بـە سـەگەکانیانەوە لـەوێ وەسـتابوون. پارێزگـاری لـە گشـت دەرگاکـان دەکـرا. هـیچ کـەس رێگـەی هاتنـە دەر و چـوونە ژووری پـێ نەدەدرا.
شەست چرکەی دیکە تێپەڕی. بۆ کاتی دیاریکراو پێنج خوولـەکی دیکـەی مابوو.
فڕۆکەوانەکـە مۆتۆڕەکـانی کووژانـدەوە. لـەکاتی ئـاوادا گەشـتیاران زۆر بەپەلـە کوورسـییەکانیان جێـدێڵن و خێـرا بـەرەو جانتاکانیـان دەچـن و فڕۆکـە جێـدێڵن. بـەلام هـەموویان بـەم ئەنجامـە گەیشـتبوون کـە کێشـەیەك لەئارادایـە. فڕۆکـە لـە شـوێنێکی پـەرت وەسـتابوو. رووناکییـەکی زور دەوروبەری فڕۆکەیان رووناك کردبوو. ئۆتۆمبێلێك بە هێواشی لە فڕۆکەکە نزیـك بـۆوە و پەیـژەی فڕۆکـەی لەگـەڵ خـۆی هێنـابوو. لـە تەنیشـت ئـەم پەیژەیـە هێزەکـانی چـەکدار بـە ئۆنیفـۆرم و کـلاوی تایبـەت وەسـتابوون.
گەشتیاران دەیاندیت کە هێزەکانی چەکدار فڕۆکەیان دەورە داوە.
فڕۆکەوانەکـە دووبـارە قسـەی کـرد. بـە ئەنقەسـت دەنگـی خـۆی ئـارام و ئاسایی کرد.
– بـەڕێزان. واپێدەچـێ لـە هـیترۆ لەگـەڵ بـوارێکی نائاسـایی رووبـەڕوو بووینەتەوە. بەلام بوورجی ئاگادارکردنەوە پێیوایە هیچ کێشەیەك لەئارادا نییە. جێگەی نیگەرانی نییە. ئێستا دەرگای سـەرەکی فڕۆکە دەکەینـەوە. بـــەلام پیشـــنیار دەدەم لەســـەر کوورســـی خۆتـــان دانیشـــن تـــا ئـــەمری چوونەخوار وەربگرین. سەرەتا گەشتیارانی دەرجە یەك دابەزن. ریزەکـانی حەوت تا نۆ. ئەوانیتریش لە کاتێکی زۆر کەمدا دادەبەزن. تکایە ئەم چەند خوولەکەش هاوکاریمان بکەن.
پەیژەکـەیان بـە فڕۆکـە وەنـا. بلێنـت بینی کـە پیاوێـك کـە جلـی کـاریی پورتـەقاڵی لەبەر بوو، بەخێرایی لە پەیژەکە بەسـەر کـەوت و لـە تەنیشت

دەرگا وەستا. واپێدەچوو فەرمانبەری فڕۆکەخانەیە. بەڵام ئەو لە ئەسڵدا بۆ (ئێم ئای٦) کاری دەکرد. نزیك بە دوازدە سەربازێك پەیژەکەیان دەورە دابوو. نزیکترین بینا مەوداکەی پەنجا مەتر بوو.
لەم کاتەدا پاسەکە گەیشتێ. ئەم پاسە لەو دوو پاسانە بوو کە بۆ کاتێکی ئەوتۆ لە فڕۆکەخانە رادەگیران. واپێدەچوو هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ پاسەکانی دیکە نەبێ، بەڵام بەدەنەکەی قایمتر بوو و شووشەکانی دژە گولله بوون. بلێنت بەرپرسی هەموو ئەم چالاکیانە بوو کە لەگەڵ پۆلیس و بەشی پاسەوانی و بەڕێوەبەرایەتی فڕۆکەخانە ئامادەی کردبوو. هەر کە یاریزانەکان سواری پاسەکە ببان، پاسەکە ئەم شوێنەی فڕۆکەخانەی جێدەهێشت. پێویستی بەوە نەبوو ئەوان بچنە ریزی گومرگ و پشکنینەوە. لە دەرەوەی فڕۆکەخانە چەند ئوتۆمبێلی توندڕەو ئامادە کرابوون و بڕیار بوو یاریزانەکان بۆ ناوچەیەکی ئەمنی شاری لەندەن بگوازێتەوە.
یا لانیکەم هەموویان دڵیان بەوە خۆش کردبوو، تەنیا بلێنت بێ متمانەیی پێوەدیار بوو.
سێر گراهام بە لەسەرەخۆیی وتی:
– هیچ کێشەیەك لەئارادا نییە. تەنانەت کەسێکیشیان لێ نزیك نییە.
بەڵێ، ئەمجۆرە بوو. دەوروبەری فڕۆکە بەتاڵ بوو. تەنیا نزیك بە پەنجا سەرباز و پولیس دەبینران. بەڵام کەسێکی دیکەی لێ نەبوو.
– دووپشك چاوەڕوانی شتێکی ئاوا بوو.
– رەنگە یەکێك لە سەربازەکان.
سێر گراهام تا ئەمکاتە بیری لەم مەسەلەیە نەکردبۆوە، بەڵام ئێستا زۆر درەنگ ببوو.
بلێنت وتی:
– هەموویان پشکێنراو و کۆنترۆڵ کراون. بۆخۆم بە وردی ئاگاداری ناوەکانیان بووم.
– کەواتە بەخاتری خواش کە بووە –

دەرگای فڕۆکە کرایەوە.
میواندارێك لەسەر پەیژەکان بەدیار کەوت. ئێستا بینی کە بارودۆخەکە تا چ رادەیەك جددیە. هەر دەتگوت فڕۆکە لە گۆڕەپانێکی شەڕ و پێکدادان نیشتووە. فڕۆکە بە تەواوی دەورەی درابوو. پیاوانی چەکدار لە هەموو لایەك وەستابوون.
پۆلیسی (ئێم ئای٦) کە جلکی پورتەقاڵی رەنگی لەبەر بوو، چەند وشەیەك لەگەڵ میواندارەکە قسەی کرد و ئەو بۆ ناو فڕۆکەکە گەڕایەوە.
ئێستا یەکەم یاریزان هاتە سەر پەیژەی فڕۆکەکە. جانتای وەرزشی بەسەر شانی دادابوو.
سێر گراهام وتی:
– ئەو ئێدمۆند هیل – سمیت(١٣٨)ە، کاپتنی هەڵبژاردەیە.
بلێنت سەیری کاتژمێرەکەی کرد. چواردە خوولەك لە کاتژمێر حەوت تێپەڕیبوو.
ئێدمۆند هیل – سمیت، مووی کاڵی هەبوو. جەستەیەکی بەتوانای هەبوو. بەسەرسوورمانەوە سەیری دەوروبەری خۆی دەکرد. بەدوای ئەودا یاریزانەکانی دیکەش بەڕێکەوتن. یاریزانێکی رەش پێست کە چاویلکەیەکی لەچاو بوو، ناوی جەکسۆن بورك(١٣٩) بوو. ئەو گۆڵچی پێکهاتەکە بوو. دوایی یاریزانێکی هێرشبەر کە کڵاوێکی حەسیری بەدەستەوە گرتبوو. وادیار بوو لە بازاڕی نیجریا کڕیبووی. یاریزانەکان یەك بەدوای یەك لە فڕۆکە هاتنەدەر و لەسەر پەیژەکە بەڕێکەوتن. ئێستا هەر هەژدە یاریزان لە فڕۆکە هاتبوونەخوار. سێر گراهام سەیری لای چەپ و راستی خۆی دەکرد. هێرشەکە دەبێ لە کوێوە دەست پێبکات؟ کەس نەیدەتوانێ هیچکارێك بکات. هیل – سمیت و بورك گەیشتبوونە پاسەکە ئەوان لەناو پاسەکەدا بوون کە شوێنێکی ئەمن بوو.

---

138 - Edmaund Hill – Smith
139 - Jackson Burke

بلێنت سەیری کاتژمێرەکەی کرد. لە دووازدە خوولەك تێپەڕی. یەکێ لە یاریزانەکان، دوایین کەس کە لە فڕۆکە دابەزی، وادیار بوو بەلاداهات. سێر بینی کە سەربازێك گەڕایەوە، لەناو پاسەکە لەناکاو بورك بۆ دواوە کەوتەخوارێ. شانەکانی بە شووشەی پاسەکە کەوت.

یاریزانێك کە لەنیوەی پەیژەکانی فڕۆکە بوو، جانتاکەی بەردا و سینگی خۆی گرت. رووخساری لەبەر ئێش و ژان تێکچووبوو، ئەو لەوێڕا کەوتە خوارەوە و کەوتە سەر دوو کەس کە لەپێش ئەو بوون. بەلاّم واپێدەچوو ئەوانیش کەوتبوونە ژێر کاریگەری هێزی نادیار.

یاریزانەکان یەك بەدوای یەك کەوتنە خوارێ. هیچ دووژمنێك لەوێ نەبوو. هیچ کەسێ هیچ کارێکی نەکردبوو، بەلاّم هەژدە یاریزان لەبەردەم ئەوانەوە کەوتبوونە سەر زەوی. سێر گراهام بینی کە سەربازێك شێتانە بە بێسیمێك پەیامێك دەنێرێ. دوای ماوەیەکی زۆر کەم، کاروانێك لە ئوتۆمبیلی فریاگوزاری بە خێرایی گەیشتنە فڕۆکەکە. کەسێك چاوەڕوانی خراپترین بارودۆخ بوو. سێر گراهام سەیری بلێنتی کرد و زانی کە ئەو بووە.

بەلاّم ئوتۆمبێلەکانی فریاگوزاری زۆر درەنگ گەیشتبوونێ. کاتێك ئەمبولاّنسەکان گەیشتن، بورك دوایین هەناسەی هەڵدەکێشا. هیل – سمیتیش لە بارودۆخی ئەودا بوو و لە ڕێڕەوەکەی پاسەکەدا کەوتبوو.

پەیژەکە پڕ لە مەیت بوو. پیاوێك لەناو تەرمەکاندا وون ببوو. کلاّوە حەسیرییەکەی لەناو گۆڕەپانی فڕۆکەخانەدا خۆی دابووە دەست با و بۆ ئەملا و ئەولا دەچوو.

– چی بوو، چۆن ئەمە رووی دا؟

سێر گراهام وەلاّمێکی بۆ ئەم پرسیارانە نەبوو.

بلێنت وتی:

– شەمشێری نادیار.

رێك لە هەمان کاتدا، لە مەودایەکی کەم هەر لەم فڕۆکەخانەیەدا، گەشتیاران لە دەرگا هاتنە ژوورێ لە شوێنی کۆنتڕۆڵی پەساپۆرتدا،

ئەفسەری بەشی چاودێری پەساپۆرتەکان باوك و دایکێکی لەگەڵ منداڵێك بینی. کوڕەکە چواردە ساڵە بوو. کێشی زۆر نەبوو و پرچی سەری رەش بوو. چاویلکەیەکی رەشی لەچاو بوو و پێستێکی مەترسیداری هەبوو. لەسەر لێوی سەرەوەی سمێڵێکی تەنك و باریك دەبینرا. ئیتاڵی بوو. پەساپۆرتەکەی نیشان دا کە ناوی فدریکۆ کاسلی١یە.

ئەفسەری پەساپۆرت دەیتوانی وردتر سەیری کوورەکە بکات کە ناوی ئەلێکس رایدەر بوو. بەڵام ئەو دەیزانی لە گۆڕەپانی فڕۆکەخانەدا چی رووی داوە. هەمووی دەزانی. گشت بەشەکانی فڕۆکەخانە لە بارودۆخێکی مەترسیدارادا بوو. ئەو تەنانەت نەیویست سەیری رووخساری ئەو کووڕە بکات کە وێنەکەی لەنێوان گشت پاسەوانەکانی فڕۆکەخانە دابەش کراوە. ئەوشتەی لە دەرەوەی فڕۆکەخانە رووی دابوو، زۆر لەوە گرنگتر بوو.

دووپشك زەمەن و کاتی هەموو کارەکانی بەرێکی دیاری کردبوو.

کووڕەکە پەساپۆرتەکەی دەست دایە و بەڕێکەوت. لە گومرگ تێپەڕی و لە فڕۆکەخانە چووە دەرەوە.

ئەلێکس رایدەر بۆ ماڵەوە گەڕابۆوە.

## پێدانی پیتزا

پۆلیسەکانی نهێنی لەهەر شوێنێکن، دەبێ لە ئامادەباشیدا بن.
کەسێکی ئاسایی لەم رووییەوە خانوو یا ئاپارتمانێک هەڵدەبژێرێ کە بڕوانێتە سرووشتێکی جوان. بۆئەوەی شێوە و شکڵ و قەبارەی ژوورەکانی بەدڵ بێ. بۆئەوەی تێدا هەست بە خۆشی و حەسانەوە بکات. بۆ پۆلیسانی نهێنی یەکەم خاڵ، ئاسایش و خۆپاراستنە. رەنگە ژووری دانیشتنی زۆر خۆش و راحەت بێت، ئایا پەنجەرەکانی بەشێوەیەکە کە تاک تیرهاوێژ نەتوانێ تەقە لە ژوورەکەی بکات؟ باخ و باخچەیەکی زۆر خۆشی هەیە، بەمەرجێك بەربەستەکانی بەڕادەی پێویست بەرز بێت و دار و دارستانەکەی رێگە بەکەس نەدات بێنە ژوورەوە. دراوسێیەکان لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکرێ. پۆستەچی و شیرفرۆش و خزمەتکار و هەر کەسێك کە بیهەوێ بێتە لای دەرگا، دەبێ کۆنترۆڵ بکرێت. رەنگە دەرگای بیناکە پێنج قفڵی هەبێ. رەنگە سیستەمی دزگر و ئەلکترۆنی لەکاردابێ. رەنگە کامێرای شاراوە شەو و رۆژ هەموو شوێنێك کۆنترۆڵ بکات. کەسێك ماوەیەك پێشتر وتی قەڵای ئینگلیزییەك ماڵەکەیەتی، بەڵام بۆ پۆلیسێکی نهێنی دەتوانێ زیندانی ئەو بێت.
خاتوو جۆنز لە نهۆمی دووهەمی بینایەك لە کلرکنوێل[١٤٠]، لە مەودایەکی نزیك بە بازاڕی گۆشتفرۆشەکانی سمیتفیلدز[١٤١]، لە پێنت هاوسێکدا[١٤٢] دەژیا. بیناکە لەسەر یەك چل خانووی هەبوو.
٣- بینایەکی گەورە کە لەچەند بەشی گەورە و فراوان پێکدێت.

---

140 - Clerkenwell
141 - Smithfields
142 - Pent house

گرووپی پارێزگاریی (ئێم ئای٦) بەم ئەنجامە گەیشتبوو کە زۆربەی دانیشتوانی یا بانکدار و یا دادوەر و قازین کە لە شاردا کار دەکەن.
مێلبۆرن هاوس[١٤٣] جێگەیەکی هەرزان نەبوو. بینای خاتوو جۆنز دەهەزار مەتری چوارگۆشە بوو. لە نهومی سەرەوە دوو هەیوانی تایبەتی هەبوو و ئەمە لەحاڵێدا بوو کە ئەو بە تەنیایی دەژیا. ئەگەر بیویستبا ئەم بینا و ماڵە لە بازاڕی ئازاد بکرێ، دەبوایە زیاتر لە یەك ملیۆن پاوندی پێبدات.
ئەو ئەم بینایەی شەش ساڵ پێش کڕیبوو. بەڵام (ئێمە ئای٦) فایلی ئەوکەسەی لەبەردەستدا بوو کە بیناکەی دروست کردبوو وئەویش زۆر بە حەزەوە ئامادە ببوو بیناکە بە پارەیەکی کەمتر بفرۆشێ.
بیناکە زۆر بە باشی دەپارێزرا و لەم کاتەوە کە ئالان بلێنت بەم ئەنجامە گەیشتبوو کە جێگرەکەی دەبێ باشتر بپارێزرێ، ئاسایش و پاراستنی بیناکەی زیاتر کردبوو.
دەرگاکانی زۆر بەرز بوو. دوو داری هەنجیر و ئەسانسۆرێك لە کۆتایی حەوشەکەدا هەبوو. کامێرای شاراوە دانرابوون کە فیلمی لە هەرکەسێ هەڵدەگرتەوە کە لە بیناکە نزیك دەبۆوە. مێلبۆرن هاوس کرێکارگەلێکی هەبوو کە لەماوەی بیست و چوار کاتژمێر و هەفتانە حەوت رۆژەکەی کاریان دەکرد، بەڵام بلێنت هەموویانی لەگەڵ پۆلیسەنهێنییەکانی خۆی گۆڕیبۆوە.
ئەوانە تا ئەوکاتەی پێویست بایە، لەوێ دەمانەوە. تەنانەت لە پێش مێزی وەرگرتنی خەڵك ئامێرێکی دانابوو کە دەبوایە لەژێری تێپەڕن و هەرکەس ئاسنێك یا شتێکی زیادەی پێبا، ئەوا لێی ئاشکرا دەبوو، رێك وەکوو فرۆکەخانەکان.
دراوسێیەکان لەم بارودۆخە خۆشحاڵ نەبوون، بەڵام پێیان وترابوو بارودۆخەکە کاتییە و ئەوانیش بە منەت لەسەرنانەوە قبووڵیان کردبوو. ئەوان دەیانزانی کە ئەو ژنەی بە تەنیا لەم بینایە دەژیت، فەرمانبەرێکی

[143] - M elbourne ahuse

چالاکی حکومییە. ئەوان هەروەها فێر ببوون پرسیاری زیادە لەڕادە نەکەن.

ئەگەری ئەوە نەبوو کەسێك بێتە مێلبۆرن هاوس و لەژێر ئامێرەکەی دوو پاسەوانەکە تێنەپەڕێت.

بۆ گواستنەوەی بار و ئەشیای ماڵەوە و شتی ئەمجۆرە، دەرگایەك لە لایەکی دیکەی بیناکەدا هەبوو. بەڵام ئەم دەرگایە هەمیشە داخرابوو و زەنگی مەترسیداری لەسەر دانرابوو. بیناکە بەشێوەیەك بوو کە کەس نەیدەتوانی لێی بچێتەسەر. دیوارەکان کەلێن و درزی تێدا نەبوو. لەوە بگوزەرێین بەردەوام چوار پاسەوانی چەکدار پارێزگاریان لە بیناکە دەکرد. هەروەها پاسەوانێکیش رێك لەبەردەم خانووی خاتوو جۆنز کێشکی دەدا. ئەم پاسەوانە دەیتوانی هەر دوولای ڕێڕەوەکە ببینێ. هیچ جێگەیەکی بۆ خۆشاردنەوە نەبوو. پاسەوانەکە سیلاحێکی سەیری پێبوو کە بەشێوەی ئوتۆماتیك بوو و بە پەنجەکانەوە حەساس بوو. تەنیا ئەو دەیتوانی تەقەی پێبکات و ئەگەر تووشی ڕووداوێك ببایە و سیلاحەکە کەوتبایە دەست کەسێکی دیکە، ئەوا نەیدەتوانی بەکاری بێنێ و تەقەی پێبکات.

خاتوو ئەم هەموو پاراستن و هەوڵانەی بەدڵ نەبوو و تەنیا چەند جارێکیش دەمەقاڵێی لەگەڵ بەڕێوەبەرەکەی کردبوو.

– تۆخوا ئاگاداری ئەوە بە، ئێمە لەبارەی ئەلێکس رایدەر قسە دەکەین.

– نا، خاتوو. ئێمە لەبارەی دووپشك دەدوێین.

ئیتر دوای ئەوە دەمەقاڵێ و گفتوگۆ کۆتایی پێهاتبوو.

ئەم شەوە لە کاتژمێر یازدە و نیو، چەند کاتژمێر دوای کوشتارەکەی فڕۆکەخانەی هیترۆ، دوو پۆلیسی نهێنی لەپشت مێزەکەیان دانیشتبوون. هەردووکیان قۆناغی بیستساڵیان تێدەپەڕاند و ئۆنیفۆرمی نیگابانیان لەبەر بوو. یەکێکیان خەپە بوو، پرچی کوورت بوو و رووخساری منداڵانە

بوو. واپێدەچوو هیچکات خووی بە ریش تاشینەوە نەکردبوو. ناوی لۆید[144] بوو. ئەو زۆر خۆشحاڵ بوو کە لە زانکۆوە هاتبووە (ئێم ئای٦)، بەڵام زۆر زوو لە کارەکەی نائومێد بوو. بۆنموونە ئەمە ئەمکارە نەبوو کە ئەو چاوەڕوانی لێدەکرد. پۆلیسەکەی دیکە رەش پێست بوو و بیانی دەهاتەبەرچاو. دەکرا وەکوو یاریزانێکی رەشی بەڕازیلی سەیری بکەی. جگەرەیەکی لەسەر لێوان بوو، هەرچەند کێشانی جگەرە لەوێ قەدەغە بوو و ئەمە لۆیدی دڵگران دەکرد. ناوی ئەویش رامیرێز[145] بوو.

هەرچەند دوو کاتژمێرێك بوو کاریان دەستی پێکردبوو و دەبوایە تا کاتژمێر حەوتی بەیانی لە شوێنی دیاریکراو نیگابانی بدەن. خاتوو جۆنز کاتژمێر حەوت بیناکەی جێدەهێشت. ماندوو و دڵگران ببوون. تا ئەو جێگەیەی ئەوان دەیانزانی کەس ناتوانێ خۆی بە بەڕێوەبەرەکەیان بەگەیەنێ، ئەویش لە نهومی نۆهەمدا. هەروەها لە هەموو ئەمانە خراپتر، پێیان وترابوو کە دەبێ ئاگایان لە کوورێکی تەمەن چواردە ساڵە بێت. وێنەیەکی ئەلێکس رایدەریان پێدابوون. هەر دووکیان پێیان وابوو کە بەرنامەیەکی گاڵتەجاریانەیە. بۆچی منداڵێکی قووتابی دەبێ بیهەوێ جێگری بەڕێوەبەری چالاکییەکانی تایبەت بکووژێ؟

لۆید وتی:

– رەنگە خاتوو جۆنز پووری بێت. لەبیری کردووە بۆ ساڵرۆژی لەدایك بوونی دیاری بکڕێت و ئێستا دەیەوێ تۆڵە لە پووری بستێنێتەوە.

رامیرێز دووکەڵی جگەرەی بەشێوەی بازنەیی بۆدەروە بەڕێکرد.

– تۆ لەڕاستیدا پێت وایە؟

– نازانم، رای تۆ چییە؟

– بۆم گرنگ نییە. بەڵام وابزانم بەفیڕۆدانی کاتە و بەس.

---

144 - Lloyd

145 - Ramirez

ئەوان لەبارەی رووداوی فڕۆکەخانەی هیترۆش بەیەکەوە دوابوون. لەگەڵ ئەوەیکە ئەوانیش ئەندامی (ئێم ئای٦) بوون، لەڕووی پلە و پایە بچووکتر لەوە بوون کە کەسێ ئاگاداریان بکاتەوە کە لەڕاستیدا چی بەسەر یاریزانانی هەڵبژاردە هاتووە. بە وتەی رادیۆ، ئەم یاریزانانە لە نیجریا تووشی نەخۆشییەکی مەترسیدار و دەگمەن بوونە. بەڵام لەبارەی چۆنییەتی مردنیان ئەویش مردنی هەموویان لە یەک کاتدا، کەس قسەی نەکردبوو.

لۆید لەڕووی شك و گومانەوە وتی:

– وادیارە مالاریا بووە. مێشەکانی مالاریا لە نیجریا دەژین.

– ئاها، بەڵێ، بێشك.

رێك لەم کاتەدا دەرگاکانی پێشووی بیناکە کرانەوە و رەشپێستێکی لاو هاتە ژوورەوە. جلی چەرمی تایبەت بە مۆتۆرسوارەکانی لەبەر بوو. کڵاوی ئیمەنی تایبەت بە مۆتۆرسوارانی بەدەستەوە بوو. لەسەر سینگی چەند وشەیەك نووسرابوو کە لەسەر ئەم کیسەیەش نووسرابوو کە بەشانییەوە بوو.

## پیتزا پێرلی
## پارووی‌ەک پیتزا بخۆن

نیگابانەکان چاویان تێبڕیبوو. حەقدە تا هەژدە ساڵە دەهاتەبەرچاو. کورتەبالاَ و مووی فڕی هەبوو. ددانێکیشی رووکەشی زێڕی هەبوو. پێکەنینێکی لەسەر لێوەکان بوو. واپێدەچوو تەنیا پیتزا دابەش ناکات، هەڵسووکەوتی بەجۆرێك بوو کە وای دەنواند لەم بینایەدا دەژیت.

لۆید وەستاندی.

- پیتزای بۆ کێ دەبەی؟

کووڕە رەش پێستەکە لاپەڕە کاغەزێکی لە گیرفانی دەرهێنا.

- بۆ فاستێر[146] کە لە نهومی شەشەمدا دەژیت.

رامێرزیش نەختێك حەزی لە گاڵتە بوو. شەوێکی دوورودرێژیان لەپێش بوو. هێشتا نە کەس چووبووە ناو بیناکە و نە کەسیش هاتبووەدەرێ.

- دەبێ ناو کیسەکە چاو لێبکەین.

- زۆر باشە، کێشە نییە، یا عیسا مەسیح!

کووڕەکە لەناو کیسەکەیدا شووشەیەکی خواردنەوەی کۆکاکۆلای دەرهێنا و لەسەر مێزەکەی دانا.

لۆید وتی:

- وامزانی تۆ وتت تەنیا پیتزا دەفرۆشی.

- پیتزایەك، شووشەیەك کۆکا. دەتهەوێ تەلەفۆن بۆ خاوەن دوکانەکەم بکەی؟

دوو پۆلیسەکە سەیرێکی یەکتریان کرد و لۆید پرسی؟

146 - Foster

- ئیتر چی دیکەت لەناو کیسەکەدا پێیە.
- دەتهەوێ هەموو شتێك ببینی؟
- بەڵێ، لەڕاستیدا دەبێ هەمووی ببینم.
- زۆر باشە! زۆر باشە!

ئەو کوورە لاوەی کە بۆ گەیاندنی پیتزایەکە هاتبوو، کلاوەکەی لە تەنیشت بوتڵەکە دانا و دوایی هەندێ نەی (قامیشی تایبەت بە خواردنەوەی ساردی) لە کیسەکە دەرهێنا کە هێشتا لەناو کاغەزی تایبەتدا پێچرابوونەوە. دوایی کارتێکی چوارگۆشەی دەرهێنا کە درێژاییەکەی نزیك پازدە سانتی مەتر بوو. لۆید سەیرێکی کرد.

- ئەمە چییە؟
- کوورەکە ئاخێکی هەڵکێشا:
- بڕیارە لێرەی دابنێم، شتێك بۆ ریکلامی بازرگانی. دەتوانی بیخوێنیتەوە.
- ئەگەر دەتهەوێ بچیتە ناو ئەم بینایە، دەبێ ئاگات لە جۆری قسەکردنت بێ.
- ریکلامی فرۆشتنە، لەناو شاردا بلاویان دەکەینەوە.

چەند وێنەیەك لەهەردوو لای کارتەکە دەبینرا کە نرخەکانی تێدا نووسرابوو. پیتزای خێزانی، خواردنەوە و نان و سیر تەنیا نۆ پاوند و پەنجا پنس. ئەگەر پێش کاتژمێر حەوت داوای بکەن، ئەوا یەك پاوند هەرزانترە.

کوورەکە وتی:

- دەتانهەوێ داوای پیتزا بکەن؟

لۆید وتی:

- نا، بەلام دەمانهەوێ ئەم پیتزایە ببینین کە هێناوتە.
- نا، ناتوانن ئەمکارە بکەن، ئەمکارەتان تەندرووستیانە نییە.
- بەلام تا نەیبینین، ناتوانی پیتزاکە بەکەس بدەی.

- زۆر باشە، هەرچی ئێوە دەڵێن. من بۆ هەموو شوێنێکی لەندەن پیتزام بردووە، بەڵام ئەمە یەکەمجارە لە گەڵ شتێکی ئاوا رووبەڕوو دەبمەوە.
کوڕەکە، کارتۆنی پیتزای لەسەر مێزەکە دانا. لۆید دەرگای قوتییەکەی کردەوە. لەناو قوتییەکەدا پیتزای تێدابوو. پیتزایەکی چوار وەرز، لەگەڵ پەنیر، تەماتە و زەیتوونی رەش. بۆنی پیتزا ئەوێی پڕ کرد.
کوڕەکە بەشێوەیەکی گاڵتەجاریانە وتی:
- دەتهەوێ تامێکی بکەی؟
- نا، ئیتر چیترت لەناو کیسەکەدا پێیە؟
- شتێکی دیکەی تێدا نییە. بەتاڵە.
ئەمەی وت و دەرگای کیسەکەی کردەوە تا ناوەکەی بە پاسەوانەکان نیشان بدات.
- ئەگەر نیگەرانی ئەمن و ئاسایشن، بۆچی نایبەن بۆئەوەی بۆخۆتان بیدەنێ .
لۆید بەستەکەی داخست، دەیزانی کە دەبێ ئەمکارە بکات، بەڵام ئەو پاسەوان و پۆلیسێکی نهێنی بوو نەوەك پیتزافرۆش. لەلایەکی دیکەوە، پیتزا دەبوایە بچێتە نهومی شەشەم. دەیتوانی لەو شوێنەی کە لێی دانیشتووە ناو ئەسانسۆرەکە ببینێ. ژمارەی نهومەکان لەبەردەمی بوو. پەیژەکانیش بە کامێرای شاراوە کۆنترۆڵ دەکران. تەنانەت کەناڵەکانی هەواکەشیش بە زەنگی مەترسیدار کۆنترۆڵ دەکران.
کێشەیەك لەئارادا نەبوو.
- زۆر باشە، دەتوانی تا نهومی شەشەم بچی. مافی ئەوەت نییە بۆ نهومەکانی دیکە بچی. تێگەیشتی؟
- بۆچی دەبێ بۆ شوێنی دیکە بچم. من پیتزام بۆ خاتوو فاستێر هێناوە و ئەویش لە نهومی شەشەمدا دەژیت.
کووره پیتزا فرۆشەکە هەموو ئەو شتانەی کە لە کیسەکەوە دەری هێنابوون، خستنیەوە ناو کیسەکە و بەڕێکەوت.
رامیرێز وتی:

- لەژێر دەزگاکەوە تێپەڕە.
- وامزانی هاتوومەتە ناو بینایەك، نەوەکوو فڕۆکەخانەی هیترۆ.
پیتزافرۆشەکە کڵاوەکەی دایە دەست رامیرێز و دوایی لەکاتێکدا کیسەیەك پیتزای بەدەستەوە بوو، لەژێر دەزگەکەوە تێپەڕی.
- فەرموون، واپێدەچێ هیچ کێشەیەکم نییە، دەتوانم پیتزایەکە ببەم؟
لۆید زۆر جددیانە وتی:
- لەبیرت چوو کارتی ریکلام و شووشەی خواردنەوەکەت هەڵگری.
دوایی ئەم دووەی هەڵگرت و دایە دەست پیتزافرۆشەکە.
- بەڵێ، سوپاست دەکەم.
ئێستا پیتزافرۆشەکە بۆلای ئەسانسۆر بەڕێکەوت.
ئەو دەیزانی رادەگیرێت.
لەپشت نیقاب و پێستی رەش، ئەلێکس هەناسەیەکی پڕ لە ئاسوودەیی هەڵمژی. گۆڕینی قەڵافەت و رووخسار کاری خۆی کردبوو. نیل پێشتر ئەمەی پێ وتبوو کە هیچ جۆرە دوودڵییەك لەخۆی نیشان نەدات و بێشك سەرکەوتوو دەبێ. تەنیا دەبوایە ئاگای لەوە بێت کە دەنگی نەختێك بە تەمەنی سەرووتر بچێت. کۆتی تایبەت بە مۆتۆرسواران ئەویان گەورەتر نیشان دەدا و بە پێڵاوی تایبەتی کە لەبەری کردبوو، سێ سانتی مەترێك باڵابەرزتر دەهاتەبەرچاو. ئەو نیگەرانی ئەوە نەبوو کە کیسەکەی بگەڕێن، ئەلێکس هەر کە سەیری نیگابانەکانی کردبوو، زانیبووی ئەمانە تازەکارن.
ئەگەر پاسەوانانی ئەمنییەتی بەقسەی ئەلێکسیان کردبا و تەلەفۆنیان بۆ ژمارەی پیتزافرۆشی کردبا، ئەوا تەلەفۆنیان بۆ دووپشك دەکرد و کەسی تایبەت بۆ وەڵامدانەوە دانرابوو. ئەگەر بەهۆش بایەن، دوو پاسەوانەکە دەبوایە تەلەفۆنیان بۆ نهۆمی شەشەم کردبا، بەڵام سارا فاستێر کە خاوەنی ئەپارتومانەکە بوو، بۆ سەفەر چووبوو. ژمارە تەلەفۆنەکەی لە شوێنێکی دیکە وەسڵ کرابوو و لەویش دووبارە دووپشك وەڵامی دەدانەوە.

هەموو شتێك بە پێی بەرنامە بەڕێوەچووبوو.
ئەلێکسیان لە مالاگوستو بۆ ڕۆما بردبوو و لەوێ لەگەڵ دوو ئەندامی دووپشك کە نەیدەناسین، سواری فڕۆکە ببوو. ئەوان لە فڕۆکەی هیترۆ بوون و توانیبویان لەدەست پۆلیسی پەساپۆرت تێیپەڕێنن. ئەلێکس جلکی دەوڵەمەندانەی لەبەر کردبوو، پەساپۆرتەکەشی ساختە بوو، بەڵام ئەلێکس وای هەست کردبوو کە فڕۆکەخانە لە ئامادەباشی تەواو دایە و هۆیەکەشی بێشك بۆ دووپشك دەگەڕایەوە.
لە فڕۆکەخانەی هیترۆ ڕێك بردبوویانە بینایەك لە ناوەندی لەندەن و لەوێ نیل چاوەڕوانی بوو. نیل لەسەر کورسییەك دانیشتبوو و پێیەکانی هاویشتبووە سەر یەك.
نیل، ئەلێکسی بەناوە نوێیەکەی بانگ کرد کە لەسەر پەساپۆرتە ساختەکەدا بوو:
- فێدریکۆ!
ئەلێکس زۆر قسەی نەکرد. نیل بەخێرا کار و پلانەکەی لەگەڵ باس کرد. جلێکی نوێیان لەبەر کرد، جلی پیتزافرۆشیان لەبەر کرد. هەندێ ئەشیای دیکەشیان پێدا بۆئەوەی بچێتە ناو ماڵی خاتوو جۆنز و بیکووژێت. کێشەکە لەوەدا بوو کە چۆن لەوێ دێتەدەر.
نیل وتی:
- کارەکە دژوار نییە. هەر بەم شێوەیەی کە چوویتە ژوورەوە، بەم شێوەیەش دێیتە دەرەوە. ئەگەر کێشەیەکیش هاتەپێش بێشك خۆت دەتوانی لەگەڵی ڕووبەڕوو بیتەوە. من بڕوایەکی تەواوم بە تۆ هەیە.
نیل بەرنامەکانی بە ئەلێکس نیشان دا. پێشتر دووپشك ئاگاداری هەموو شتێك لەبارەی ئەم بینایە ببوو. ئەوان دەیانزانی کامێراکان لە کوێن و چەند پاسەوان لە بیناکە کێشکچین. هەموو شت وەکوو خۆی بوو. تەنانەت تێنەپەڕاندی شووشەی ساردی لەژێر دەزگەکە، کە ئەلێکس بە ئەنقەست ئەمکارەی کردبوو و لەسەر مێزی پاسەوانەکانی دانابوو. لە

پلانێکی دەروونناسییانەی سادە کەڵکی وەرگرتبوو. ساردییەك لەناو بوتڵێکی پلاستیکی دابوو کە نەدەکرا ئاسنی تێدا بێت.
ئەلێکس گەیشتە ئەسانسۆر و وەستا. کاتێکی ئەستەم و مەترسیدار بوو.
ئەلێکس پشتی لە نیگابانەکاندا بوو. ئەو لەنێوان دوو پاسەوان و ئەسانسۆردا بوو و پێش چاوی ئەوانی گرتبوو. ئەلێکس لەکاتی بەرێداڕۆیشتن کارتە ریکلامەکەی لە کیسەکە دەرهێنابوو و ئێستا بە دوو دەست گرتبووی. لایەکی کارتەکە بەرگێکی هەبوو، کاتێك بەرگەکەی هەڵدەکەند، لەسەر کاغەزێك پیتی جی بەمانای یەکەم نهوم و دوایی نۆ ژمارە، هەر ژمارە بەحسێبی نهومێك نووسرابوو. رێك بە قەبارە و شێوەی ئەم شاشە نمایشییە بوو کە لەتەنیشت ئەسانسۆرەکە بوو. لایەکەی دیکەی کاغەزەکە موگناتیسی بوو. ئەلێکس بە جووڵەیەکی خێرا ئەم بەرگەیەی بە بەرگەی سەرەکی ئەسانسۆرەکە وەنووساند.
دەرگاکانی ئەسانسۆر کرانەوە و ئەلێکس چووە ژوورێ. لەکاتێکدا دەسووڕایەوە، سەیری دوو پاسەوانەکەی کرد. ئەلێکس دوگمەی نهومی نۆهەمی پاڵدا. دەرگاکانی ئەسانسۆر داخران. دوای ماوەیەکی کوورت ئەسانسۆر بەرێکەوت و بۆ لای سەرەوە چوو.
دوو پاسەوانەکە سەیری گۆڕینی ژمارەکەی تەنیشت ئەسانسۆریان دەکرد. نهومی یەك... نهومی دوو.... بەڵام ئەوەی دەیانبینی ئەوەی بوو کە ژمارەکان بەڕیزەوە نین. ئەم شتەی کە ئەلێکس لەسەر دەرگای دانابوو، بەو پاتریەی کە لە ناویدا چاك کرابوو، نهومەکانی بەهەڵە نیشان دەدا. ژمارەی راستەقینە دیار نەدەکرا.
ئەلێکس چووە ناو نهومی نۆهەم.
شاشەی پیشاندەر نیشانی دەدا کە ئەو لە نهومی شەشەم وەستاوە.
سی چرکەی کێشا کە لە نهومی یەکەم گەیشتە نهومی نۆهەم. لەم ماوەیەدا ئەلێکس کۆتە چەرمییەکەی دەرهێنابوو بۆئەوەی جلەکانی ژێرەوەی کە فشتر و کەم کێشتر و رەش بوون، لە جەستەیدا ببینرێن: ئەمە ئۆنیفۆرمی مرۆڤکووژەکانی نینجا بوو. ئەلێکس بەخێرا کڵاوگیس (پرچی

دەستکرد)ی لەسەر سەری هەڵگرت و دوایی پێستەکەی سەر رووخساریشی لێکردەوە و لە کۆتاییدا رووکەشی ددانەکەشی دەرهێنا. دەرگای ئەسانسۆر کرایەوە. جارێکی دیکە ئەو خۆی بوو.

خەریتە و نەخشەی تەواوی بیناکەیان نیشان دابوو. بیناکەی خاتوو جۆنز لەلای راستەوە بوو. دوو هەڵەی دیکەیان لەڕووی ئاسایش و پاراستنەوە کردبوو. لەگەڵ ئەوەیکە پەیژەکانی دەرەوەی بیناکە کامێرایان لەسەر بوو، لە رێڕەوەکە هیچ کامێرایەکی لێنەبوو. پاسەوانەکەی بەر دەرگا دەیتوانی هەردوو لای رێڕەوەکە ببینێ، بەڵام توانای دیتنی ئەسانسۆرەکەی نەبوو. ئەلێکس دەبوایە لەم دوو هەڵەیە زۆرترین سوود وەربگرێت.

پاسەوانی نهومی نۆهەم گوێی لە کرانەوەی دەرگای ئەسانسۆر ببوو. ئەویش وەکوو لۆید و رامیرێز کە لەنهۆمی خوارەوە بوون، تازەکار بوو. ئەو بەلایەوە سەیر بوو کە بۆچی ئەسانسۆرەکەیان بۆ نهۆمی نۆهەم ناردووە. رەنگە واباشتر بێ تەلەفۆنێك بۆ نهومی خوارەوە بکات و لێیان بپرسێ. بەڵام بەر لەوەی بتوانێ کارێك بکات، کوورێکی کورتەباڵا لە ئەسانسۆرکە هاتەدەرێ. ئەلێکس قامیشێکی خستە ناو لێوەکانی کە نیگابانەکانی خوارەوە لە سەیر کردنی خۆیان پاراستبوو.

لەڕاستیدا ئەم نەیە (قامیشە) سیلاحێکی کوشەندە بوو کە نینجاکان کەڵکیان لێی وەردگرت. دارتێکی نووك تیژ کە لەناو نەیەکەدا بوو، بە فوویەکی بەهێز دەیتوانی بچێتە ناو جەستەی قوربانی و خێرا بیکوژێت. نینجایەك دەیتوانی لە مەودای بیست مەتریدا بە هاوشتنی ئەم دارتە کەسێك بکووژێت. مەودای ئەلێکس لەگەڵ نیگابانەکە زۆر لەوە کەمتر بوو. بەڵام لە بەختی باشی نیگابانەکە، ئەم دارتەی کە ئەلێکس هاویشتی و بە ملی کەوت، تەنیا دەرمانی بێهۆش کەرەوەی پێوەبوو. نیگابانەکە دەمی کردەوە کە هاوار بکات. بەشێوەیەکی گێلانە سەیری ئەلێکسی کرد و کەوتە خوارەوە.

ئەلێکس دەیزانی کە دەبێ پەلە بکات. نگیابانەکانی خوارەوە تەنیا چەند خوولەك کاتیان پێدابوو، بەڵام کە دەیاندیت هێشتا نەگەڕاوەتەوە، بۆ لای دەهاتن. ئەلێکس بوتڵی کۆکاکۆلای کردەوە. بەڵام لەجیاتی ئەوەی خواری بکاتەوە، شووشەکەی سووڕاند و بەم کارە شووشەکە بە دوو لەت دابەش کرا. ئاوی قاوەیی رەنگی ناو بوتڵەکە رژایە سەر فەرشی رێڕەوەکە و چووە ناوی. لەناو بوتڵەکەدا بەستەیەك هەبوو کە لەناو پلاستیکێکی رەنگ قاوەییدا پێچرابوو. رەنگەکەی رێك وەکوو کۆکا بوو. ئەلێکس بەستەکەی کردەوە، دەمانچەیەك لەناو بەستەکەدا بوو.

دەمانچەکە لەجۆری (کار پی۹)[147] بوو کە شێوەیەکی نیوە ئۆتۆماتیکی هەبوو و لە ئەمریکا چاك کرابوو. درێژایی دەمانچەکە شەش ئینچ بوو و کێشی لە هەژدە ئۆنس زیاتر نەبوو. لە بچووکترین و سووکترین دەمانچەکان بوو کە جیهاندا دروست کرابوو. دەراغی دەمانچەکە چەند فیشەکی دەخوارد، بەڵام دووپشك تەنیا فیشەکێکی تێهاویشتبوو. فیشەکێکیش بۆ ئەلێکس بەس بوو.

ئەلێکس لەکاتێکدا کە کیسەی پیتزای پێبوو، لە تەنیشت نیگابانی بێهۆشکراو تێپەڕی و بۆ لای دەرگای ماڵی خاتوو جۆنز بەڕێکەوت. هەر ئەمجۆرەی کە پێشتر پێیان وتبوو، ئەم دەرگایە سێ قفڵی هەبوو. ئەلێکس دەرپۆشی پیتزای هەڵگرت و دوایی سێ دنك زیتونی رەنگ رەشی دەست دایە و هەر یەك لەوانی بە قفڵێکەوەنا. کیسەی قوماشی پیتزا لەڕاستیدا کۆتاییەکی شاراوە و نادیاری هەبوو. ئەلێکس لەناو کیسەکەدا سێ وایەری دەرهێنا و ئەوانی بە زەیتونکەوەنا. دوایی بە پاڵدانی دوگمەیەك زیتونەکان کە لەڕاستیدا زەیتون نەبوون، بێ دەنگ تەقینەوە و دەرگا کرایەوە.

ئەلێکس لە کاتێکدا دەمانچەکەی بەدەستەوە بوو، چووە ناو ژوورێکی گەورە. لەناوەڕاستی ژوورەکەدا، مێزێکی نانخۆری بە چوار کوورسیەوە

---

[147] - Kahr P9

دەبینرا. چەند کوورسی دیکەش لە ژوورەکەدا بوون. شەترەنج نیوە یاریی پێکرابوو. بەڵام لەگەڵ کێ یاریی کردبوو؟ ئەلێکس ئەمەی نەدەزانی. نیل پێی وتبوو کە بە تەنیا دەژیت. دەنگی مرەمرێکی گوێ لێبوو. پشیلەیەکی رەش لەسەر کەناپە (کوورسی کە بە کووشین دەچێ) هەستایەسەر پێیەکانی. بەلایەوە سەیر بوو. چاوەڕوانی ئەوە نەبوو کە جێگری بەڕێوەبەری چالاکیی تایبەتی (ئێم ئای٦) پێویستی بە هاودنگێکی ئەوتۆ بێت. دەنگی مرەمری پشیلەکە بەرزتر بۆوە. بەوەدەچوو کە پشیلەکە دەیهەوێ خاوەنەکەی لە بوونی ئەلێکس لەناو بینایەکە ئاگادار بکاتەوە. ئەمەش رووی دا.
دەرگایەك لەلایەکەی دیکەی ژوورەکە کرایەوە.
- چی بووە، کیو؟
خاتوو جۆنز هاتە ژوورێ و بۆلای پشیلەکە چوو. هەر لەم کاتەشدا چاوی بە ئەلێکس کەوت و وەستا.
- ئەلێکس!
- خاتوو جۆنز.
جلێکی ئاوریشمی درێژی پۆشیبوو. ئەلێکس بیری لەوە کردەوە کە ژیانی خاتوو جۆنز چەندە بەتاڵ و تەنیایە. ئەو لە شوێنی کاری بۆ ماڵ گەڕاوەتەوە و ئاوێکی بەخۆی داکردووە و بە تەنیا نانی شەوی خواردەوە و دوایش یاریی شەترەنجی کردبوو. کاتژمێر دە گوێی لە هەواڵەکان راگرتبوو و دواییش مرەمری ئەم پشیلەیە.
خاتوو جۆنز بۆ کاتێکی کەم لەناوەڕاستی ژوورکە وەستا. واپێدەچوو هەستی بە مەترسی کردبێ. نەیدەتوانی هیچ کارێکیش بکات. دەستیشی بە دوگمەی زەنگی مەترسی نەدەگەیشت. ئەلێکس دەستی بەرز کردەوە بۆئەوەی ئەو دەمانچەکەی ببینێ.
- ئایا دووپشك تۆی ناردووە؟
- بەڵێ.
- بۆئەوەی من بکووژی؟

- بەڵێ.

خاتوو سەری داخست. واپێدەچوو هۆکاری ئەمە بزانێ کە بۆچی دەبێ ئەلێکس بیکووژێت.

- ئەوان لەبارەی باوکتدا قسەیان لەگەڵ کردووی؟
- بەڵێ.
- زۆر بەداخم ئەلێکس.
- لەوەیکە کووشتووتە بەداخی؟
- بەداخم لەوەیکە خۆم باسی ئەم ڕووداوەم بۆ نەکردی.

خاتوو جۆنز هیچ جووڵەیەکی نەکرد. هەر لەم شوێنەی کە وەستابوو سەیری ئەلێکسی دەکرد. ئەلێکس دەیزانی کە کاتێکی ئەوتۆی لەبەردەستدا نییە. لەوانە بوو ئەسانسۆرکە بگاتەوە خوارەوە و هەر کە نیگابانەکان ببینن ئەلێکس لەناو ئەسانسۆرەکەدا نییە، زەنگی مەترسییان وەدەنگ دەخست. ڕەنگە ئێستاش لەناو ئەسانسۆردابن و بۆلای ماڵی خاتوو جۆنز دەهاتن.

خاتوو جۆنز پرسی:

- چ بەڵایەك بەسەر ونتێرز[١٤٨] هات؟

ئەلێکس نەیدەزانی خاتوو جۆنز باسی کێ دەکات. بەڵام خاتوو جۆنز لە قسەکانی بەردەوام بوو و وتی:

- ئەو لە دەرەوەی دەرگا وەستابوو.

وادیار بوو وینتێرز نیگابانی سێیەم بووبێ.

- بە خزمەتی گەیشتم.
- بەم حسێبەوە لای دوو پاسەوانەی نهۆمی خوارەوە تێپەڕیوی و گەیشتوویتە ئێرە. دووپشك چاکی ڕاهێناوی.
- ئەمە دووپشك نەبوو کە منی ڕاهێنا. ئێوە منتان ڕاهێناوە، خاتوو جۆنز.

---

148 - Winters

- بەڵام ئێستا تۆ لەناو گروپی دووپشك دای.
ئەلێکس سەری داخست و بەمجۆرە دانی بەم کارە داهێنا.
- ناتوانم وەکوو مرۆڤکووژێك بیر لە تۆ بکەمەوە، ئەلێکس. دەزانم کە من یا ئالان بلێنتت خۆش ناوێ. دەتوانم بە تەواوی درکی ئەمە بکەم. بەڵام من تۆ دەناسم. پێموانەبێ ئەوە بزانی کە خۆت تووشی چ رووداوێکی گەورە کردووە. باش دەزانم کە گروپی دووپشك لە دیتنی تۆ زۆریش خۆشحاڵ بوونە، بەڵام ئەوان درۆیان لەگەڵ کردووی –
- بەسە!
پەنجەی ئەلێکس لەسەر دەمانچە توندتر بوو. ئەو دەیزانی کە خاتوو ئەلێکس دەیهەوێ کارەکەی لێ دژوار و سەخت بکات. پێشتر هۆشداریان پێدابوو کە کارێکی ئەمجۆرە دەکات.
بە قسەکردن لەگەڵ ئەو، بە بانگ کردنی بە ناوی یەکەمی، خاتوو جۆنز پێی دەوت ئەوەی کە دەبێ تەقەی لێبکات، ئەو نییە. ئەو تۆوی دوودڵی لەناو دڵی ئەلێکسدا دەچاند و هەڵبەت دەیویست کاتەکەش بکووژێت.
نیل پێی وتبوو بە خێرا بڕیار بدات. رێك لەوکاتە کە یەکتر دەبینن. ئێستا ئەلێکس هەستی بەوە کرد کە تا ئێرەش هەڵەی کردووە و خاتوو جۆنزی زۆر بە گەورەیی وەرگرتووە. هەرچەند دەمانچەکە لەدەست ئەلێکس دابوو. ئەلێکس وەبیر قسەکانی خاتوو رۆدمەن لە پوزیتانۆ کەوتەوە. ئەلبێرت بریج. کوژرانی باوکی. ئەو رووبەڕووی ژنێك بوو کە ئەمری کوشتنی باوکی دابوو.
ئەلێکس پرسی:
- بۆچی ئەم کارەتان کرد؟
دەیویست هەستی نیفرەت و رق و کینە لەخۆیدا بەهێزتر بکات.
- بۆچی کام کارەم کرد، ئەلێکس؟
- بۆچی باوکمو کووشت؟
خاتوو جۆنز سەیری ئەلێکسی کرد. زۆر دژوار بوو کە بزانێ لەو چاوە رەشانەدا چی دەگووزەرێ. بەڵام ئەلێکس ئاگاداری ئەوە بۆوە کە ئەو

لەناو مێشکیدا هەندی شت لێکدەداتەوە. هەڵبەت هەموو ژیانی پڕ بوو لە لێکدانەوەی جۆراوجۆر. کاتێك کۆتایی بە لێکدانەوەکەی هێنا، بێشك کەسێك دەکووژرا. تەنیا جیاوازییەکەی لەوەدا بوو کەئەمجارە مردنی خۆی لەئارادا بوو.

واپێدەچوو خاتوو جۆنز بە بڕیارێك گەیشتبێ.

– ئایا دەتهەوێ داوای لێبوردنت لێ بکەم، ئەلێکس؟

پرسیارەکەی بە توندی و بە جددی کردبوو.

– ئێمە لەبارەی پیاوێك بەناوی جۆن رایدەر قسە دەکەین کە تۆ هیچکات نایناسی. هیچکات قسەت لەگەڵی نەکردووە. هیچ بیرەوەرییەکت لێی نییە. لەبارەیدا هیچ شتێك نازانی.

– بەم حاڵەوە، هێشتا باوکی من بوو!

– ئەو مرۆڤکوژێك بوو کە بۆ دوویشك کاری دەکرد. ئایا دەزانی ئەو چەند کەسی کووشت؟

پێنج یا شەش کەس.

خاتوو رۆدمەن وای پێوتبوو.

– بازرگانێك بوو لە پیرۆ[149] کاری دەکرد. ئەو ژیانی هاوسەری پێکهێنابوو و کوڕیکی هاوتەمەنی تۆی هەبوو. قەشەیەك لە ریۆدوژانیرۆ[150].

دەیویست یارمەتی منداڵانی سەرشەقام بکات. بەداخەوە پۆلیسێکی نهێنی ئەمریکی، دوایی ژنێك لە سیدنی. ئەو بیست و شەش ساڵە بوو، ئەلێکس. لەکاتێکدا لە ئۆتۆمبێلەکەی دەهاتەخوار، درایە بەر گوللە و کووژرا –

– بەسە، نامەهەوێ گوێم لەم قسانە بێت.

ئەلێکس ئێستا دەمانچەکەی بە هەر دوو دەستی گرتبوو.

---

[149] - Peru

[150] - Rio de Janeiro

- بۆچی، ناتهەویٚ گوێت لیٚ بیٚ، ئەلێکس. خۆت پرسیارت لێکردم. دەبیٚ بزانی بۆچی دەبوایە بوەستێنریٚ و ئەوە کارێکە کە تۆش دەتهەویٚ لێی بەردەوام بی، ئەلێکس. ئەوان تۆ بۆ شوێنە جیاجیاکانی جیهان دەنێرن بۆئەوەی مرۆڤیان بۆ بکووژی. کەسانێك بکووژی کە تەنانەت ناشیانناسی. باوکی تۆ لە باشترینەکان بوو.

- ئێوە فریوتان دا. ئەو زیندانی ئێوە بوو. وتتان کە ئازادی دەکەن. بڕیار بوو لەگەڵ کەسێکی دیکە بیگۆڕنەوە. بەڵام لە پشتەوەڕا تەقەتان لێیکرد. بۆخۆم ئەمەم بینی.

خاتوو جۆنز لە ژێر لێوەکانی و بەهێواشی وتی:

- بەردەوام ئەم پرسیارەم لە مێشکدا هەبوو کە ئایا ئەوان ئەم ڕووداوەیان تۆمار کردووە.

پشیلەکە دووبارە خەوتبۆوە. کەسیش لە ژوورەکە نزیك نەدەبۆوە.

خاتوو جۆنز وتی:

- پێشنیارێکم بۆت هەیە. ئەگەر بتهەویٚ بۆ دووپشك کار بکەی، پێویستیت بەم ئامۆژگارییەی من هەیە. کاتێك چوویتە ناو گروپەکەیان، ئەمە بزانە کە هیچ یاسایەك لەگۆڕێدا نییە. ئەوان هیچ حەزیان لە يارییەکە نییە کە ویژدان ڕۆڵی تێدا ببینیٚ. ئێمەش نیمانە.

- ئەوان کوورێکی هەژدە ساڵەیان دزیبوو.

ئەلێکس بەبیر کوڕێکی گەنج کەوتەوە کە لەسەر پردەکە بینیبووی.

- ئەو کووڕی فەرمانبەرێکی حکوومەتی بەریتانیا بوو. دەیانویست بیکوژن، بەڵام سەرەتا دەیانویست ئەشکەنجەی بکەن. دەبوایە ئەم کووڕەیان لێبستێنینەوە. بەم حسێبەوە، من داوای گۆڕینەوەم کرد. بەڵام بەهیچ شێوە نەمدەویست باوکت ئازاد بێت. ئەو زیادە لەڕادە مەترسیدار بوو. ژمارێکی زۆر کووژرابوون. لەم ڕوویەوە، پلانێکم داڕشت کە تاك تیرهاوێژێك لەسەر پردەکە بێت. من کارێکی دروستم کردووە و ئێستاش لەو کارەی کە کردوومە، خۆشحاڵم. ئەگەر وابیر دەکەیەوە بوارت باشتر دەبیٚ، دەتوانی تەقەم لێبکەی، ئەلێکس. بەڵام گویٚ لە قسەی من بگرە. تۆ

باوکت نەدەناسی و ئەگەر ناچار بم سەرلەنوێ دەست پێدەکەم و ڕێک کاری پێشووم دەکەمەوە.

– ئەگەر دەڵێن باوکم مرۆڤێکی شەڕانی و مەترسیدار بووە، منیش وەکوو ئەوم لێدێت.

ئەلێکس هەوڵی دەدا خۆی ئامادەی تەقەکردن بکات. وایدەزانی تووڕەیی و ڕق و نیفرەت هەستی توانایی پێدەبەخشێ. بەڵام زیاتر لەوەی کە تووڕە بێ، ماندوو بوو. ئێستا بەدوای ڕێگەیەکی دیکە دەگەڕا کە خێراتر تەقە لە خاتوو جۆنز بکات. ئەو کووڕی باوکی بوو. ئەم کارەش لە خوێنی ئەودا بوو.

خاتوو جۆنز هەنگاوێك لێی چووەپێش.

– هەر لەوێ بوەستە.

دەمانچەکە کەمتر لە مەترێك لە خاتوو جۆنز دوور بوو و ڕێك سەری نیشانە گرتبوو.

– پێم وانییە تۆ مرۆڤکووژ بی. تۆ هیچکات باوکت نەدەناسی. بۆچی دەبێ وەکوو ئەو بی؟ تۆ هەلی هەڵبژاردنت لەبەردەست دایە.....

– من هیچکات کارکردن لەگەڵ ئێوەم هەڵنەبژارد.

– نەتکرد؟ دوای یەکەمین هاوکاری دەتتوانی ڕێگەی خۆت بگری و بڕۆی. پێویستی بەوە نەدەکرد دووبارە یەکتر ببینینەوە. بەڵام ئەگەر لەبیرت نەکردبێ بۆخۆت ویستت لەگەڵ قاچاخچییەکانی ماددە هۆشبەرەکان ڕووبەڕوو بیتەوە و ناچار بووین یارمەتیت بکەین. دوایی نۆرە گەیشتە ڕووداوەکەی ویمبلدۆن[151]. ئێمە تۆمان ناچار نەکرد خۆتی تێوەهەڵقورتێنی. خۆت ویستت بچی و ئەگەر ئەم پیاوە مەترسیدارە چینییەت لەناو ساردخانەدا نەکردبا بە سەهۆڵ، ناچار نەدەبووین بتنێرینە ئەمریکا. دواییش ڕووداوەکەی دامیان کێری. تۆ خۆت ویستت بەدوایدا بچی و هەڵبەت ئێمە زۆر سوپاست دەکەین و خۆمان بە قەرزداری

---

151 - Wimbledon

تۆ دەزانین، ئەلێکس. بەلاّم لە من دەپرسی کە چ جۆرە مرۆڤێکی؟ بەبڕوای من بەهۆشتر لەوەی کە تەقەم لێبکەی. تۆ نە ئێستا، نە هیچکاتی دیکە تەقەم لێناکەی.

– تۆ لە هەڵە دای.

ئەلێکس هەستی کرد کە خاتوو جۆنز درۆی لەگەڵ دەکات. دەیتوانی ئەم کارە بکات. دەبوایە ئەم کارەی بکردایە.

ئەلێکس لێگەڕا تا نیفرەت هەموو جەستە و رۆح و گیانی پڕ کرد.

دوایی تەقەی کرد.

هەوا لە بەرامبەر چاوەکانیدا لێڵ بوو.

خاتوو جۆنز فریوی دابوو. هەر لەسەرەتاوە فریوی دابوو، بەلاّم ئەلێکس ئاگاداری ئەوە نەببوو. ژوورەکە لەڕاستیدا بە دووبەش دابەش دەکرا. خاتوو جۆنز لە بەشێکی ژوورەکە و ئەلێکس لە لایەکەی دیکەی ژوورەکە وەستابوون.

لە رووناکی کەمی ناو ژوورەکەدا ئەم شووشە روونە دیارینەدەکرا. گوللە بە شووشەکە کەوتبوو و کون و چەند چرژێکی تێدا پێکهێنابوو. ئێستا رووخساری خاتوو جۆنز بەشێوەی شکاو دەبینرا.

لەم کاتەدا زەنگی مەترسی بەرز بۆوە. چەند کەسێك هاتنەژوور و دەورەی ئەلێکسان دا و هاویشتیانە ناو کوورسییەك. دەمانچەکەی لەدەست کەوتەخوار. کەسێك لە گوێیدا دەیقیژاند، بەلاّم ئەو لە وشەکان نەگەیشت. پشیلەکە لە جێگەی خۆی هەستا و بە خێرایی لە تەنیشتی تێپەڕی. دەستەکانیان لە پشتەوەڕا بەستبوو و چۆکێك لەسەر پشتی دانرابوو. بە کیسەیەك سەریان داپۆشی و ئەلێکس ساردی ئاسنی مەچەکبەندەکەی هەست پێکرد. ئەگەری جوولاّندنی دەستەکانی لەئارادا نەبوو.

ئێستا دەنگی جۆراوجۆر لە ژوورەکەدا دەبیسران.

– ئێوە باشن خاتوو جۆنز؟

– زۆر بەداخین، خاتوو....

- ئۆتۆمبێل لە دەرەوە چاوەڕێیە.
- هیچ ئازارێکی پێنەگەیەنن!

لەکاتێکدا دەستەکانی ئەلێکسیان لەپشتەوەڕا بەستبوو، بەرزیان کردەوە. هەستێکی خراپی هەبوو. ئەو نەیتوانیبوو بەپێی خواستی دووپشک هەڵسووکەوت بکات. نەیتوانیبوو لە بکووژی باوکی تۆڵە بستێنێتەوە. خۆیشی بەدەستەوە دابوو.

ئەلێکس هیچی نەوت، بەرگریشی نەکرد. لێگەڕا تا بە ڕاکێش ڕاکێش لە ژوورەکە بردیانە دەرەوە. لە ڕێڕەوەکە تێپەڕین و بە ڕەشایی شەو گەیشتن.

## کوبرا

ژوورەکە بە سندووقێکی سپی بەتاڵ دەچوو. بەجۆرێك چاك کرابوو کە هەستی ترس پێکبێنێ. ئەلێکس قەبارەی ژوورەکەی دەزانی، دە هەنگاو لە چوار هەنگاودا. تەختێکی باریك بێ قووماش و پەتوو لە ژوورەکە دانرابوو. لەپشت پەردەیەکیش ئاودەستی لێبوو. بەڵام هەمووی هەر ئەوەندە بوو. دەرگا دەستگیرەی نەبوو. پەنجەرەشی نەبوو. رووناکی ژوورەکە لە چوارچێوەیەکی میچی ژوورەکە دابین دەبوو و لە دەرەوە کۆنترۆڵ دەکرا.

ئەلێکس نەیدەزانی چ ماوەیەك لەوێ بووە. کاتژمێرەکەیان لێ ئەستاندبوو.

دوای ئەوەی ئەویان لە بیناکەی خاتوو جۆنز دەستبەسەر کرد، بردیانە ناو ئۆتۆمبێلێك. کیسەی رەش هێشتاش لەسەر سەر و رووخساری بوو. بەهیچ شێوەیەك نەیزانی بۆ کوێی دەبەن. ماوەی نیو کاتژمێر بە خێرا دەڕۆیشتن و دوایی خێرایی ئۆتۆمبێل کەم بۆوە. ئەلێکس هەستی کرد بە سەراوژێرێکدا دەڕۆن. ئایا ئەویان بۆ ژێرزەوینێکی ناوەندی ئیداری شەقامی لیڤەرپول[152] بردبوو؟ پێشتریش جارێك ئەویان بۆ ئێرە هێنابوو.

بەڵام ئەمجارە رێگەی قسە کردنیان پێنەدابوو. ئۆتۆمبێل وەستا، دەرگاکەیان کردەوە و بە راکێش راکێش لە ئۆتۆمبێل هێنایانە خوارەوە. هیچکەس قسەی لەگەڵ نەدەکرد. لەکاتێکدا دووپیاو لە هەردوولا گرتبوویان، لە پەیژەکان چووە خوارەوە.

---

152 - Liverpool

دوایـی دەسـتەكانیان كـردەوە و كیسـەكەیان لەسـەر سـەر و رووخسـاری هـەڵگرت. چـاوی بـە لۆیـد و رامیـرز كـەوت كـە دەیانویسـت ژوورەكـە جێبهێڵێن. دوایی دەرگا داخرا و بە تەنیا لە ژوورەكەدا هێشتیانەوە.
لەسـەر پشـت راكشـا و وەبیر دوایـین چركەسـاتی نـاو بینایەكـە كەوتـەوە. بەلایەوە سەیر بوو كە شووشە روونەكـەی نـاو ژوورەكـەی نـەبینیبوو. ئایـا دەنگـی خـاتوو جۆنزیـان بەشـێوەیەك بـەهێزتر دەكـرد؟ گـرنگ نـەبوو. ئـەو هەوڵی دابوو بیكووژێ. ئەو لە كۆتاییدا ئەم هێزەی لەخۆیدا بەدی كردبوو كـە پەلاپیتكەكـە بكێشـێ و سـەلماندبووی كـە دووپشـك لـەبارەی ئـەودا هەڵەی نەكردووە.
*ئەو پیاوكووژ بوو. ئایا دەزانی چەند كەسی كووشتبوو؟*
ئـەلێكس وەبیر قسـەكانی خـاتوو جۆنز لـەبارەی باوكی كەوتـەوە. خـاتوو جۆنز ئەمری تەقەكردن لە جۆن رایدەری دابوو و ئەوی كووشتبوو. حـەقی خاتوو جۆنز بوو كە بمرێت.
یا ویستی ئەمجۆرە خۆی رازی بكات. بەڵام خراپتر لە هـەموو شـت ئـەوە بـوو كـە ئـەو بـە تـەواویی لەمەبەسـتی خـاتوو جـۆنز نەگەیشـتبوو. ئەگـەر باوكی لەسەر ئالبێرت بریج نەكووژرابوو، ئەگـەر ئـەو لەگـەڵ بـاوكی گـەورە دەبـوو و دوایـی ئاگـاداری كارەكـانی ئـەو دەبـوو، لـەبارەی بوارەكـەدا چ هەستێكی پەیدا دەكرد؟ ئایا دەیتوانی لە باوكی ببورێت؟
ئـەلێكس لەكاتێكـدا كـە بـە تـەنیایی لـەم ژووره سـپی رەنگـە زاڵمانەیـە دانیشتبوو. وەبیر ئەو كاتە كەوتەوە كە تەقەی كردبوو. ئاگاداری جووڵـەی دەسـتی بـۆوە. وەبـیر ئـەم شووشـە روونـە كەوتـەوە كـە شـكابوو. وەبـیر سمیتێرز[١٥٣]ی كەوتەوە. بێشك مامۆستای (ئێم ئای٦) ئەم شووشـەیەی دانابوو. بەم حاڵەوە و بەپێی هـەموو رووداوەكە، ئـەلێكس خۆشـحاڵ بـوو. خۆشحاڵ بوو كە خاتوو جۆنزی نەكووشتووە.

153 -Smithers

نەیدەزانی ئێستا چی بەسەر دێت. بێشك (ئێم ئای٦) ئاوا بەئاسانی وازی لێناهێنێت و دەبێ وەڵامی زۆر پرسیار بداتەوە. بێشك دەیانویست لەبارەی مالاگوستو، خاتوو رۆدمەن و نیل زیاتر بزانن. دوایی رەنگە وازیان لێهێنابا. دوای ئەو رووداوە ئیتر متمانەی پێناکەن.

ئەلێکس رایدەر خەوی لێکەوت. خەوێکی بێ ئارەزوو و هیوا، بێ هەستی حەسانەوە و گەرمی.

دەنگی کرانەوەی دەرگا وەخەبەری هێنا. چاوەکانی کردەوە و چەند پێلووی لێدا. نەیدەزانی کاتژمێر چەندە. چەند کاتژمێر یا هەمووی شەوەکە خەوتەوە. هەستی بەوە دەکرد کە ماندوویی لە جەستەی چووەتە دەرەوە.

- پێویستیت بە ئاودەست هەیە؟
- نا.
- کەواتە بەدوام بکەوە.

ئەوکەسەی کە هاتبووە ناو زیندان، لۆید، رامێرز و یا کەسێك نەبوو کە پێشتر لە (ئێم ئای٦) دیتبێتی. ئەلێکس لەسەر تەختەکە هەستا و بۆلای دەرگا بەڕێکەوت. هەستێکی پڕ لە دڵەڕاوکێی هەبوو. کەس نەیدەزانی کە ئەو لێرەیە. نە تام و نە جەك ستاربرایت. هیچکەس. (ئێم ئای٦) دەیتوانی کارێك بکات کە ئەو بۆ هەمیشە بە نادیاری بمێنێتەوە. رەنگە ئەم پیلانەشیان لەسەر دابێت.

بەڵام هیچ کارێکی لەدەست نەدەهات. ئەو بەدوای نیگابانەکە لە ڕێڕەوەکە بەڕێکەوت. لەژێر میچی بانەکە بە درێژایی ڕێڕەوەکە بۆڕی کێشرابوو. رەنگە لە مۆتۆڕخانەیەکی ناو کەشتییەکدا بێت.

- برسیمە.

ئەلێکس لەڕاستیدا برسی بوو، بەڵام رەنگە زیاتر حەزی لەوە بوو کە هەستەکەی دەربڕێت کە لەهیچ شتێك ناترسێ.

- وا دەتبەم نانی بەیانی بخۆی.

نانی بەیانی؟ کەواتە تەواوی شەو خەوتەوە.

ئەلێکس وتی:

- نیگەران مەبە، دەتوانی من لە مەکدۆنالد دابنێی.

- بەداخەوە لێرە ئیمکاناتێکی ئەمجۆرەمان نییە.

گەیشتنە دەرگایەك، ئەلێکس لەدەرگا تێپەڕی و گەیشتنە ژوورێکی سەیر کە زۆر خوارەپێچە بوو. بێشك هێشتا لەناو ژێرزەوین دابوو. لەم چوارچێوە ئەستوورانەی کە بەمیچەوە بوون، رووناکی دەهاتە ناو ژوورەکان. ئەلێکس لە پشت شووشەکانی چوارچێوە کەسانێکی دەدیت کە هاتووچۆیان دەکرد. ژوورەکە لەژێر پیادەڕەوێکدا بوو. جێپێیەکی زۆر بە قەبارەی جۆراوجۆر لەسەر شووشەکە مابوونەوە. کەسانێك کە لەکاتی هاتووچۆ بوون، بە هەڵە وات دەزانی کە دەیانهەوێ بچنە سەر ئیش و کاریان.

گەیشتنە مێزێك کە زەڵاتە، شیر، کرواسانت[١٥٤] و قاوەی لەسەر دانرابوو. ئەلێکس سەرەتا بەبینینی نانی بەیانی دەمی پڕ بوو لەئاو، بەڵام دوایی کە ئاگادار کرایەوە لەگەڵ کێ دەبێ نانی بەیانی بخوات، ئیشتیای بەسەر چوو. ئالان بلێنت چاوەڕوانی بوو، کە لەسەر کوورسییەك لەلایەکەی دیکەی مێزەکە دانیشتبوو. ئەو بەو جلکە هەمیشەییەی زیاتر بە بەڕێوەبەری بانك دەچوو. ئالان بلێنت قۆناغی پەنجا سالّی تێدەپەڕاند.

- بەیانی باش، ئەلێکس.

ئەلێکس وەڵامی نەدایەوە.

- دەتوانی جێمان بێڵی، بۆرنز[١٥٥]، سوپاست دەکەم.

پۆلیسەنهێنییەکە لە ژوورەکە چووە دەرەوە و دەرگای لەپشتەوە بەست. ئەلێکس بۆلای مێزەکە رۆیشت و لەسەر کوورسییەك دانیشت.

- برسیتە، ئەلێکس، تکایە شتێك بخۆ.

- نا، سوپاس.

---

154 - Croissant. جۆرێکی نانی بەیانی هیلالی شێوەیە

155 Burns .

ئەلێکس برسی بوو، بەڵام حەزی لە خواردنی نانی بەیانی لەگەڵ ئەو نەبوو.

– گێل مەبە. پێویستیت بە خواردن هەیە. ڕۆژێکی پڕ لە کار و قەرەباڵغت لەپێشە.

بلێنت چاوەڕوان مایەوە تا ئەلێکس شتێ بڵێ، بەڵام ئەو قسەی نەکرد.

– دەزانی تووشی چ کێشەیەکی گەورە بوویە؟

– ڕەنگە نەختێك ویتابیکس[156] بخۆم.

ئەلێکس دەستی بە نان خواردن کرد. بلێنتیش بەشێوەیەکی ئاسایی سەیری دەکرد.

– کاتێکی زۆرمان لەبەردەستدا نییە. چەند پرسیارم لێتە کە وەڵامی ڕاست و درووستم دەوێت.

– ئەگەر وەڵامی ڕاست و درووستت نەدەمەوە؟

– چۆن بیر دەکەیەوە؟ وابیر دەکەیەوە کە دەرزییەکت لێدەدەم بۆئەوەی وەڵامی دروست بدەیتەوە. تۆ وەڵامی پرسیارەکانی من دەدەیتەوە، چونکە ئەمە بە قازانجی تۆیە. ڕەنگە ئاگاداری هەستیاربوونی بوارەکە نەبی، بەڵام ئەوە بزانە کە ئەو قسەیەی پێتی دەڵێم زۆر گرنگە و پەیوەندی بە ژیانی سەدان منداڵەوە هەیە. ئێمە دەبێ ئەوە بزانین کە تۆ چی دەزانی. زیاتر لەوەی بیری لێدەکەیەوە گیانی خەڵکی لە مەترسی دایە.

ئەلێکس سەری داخست.

– بەردەوام بە.

– جولیا ڕۆدمەن دایمەزراندی؟

– ئێوە ئەو دەناسن؟

– بەڵێ، بێشك دەیناسین.

– بەڵێ ئەو منی دامەزراند.

– تۆیان بۆ مالاگوستو برد؟

---

[156] - Weetabix

- بەڵێ.
- هەروەها تۆیان نارد خاتوو جۆنزی بکووژی؟
ئەلێکس هەستی بەوە کرد کە دەبێ بەرگری لەخۆی بکات.
- ئەو باوکی منی کووشت.
- ئێمە باس لەمە ناکەین.
- بەڵێ باسی ناکەن!
- وەڵامی پرسیاری من بدەوە.
- بەڵێ، منیان نارد کە خاتوو جۆنزی بکووژم.
- زۆر باشە؟
بلێنت سەری هێنایە خوارەوە.
- دەمەوێ ئەوە بزانم کە کێن ئەوانەی تۆیان بۆ لەندەن هێنا، چیان پێ وتی و دوای کۆتایی ئەرکی پێسپێردراو دەبوایە چی بکەی؟
ئەلێکس نەختێك وەستا. ئەگەر هەموو ئەوانەی بە بلێنت بوتبایە، لەڕاستیدا خیانەتی بە دووپشك کردبوو. بەڵام لەناکاو هەستی کرد کە بەلایەوە گرنگ نییە. ئەو لە دونیایەکدا بوو کە هەموو خیانەتیان بەیەکتر دەکرد. تەنیا حەزی دەکرد لەم کێشەیە رزگاری بێت.
- ئەوان نەخشەی بیناکەیان هەبوو. هەموو شتێکیان دەزانی. تەنیا نەیاندەزانی کە ژوورەکەی خاتوو جۆنز شووشەکێشی کراوە. تەنیا کارێك کە دەبوایە بیکەم ئەوە بوو کە چاوەڕوانی هاتنی دەبووم. دوو کەس منیان لە پاسەوانەکانی هیترۆ دەرباز کرد. ئێمە وەکوو خێزانێکی ئیتاڵی هاتینە ناو فڕۆکەخانە. ئەوان ناوی راستەقینەی خۆیان بە من نەوت. من پەساپۆرتێکی ساختەم هەبوو.
- تۆیان بۆ کوێ برد؟
- نازانم، جێگەیەکی وەکوو ماڵ. کاتی ئەوەم نەبوو ئادرەسەکەی بخوێنمەوە.
ئەلێکس نەختێك وەستا.
- خاتوو جۆنز لە کوێیە؟

– ئەو نەیویست بتبینێ.
ئەلێکس سەری داخست.
– بەڵێ، درک دەکەم.
– دوای کوشتنی ئەو بڕیار بوو چی بکەی؟
– ئەوان ژمارە تەلەفۆنێکیان پێدام. بڕیار بوو هەر کە کۆتاییم بە کارەکەم هێنا، پەیوەندیان پێوە بگرم. بەڵام ئێستا دەزانن کە منتان دەستبەسەر کردووە. وابزانم ئاگاداری بیناکە بوون.
بێدەنگییەکی دوورودرێژ هەردووکیانی گرتەوە. بلێنت بە وردی سەیری رووخساری ئەلێکسی دەکرد و گوێی لە قسەکانی دەگرت. ئەلێکس بە دڵگرانییەوە لەناو کورسییەکەدا جووڵایەوە.
بلێنت پرسی:
– ئایا دەتهەوێ بۆ دوویشک کار بکەی؟
ئەلێکس شانەکانی هەڵاویشت.
– نازانم. جیاوازی لەگەڵ ئەوە نییە کە بۆ ئێوە کار بکەم.
– نا، تۆ بڕوات بەم قسەیە نییە. ناتوانی بڕوات پێی بێت.
– نامهەوێ بۆ هیچکامێکتان ئیش بکەم. حەز دەکەم بۆ قوتابخانە بگەڕێمەوە. حەز ناکەم جارێکی دیکە بتانبینمەوە.
– بریا، شتێکی ئاوا کرابا.
بۆ یەکەمینجار ئەلێکس وای هەست کرد کە بەڕێز بلێنت هاوڕێیانە و دڵسۆزانە قسەی لەگەڵ دەکات.
– با باسی شتێکت بۆ بکەم کە تووشی سەرسووڕمانت دەکات. شەش مانگ لەم رۆژە تێدەپەڕێ کە بۆ یەکەمجار یەکترمان بینی. لەم ماوە کورتەدا سەلماندووتە کە کاری خۆت بە باشترین شێوە بەڕێوەدەبەی و کارزانێکی تەواو پیشەگەری. تۆ سەرکەوتووتر لەوە بوویە کە من پێشبینیم دەکرد. بەم حاڵەوە، راستییەکەت پێدەڵێم سەد بریا یەکترمان نەدیتبایە.
– بۆچی؟

– چـونکه دەبـێ کێشـەیەك لـەئارادا بـێ. کێشـەی جـددی کـە ئـەمن و ئاسایشی ولاَتێك لەسـەر شـانی کـووڕێکی چـواردە سـاڵە بێت. بـاوەڕ بکـە زۆر خۆشـحاڵ دەبم کـە لێگـەڕێم بـەدوای کاروبـاری خۆتـدا بـڕۆی. تـۆ بـە هەمان رادە پەیوەندیت بە دونیای منەوە نییە کە من پەیوەندیم بە دونیای تـۆوە هەیـە. بـەڵام نـاتوانم لێگـەڕێم بـۆ بروکلەنـد بچـی، چـونکە تـا سـی کاتـژمێری دیکـە هـەموو قووتابیـانی قووتابخانەکـەی تـۆ دەتـوانن لـە کووژراوەکـان بـن. رەنگـە هـەزاران قووتـابی لەنـدەن بکـووژرێن. ئەمـە بەڵێنییەکە کە هاوڕێکانت لە گروپی دووپشك داویانە. منیش هیچ شکێکم نییە کە ئەوان لە بەڵێنەکەیان زۆر جدین.

– هەزاران؟

رەنـگ لـە رووخسـاری ئەلێکسـدا نـەما. چـاوەڕوانی شـتێکی ئـاوا نـەبوو. خۆی تووشی چ کارێك کردووە؟

– رەنگە زیاتریش. رەنگە چەند هەزار کەس.

– چۆن؟

– ئێمـە نـازانین. رەنگـە تـۆ بزانـی. تـەنیا ئـەوە دەزانم کـە دووپشـك چـەند داخوازی جددی هەیە. ئێمە ناتوانین داخوازییەکانیان جێبەجێ بکەین. ئـەوان وتویانـە ئەگـەر داخوازییـەکانیان جێبـەجێ نەکـەین، ئـەوا دەبـێ تاوانێکی قورس بدەین.

ئەلێکس پرسی:

– چیتان لە من دەوێ؟

– دووپشـك هەڵەیـەکی کـردووە. ئـەوان تۆیـان بـۆلای ئێمـە نـاردووە. دەمهەوێ ئەو شتەی کە بینیوتە، پێمان بڵێی. هەر قسەیەکی کە جولیا رۆدمەن پێی وتووی. ئێمە هێشتا نازانین چی رووی دەدات. پێمان وایە کە تۆ شتێکیان لێ دەزانی.

هەزاران قووتابی لە لەندەن.

*مرۆڤکووژی ئەلێکس، ئەوە بەشێك لە کاری ئێمەیە.*

ئەلێکس سەرێکی جووڵاند.

- من لەمبارەیەوە هیچ شتێك نازانم.
- ڕەنگە زیاتر لەوە بزانی کە بیری لێدەکەیەوە. دەزانم لەبارەی مندا چۆن بیر دەکەیەوە. دەزانم لەبارەی (ئێم ئای٦) چ هەستێکت هەیە. بەڵام ئایا ئامادەی هاوکاری بکەی؟

ئەلێکس سەری بەرز کرد و رووی لە رووخساری پیاوێك کرد کە بەرامبەری دانیشتووە. ئاگاداری شتێك بووە کە پێشتر هیچکات نەیبینیبوو. ئالان بلێنت ترسابوو.

- بەڵێ، هاوکاریتان دەکەم.
- زۆر باشە. خواردنەکەت بخۆ. حەمامێ بکە و جلەکانت بگۆڕە. سەرۆك وەزیران داوای کردووە کۆبوونەوەی کوبڕا پێکبێت. دەمەوێ تۆش لەم کۆبوونەوەیەدا بی.

*　　　　*　　　　*

کوبڕا

کوبڕا ناوێکی نهێنی بۆ کۆبوونەوەی ئاشنابوونە کە لە ژووری ژمارەی (الف) لە بینای ژمارە ١٠ی شەقامی داونینگ پێکدێت. کوبڕا شۆڕایەکی خێرا و لەناکاوە کە حکوومەت لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ قەیرانی گەورە پێکی دێنێت.

کاتێك کوبڕا کۆبوونەوە پێکدێنێ، سەرۆك وەزیرانیش ئامادە دەبێ. زۆربەی وەزیرەکان بەشداری کۆبوونەوەکە دەکەن. بەڕێوەبەری پەیوەندییەکان، بەڕێوەبەری فەرمانبەرانی حکوومی، نوێنەرانی پۆلیس، سوپا، پۆلیسەکانی ئاسایش و پاراستن و خزمەتکاری سیخۆڕیش بەشدار دەبوون و هەروەها فەرمانبەرانی پلەداری حکوومیش دەهاتنە ناو کۆبوونەوەکە. هەرچی رووی دەدا و هەرچی دەوترا، تۆمار دەکرا و بەجۆرێك ئەرشیف دەکرا. ڕەنگە هەندێ کەس سیاسەت بە یاریی بزانن، بەڵام کوبڕا زیاتر لەڕادە جددی بوو. ئەو بڕیارانەی کە تێیدا دەدرێن،

دەتوانێ حکوومەتێك بڕوخێنێ و ئەگەر بڕیاری هەڵە بدەن، وڵات لەناو دەچێت.
ئەلێکس رایدەریان بردە ژوورێکی دیکە بۆ ئەوەی حەمام بکات و جلەکانی بگۆڕێ. کراسی جامی جیهانی راگبی و پانتۆڵی جینی خۆی لەوێ بینی. بێشك کەسێك لە ماڵەوە بۆی هێنابوو. بە دیتنی جلەکان، هەستی بە گوناح کرد. ئەوکاتەی کە بۆ ڤێنیز چووبوو، جەکی ئاگادار نەکردبۆوە. نەیدەزانی ئایا کەسێ لە (ئێم ئای٦) زانیاری پێویستیان پێگەیاندووە یا نا. لەمە دوودڵ بوو کە شتێکی ئاوا رووی دابێ. (ئێم ئای٦) تا ئەوکاتەی ناچار نەبا، هیچ زانیارییەکی بە کەس نەدەدا.
بەڵام کاتێك پانتۆڵە جینەکەی لەبەر کرد، هەستی کرد کاغەزێك لەناو گیرفانی پشتەوەی دایە. دەستی خستە ناو گیرفانی و کاغەزێکی دەرهێنا. نامەکەی کردەوە. دەستوخەتی جەك بوو.
*ئەلێکس.*
*ئەمجارە خۆت تووشی چ کارێك کردووە؟ دوو پۆلیسی ئاسایش لەژێر پەیژەکان چاوەڕێن. کۆت و پانتۆڵیان لەبەرە و چاویلکەیان لەچاو کردووە. وابیر دەکەنەوە کە زۆر بەهۆشن، بەڵام پێموانییە گیرفانی پانتۆڵەکەت بگەڕێن.*
*هەمیشە بە یادی تۆم. ئاگات لە خۆت بێت. هەوڵی خۆت بدە و سەردانێکی ماڵەوە بکە.*
*قوربانت*
*جەك*
ئەلێکس بزەیەکی هاتە سەر لێوەکانی. ماوەیەکی زۆر بوو کە شتێکی ئاوای نەبیستبوو کە پێی خۆشحاڵ بێت.
هەر ئەمجۆرەی کە شکی کردبوو، ژووری تاکە کەسی و لێپرسینەوە لەژێر بینای سەرەکی (ئێم ئای٦)دا بوو. ئەویان بۆ پارکینگ گواستەوە کە

ئۆتۆمبێلێکی (جەگوار ئیکس جی٦)[157]ی ڕەنگ شینی چاوەڕوانی بوو. ئەلێکس و ئالان بلێنت سوار بوون و ئۆتۆمبێلیش بە جێهێشتنی پارکینگ گەیشتە شەقامی لیڤەرپول. بۆ ئەلێکس سەیر بوو کە بێ هیچ جۆرە پاڵپشت و پشتگیری، لە نزیک بەڕێوەبەری چالاکی تایبەتی (ئێم ئای٦) دانیشتبوو.

بلێنت حەوسەلەی قسە کردنی نەبوو.

– لە کۆبوونەوەکەدا لەگەڵ هەموو کێشەکان ئاشنا دەبێ. بەڵام لەکاتێکدا سواری ئۆتۆمبێل بووینە و دەچینە ناو کۆبوونەوەکە، دەمهەوێ لەبارەی گشت ڕووداوەکان کە لە دووپشك بەسەرت هاتووە، بیر بکەیتەوە. هەموو ئەو قسانەی کە گوێت لێبووە. ئەگەر کاتی زیاترم هەبا، بۆخۆم هەموو شتێکم بۆ باس دەکردی. بەڵام کوبرا ئەم کاتەی نەدامێ.

ئەم قسەیەی کرد و ڕاپۆرتێکی لە جانتاکەی دەرهێنا. لەکاتێکدا شوفێر ئەوانی بۆلای ناوچەی ڕۆژئاوای لەندەن دەبرد، لە پەنجەرەوە سەیرێکی دەرەوەی کرد. کاتژمێر نۆ و چارەك بوو. خەڵکی هێشتا بە پەلە بۆسەر کارەکانیان دەچوون. سوپەرمارکێت و دوکانەکان لەحاڵی کرانەوەدا بوون. ژیان بەشێوەی ئاسایی بەرەوپێش دەچوو، بەڵام ئەلێکس لە حاڵەتێکی زۆر خراپ دابوو. لەم ئۆتۆمبێلەدا لە تەنیشت ئەم پیاوە دانیشتووە و خوا دەیزانی بۆ کوێی دەبات.

ئەلێکس سەیری کرد و بینی کە گەیشتونەتە چێرینگ کراس[158]. ئۆتۆمبێل لە پشت چرای سووری گۆڕەپانی ترافالگار[159] وەستا. بلێنت هێشتا ڕاپۆرتەکەی دەخوێندەوە. لەناکاو فکرەیەك هاتە ناو مێشکی ئەلێکس و پرسی:

– ئایا خاتوو جۆنز ژیانی هاوسەری پێکهێناوە؟

157 - Traflagar

158 - Charing Cross

159 - Jaguar XJ6

بلێنت سەیرێکی کرد:

– ژیانی هاوسەری پێکهێنابوو.

– لە بیناکەیدا وێنەی ئەوم لەگەڵ دوو مناڵ بینی.

– بەڵێ، ئەوان منالەکانی ئەو بوون. هاوتەمەنی تۆ بوون، بەلام منالەکانی لەدەست دا.

– مردن؟

– رفێنران.

– ئایا ئێوە ژیانی هاوسەریتان پێکهێناوە.

– لەبارەی ژیانی تایبەتیمدا قسە ناکەم.

ئەلێکس شانێکی هەلاویشت. لەوە دوودڵ بوو کە بلێنت ژیانی هاوسەری پێکهێنابێت.

لە وایت هال تێپەڕین و بولای راست سووڕانەوە و لە دەرگایەك تێپەڕین کە پێشاوپێش کرابۆوە. ئۆتۆمبێل وەستا و ئەلێکس هاتەخوارێ. ئەو رەنگە بەرامبەر بە ناودارترین پیاوی دونیا وەستابوو. دەرگا کرابۆوە. پۆلیسێك هاتەپێش بۆئەوەی رێنوێنی بکات. بلێنت پێشاوپێش لە شوێنێکدا خۆی حەشاردا. ئەلێکس بەرێکەوت.

ناو ژووری بینای ژمارە ١٠ی شەقامی داونینگ بۆ ئەلێکس سەیر دەهاتەبەرچاو. دوو سێ بەرامبەر گەورەتر لەوە بوو کە چاوەڕوانی دەکرد. میچی بەرز و رێڕەوێکی زۆر کە مەوداکەیان زۆر بوو. لوستەری گەورە لە میچ هەلواسرابوون. دیوارەکانیان بە تابلۆی هونەری رازاندبۆوە.

پیاوێکی بالابەرز بە مووی ماش و بەرنجی کە کۆت و پانتۆلێکی بەشێوازی کۆنی پۆشیبوو و ریباتێکی رێ رێی بەستبوو، پێشوازی لێکرد.

– ئێ، ئێوە ئەلێکس رایدەرن؟

ئەمەی وت و دەستی بولای ئەلێکس درێژ کرد.

– ناوم گراهام ئەدێرە.

بەجۆرێك سەیری ئەلێکسی دەکرد کە واپێدەچوو دەیناسێت. بەلاّم ئەلێکس لەوە دوودڵ نەبوو کە پێشتر هیچکات یەکتریان نەدیتبوو.
بلێنت رووی لە ئەلێکس کرد و وتی:
- سێر گراهام راوێژکاری هەمیشەیی کابینەیە.
- من لەبارەی تۆدا زۆرم بیستووە، ئەلێکس. لە دیتنت خۆشحاڵم. من زۆرت پێ قەرزدارم. زیاتر لەوڕادەیە کە بیری لێبکەیتەوە.
- سوپاست دەکەم.
نەیدەزانی سێر گراهام دەیهەوێ چی بڵێت. نەیدەزانی کە ئەو لە ململانێیەکی پێشووی ئەودا رۆڵی هەبووە یا نا.
- وادیارە تۆ لە کۆبوونەوەی کوبڕادا بەشداری دەکەی. زۆر خۆشحاڵم. بەلاّم دەبێ ئاماژە بەم خاڵە بکەم کە رەنگە لەناو بەشداربووانی ئەمڕۆدا کەسانێك هەبن کە تۆ بناسن.
ئەلێکس وتی:
- لەگەڵی راهاتووم و خووم پێوە گرتووە.
- بەڵێ، بێشك ئەمجۆرەیە. بەم لایەدا وەرە. متمانەم پێتە و بێشك دەتوانی یارمەتیمان بدەی.
ئەلێکس بەدوای راوێژکاری هەمیشەیی لە رێرەوەکەدا بەڕێکەوت. گەیشتنە ژوورێك کە لانیکەم چل کەس دەورەی مێزێکی کۆنفرانسیان دابوو. ئەلێکس سەیرێکی کردن. زۆربەیانی دەناسی. سەرۆك وەزیران لەسەرووی هەموویان دانیشتبوو. جێگری سەرۆك وەزیران لە تەنیشتی بوو. وەزیری کاروبارەی دەرەوە بە دڵەڕاوکێیەوە یاری بە ریباتەکەی دەکرد.
کەسێکی دیکە کە رەنگە وەزیری بەرگری بوو، لەتەنیشتی دانیشتبوو. زۆربەیان کۆت و پانتۆڵیان لەبەر بوو، بەلاّم هەندێکیشیان ئۆنیفۆرمیان لەبەر بوو. تەواوی بەشداربووانی ناو کۆبوونەوە کلاسۆرێکی گەورەیان لەپێش بوو. دوو ژن، لەکاتێکدا جلی فەرمیان لەبەر بوو، لەپێش کۆمپیوتەرێك بۆ تایپ کردن دانیشتبوون.

بلێنت، ئەلێکسی بۆلای کوورسییەك ڕێنوێنی کرد کە کەسێکی تێدا دانیشتبوو. چەند کەسێك سەریان بۆلای ئەلێکس وەرگێڕا، بەڵام کەس قسەی نەکرد.

سەرۆك وەزیران لە جێگەی خۆی هەستایە سەرپێ. ئەلێکس هەستی کرد کە بەتەمەنتر لەوەیە کە لە تەلەڤزیۆنەوە بینیویەتی. واپێدەچوو لەوە پیرتر بێ.

هەموویان بێدەنگ بوون،

– بەیانیتان باش.

کۆبوونەوەی کوبرا دەستی پێکردبوو.

## کۆنترۆڵ لە ڕێگەی دوورەوە

ماوەی سێ کاتژمێر بوو گفتوگۆیان دەکرد.
سەرۆك وەزیران نامەی دووپشکی خوێندبۆوە. کۆپییەك لەو نامەیە لەپێش هەموو بەشداربووەکان دانرابوو. ئەلێکس بە ناباوەڕانە نامەکەی خوێندبۆوە. هەژدە بێ تاوان تا ئێستا گیانیان لەدەست دابوو و لەم ژوورەدا هیچکامێکیان نەیدەزانی ڕووداوەکە چۆن ڕووی داوە. ئایا دووپشك هەڕەشەکەی لەبارەی کووشتنی منداڵەکان بەڕێوەدەبرد.
ئەلێکس لەمە دوودڵ نەبوو. کەس راوسەرنجی ئەوەی نەویستبوو. لە سەرەتای کۆبوونەوەکەدا بە دەیان جار ئەم پرسیارە دووبارە کرابۆوە. لانیکەم نیوەی بەشداربووانی کۆبوونەوەکە گاڵتەیان بەم هەڕەشەیە دەکرد. نیوەی دیکەشیان پێیان وابوو کە گووشار بخەنە سەر ئەمریکا کە خواستی دووپشك بەجێبگەیەنێ.
بەڵام شتێکی ئەمجۆرە نەدەکرا. وەزیری کاروباری دەرەوە لەگەڵ بالیۆزی ئەمریکا قسەی کردبوو. ئەمریکاییەکان لە وەڵامدا وتبوویان داواکارییەکانی دووپشك جێبەجێ ناکرێ. وتبوویان داواکارییەکی گێلانەیە. بێشك عەقڵیان لەدەست داوە. سەرۆك کۆماری ئەمریکا پێشنیاری دابوو بە هاوکاری لەگەڵ (ئێف بی ئای) ڕێکخراوی دووپشك لەناوبەرن. دووسەد چەکداری نوخبەی ئەمریکا لەمکاتەدا لە ڕێگە بوون و ئەوەندەیان نەمابوو بگەنە لەندەنی پایتەختی ئینگلتەرا، بەڵام هیچ شتێکی دیکەیان پێنەدەکرا. ئینگلتەرا بەحاڵی خۆی وێڵ کرابوو.
ئەم کاردانەوەیە توورەییەکی زۆری کوبڕای پێکهێنابوو. جێگری سەرۆك وەزیران مستێکی توندی لە مێزەکە دا.

– ئـەوە گێلانەیـە. ئابڕووچـوونە. ئێمـە لـە هـەموو شـوێنێك یارمـەتی ئـەمریکامان داوە. ئێمـە نـزیکترین یـەکگرتووی ئـەوانین، بـەڵام ئـەمجۆرە وەڵاممان دەدەنەوە.

وەزیری کاروبارەی دەرەوە وتی:

– ئەوە رێك ئەو قسەیە نییە کە ئەوان وتوویانە. ئەوان ناتوانن کارێکی دیکە بکەن. سەرۆك کۆمار دەڵێ ئەم داواکاریانە جێبەجێ ناکرێن.

– دەیانتوانی گفتوگۆ و دانوستان بکەن!

– بەڵام لـە نامەکەیانـدا نووسـیویانە کـە بەهیچ شێوە جێگـەی گفتوگـۆ و پاشگەزبوونەوە نەماوە.

– بەڵام ئەوە قسەی ئەوانە. دەیانتوانی هەوڵی خۆیان بدەن.

ئەلێکس گوێی لە قسـەی ئـەم دووە گرتبـوو. هیچکامیان لەڕاسـتیدا گـوێی لـە قسـەی ئـەویتر رانـەدەگرت. کاروبـاری حکوومـەتیش هەربـەم شـێوەیە بەڕێوەدەچوو.

دوایی نۆرەی راپۆرتی پزیشکی گەیشتێ کە شی بکاتەوە چۆن یاریزانانی تۆپی پێ کووژراون.

ئەو وتی:

– هەموویان بەژەهر لەناوچوونە.

پیاوێکی کورتـەباڵا بـوو کـە رووخسـارێکی خـڕی هـەبوو. هـەوڵی دابـوو بـۆ ئەم کۆبوونەوەیە جلی فەرمی لەبەر بکات، بەڵام ئەلێکس ئاوای بەمێشـکی داهات کە لە تەواوی تەمەنیدا کۆتی سپی لەبەر کردووە.

– ژەهر لە جۆری سیانوور بووە کە راستەوخۆ گەیشتووەتە دڵ.

یەکێ لە ئەفسەرانی پۆلیس پرسی:

– چۆن سیانووریان لەخوارد داون؟

– هیشـتا نـازانین. بە درەزی لێیـان نەدراوە. لەسـەر پێسـتیان دیـار نییـە. بەڵام لەناو خوێنیان وردە زێڕی زۆر بچووکمان بینی.

– زێڕ؟

بەڕێوەبەری پەیوەندییەکان کە لە تەنیشت سەرۆك وەزیران دانیشتبوو بۆ یەکەمجار قسەی کرد و هەموو بەشداربووان سەیریان کرد.

– بەڵێ، بەڕێز کێلنر. سەرنجی ئێمە ئەوەیە کە زێڕ ئەوانی کوشتووە، بەڵام ئەم زێڕە لە خوێنی گشت یاریزانەکاندا بە شێوازێك دەبینرێ.

کێلنر لە جێگەی خۆی هەستایە سەرپێ.

– بەبڕوای من هەموو شتێك دیارە.

نیگایەکی ساردی هەبوو و ئەلێکس هەستی کرد کە ناخۆشی دەوێت. ئەو لە بروکلەند منداڵانی وەکوو ئەوی بینیبوو.

– هەموو ئەم یاریزانانە ڕێك لە کاتێکدا مردن کەواتە دەکرێ ئەمە بڵێین ئەوان هەموویان بەیەکەوە ژەهرخوارد کراون. لەکوێ ئەگەری ئەوە هەیە ئەم ڕووداوە ڕووی دابێت؟ ئێ، بێشك هەموویان لەناو فڕۆکەدا بوونە. من پرسیارم کرد. فڕۆکە شەش کاتژمێر و پێنج خولەك لە ئاسماندا بووە. چەند خولەکێك دوای هەستانی فڕۆکە لە لاگوس، نانی نیوەڕۆیان خواردووە. بێشك سیانوور لە خۆراکی ئەواندا بووە کە کاتێك گەیشتوونەتە هیترۆ، کاریگەری خۆی داناوە.

جێگری سەرۆك وەزیران پرسی:

– یانی سیلاحێکی نادیاری وێرانگەر لەکاردا نەبوو؟

کێلنر چەند جارێك پێلوەکانی لەسەر یەك دانا.

– کەواتە مەبەستی دووپشك لە شەمشێری نادیار چییە؟

– دویانهەوێ فریومان بدەن. دەیانهەوێ ئێمە وەشك و گومان بخەن کە لەرێگەی دەزگەی کۆنترۆڵ لە ڕێگەی دوورەوە دەتوانن بمانکوژن....

*کۆنترۆڵ لە ڕێگەی دوورەوە*. بۆ ئەلێکس مانابەخش بوو. لە کۆشکی بێوەژن کۆنترۆڵ لە ڕێگەی دووری بینیبوو. ئەو چی بوو؟

– بەڵام شەمشێری نادیار لەئارادا نییە. هەوڵ دەدەن ئێمە فریو بدەن.

واپێدەچوو پزیشك قسەکانی کێلنری بەلاوە خۆش نییە.

- پێموانییه ئێوه راست بکەن، بەڕێز کێلنر. رەنگە هەموویان بەیەکەوە سیانووریان خواردبێ، بەڵام میتابولیزمی یاریزانەکان جیاوازی هەیە. ژەهر دەبێ لە هەندێ کەسدا زووتر کاریگەری خۆی نیشان بدات.
- ئەوان هەموویان وەرزشوان بوون. دەبێ میتابولیزمیان وەکوو یەك بێت.
- نا، بەڕێز کێلنر. من قسەی تۆم قبووڵ نییە. دوو کەسیان راهێنەر و یەکێکیشیان سەرپەرەشتیار بووە.
- یاریزانەکان لەبیر بکەن. هەرکەسێ بوونە، شەمشێری نادێر بوونی نییە. ئەوانە گاڵتەمان پێدەکەن. داواکارییەکیان هەیە کە کەس ناتوانێ قبووڵی بکات. بە شتێك هەڕەشە لە ئێمە دەکەن کە زۆر بە ئاسانی ناتوانێ روو بدات.
- بەڵام پێموانەبێ ئەمە شێوەکاری دووپشك بێت.

ئەلێکس لەوەیکە بینی بلێنت ئەم قەسەیەی کرد، بەلایەوە سەیر بوو. بەڕێوەبەری چالاکیی تایبەتی (ئێم ئای٦) لە لای چەپی ئەو دانیشتبوو. دەنگێکی ئارام و لەسەرەخۆی هەبوو.
- ئێمە پێشتر لەگەڵیان رووبەڕوو بووینەتەوە. هەمیشە لەسەر قسەکانیان سوورن و بەجێی دەگەیەنن.
- ئێوە لە هیترۆ بوون، بەڕێز بلێند. بەبڕوای تۆ چی رووی دا؟
- نازانم؟.
- زۆر یارمەتیت کردین، غەیری ئەوەیە؟ بەڕێوەبەری ئاسایشی نەتەوەیی لەناو کۆبوونەوەدا بەشداری دەکات و هیچ قسەیەکی پێ نییە.

ئێستا وادیار بوو کە مارك کێلنر بۆ یەکەمجار هەستی بە بوونی ئەلێکس لە کۆبوونەوەکەدا کردووە.
- زۆر سەیرە کە منداڵێکی قووتابخانەتان لەگەڵ خۆتان هێناوە. ئایا کوورِی خۆتانە؟
- ئەو ئەلێکس رایدەرە.

ئێستا نۆرەی سێر گراهام ئەدێر بوو کە قسە بکات. چاوە ڕەشەکانی لە ڕووخساری کێلنر بڕیبوو.

– هەر ئەمجۆرەی کە دەزانن، ئەلێکس تا ئێستا چەند جارێك یارمەتی ئێمەی داوە. دەبێ ئەوەشتان پێبلێم کە ئەو دوایین کەس لە ئێمەیە کە پەیوەندی بە دووپشکەوە هەبووە.

– ڕاستی، چۆن چۆنەکایی بووە؟

بلێنت وتی:

– من ئەلێکسم بۆ ڤێنیز نارد.

ئەلێکس بەلایەوە سەیر بوو کە بلێنت چۆن بە ئاشکرا درۆ دەکات.

– دووپشك فێرگەیەکی لە دوورگەی مالاگوستو هەیە و پێویست بوو هەندێ زانیاری لەبارەیدا بەدەست بێنین. هەربۆیەش ئەلێکسم بۆ ئەوێ نارد. ئەو لەو فێرگەیەدا ماوەیەك دەورەی بینی.

یەکێ لە سیاسەتمەداران کۆخەیەکی کرد.

– ئایا ئەمکارە پێویست بوو، بەڕێز بلێنت؟ ئەگەر خەڵکی بزانن کە حکومەت لە منداڵێکی قووتابخانە بۆکارێکی ئاوا مەترسیدار کەڵکی وەرگرتووە، زۆر بە خراپ لەسەرمان دەکەوێتەوە.

بلێنت وتی:

– وابزانم کاتێکی باش بێت بۆئەوەی ئەم مەسەلەیە شی بکەمەوە.

بەڕێوەبەری پۆلیس گێژ و سەرلێشێواو دیار بوو. ئەو پیاوێکی مەست بوو کە ئۆنیفۆرمێکی شینی لەبەر کردبوو.

– ئەگەر ئێوە دووپشك دەناسن و جێگاکەشی پێدەزانن، بۆچی لەناویان نابەن. بۆچی پیاوانی ئاسایشی و پاراستن نانێرن تا جەماوەرێکی زوریان لێ بکووژن؟

بلێنت وەڵامی دایەوە:

– حکومەتی ئیتاڵیا پێی خۆش نابێ کە ئێمە بچینە ناو وڵاتەکەیان. لەوە بگوزەرێ، ئاواش بە ئاسانی نییە. دووپشك ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتییە. ئێمە هەندێ لە ڕێبەرانیان دەناسین، بەڵام هەموویان ناناسین. ئەگەر

شاخەیەکیان لەناو بچێت، خێرا شاخەیەکی دیکە جێگەیان پڕ دەکاتەوە و دوایی ئەوانیش بیر لە تۆڵە دەکەنەوە. دووپشک هیچکات نابەخشێ و لەبیریش ناکات. دەبێ ئەوەش بزانن کە دووپشک بەزۆری بۆ مشتەری کار دەکات و هەر بۆیەش دوژمنی سەرەکی ئێمە ئەو مشتەریەیە.

کێلنر پرسی:

– ئەلێکس رایدەر لە مالاگوستو چی بەدەست کەوت؟

نەیدەویست تەسلیمی بلێنت و لە ئەو خراپتر، کوورپێکی چواردە ساڵە بێت.

ئەلێکس هەستی کرد هەموویان سەیری ئەو دەکەن.

– خاتوو رۆدمەن منی بۆ خوارندی نانی شەو بانگهێشت کرد. ئەو ئاماژەی بە شەمشێری نادیار کرد، بەڵام زیاتر لەوە شی نەکردەوە.

کێلنر پرسی:

– خاتوو جولیا رۆدمەن کێیە؟

بەڕێز بلێنت وتی:

– ئەو لەسەر کوورسی بەڕێوەبەرایەتی دووپشک دادەنیشێت. ئەو یەکێک لە نۆ ئەندامەکانی ئەم گروپەیە. ئەلێکس لە ئیتاڵیا ئەوی بینیوە.

کێلنر وتی:

– زۆر باشە. بەڵام ئەگەر ئەلێکس زیاتر لەوە قسەی نەماوە، پێویست ناکات لەمانەوەی بەردەوام بێت.

ئەلێکس وەبیری هاتەوە کە لە کۆشکی بێوەژن شتێکی لەبارەی زنجیری سارد بیستووە.

– باسێك لەبارەی زنجیری ساردیش هەیە کە دەبێ ئاماژەی پێبکەم. نازانم چ مانایەکی هەیە، بەڵام واپێدەچێت پەیوەندی بە کێشەکەوە هەبێت.

لە گۆشەی لایەکی ژوورەکە ژنێکی لاو کە جلێکی جوان و رازاوەی پۆشیبوو، لەسەر کوورسییەکەی هەستایەسەرپێ و سەیرێکی ئەلێکسی کرد.

بەڵام کێلنر جووڵەیەکی کرد و وتی:
– داوامان لێدەکەن بڕوایان پێبکەین کە دووپشک دەتوانێ هەزاران منداڵ و قووتابی بکوژێت. دەڵێن سبەی کاتژمێر چواری نیوەڕۆ ئەمە روو دەدات.
یەکێك لە ئامادەبووانی کۆبوونەوەکە وتی:
– سبەی کاتژمێر چوار قووتابخانەکان دادەخرێن،
– ئەمکارە دەکرێ. کوژرانی یاریزانانی یاری تۆپی پێ وەکوو زەنگێکی ئاگادارکردنەوە و مەترسیدار بوو. ئەوان دەیانهەوێ بمانترسێنن و شتکە بە فەرمی وەربگرین. ئەگەر ئەمکارە بکەین، ئابڕوی حکومەت دەچێ.
سێر گراهام ئەدێر پرسی:
– کەواتە، پێشنیاری ئێوە چییە، دەبێ چی بکەین؟
– ئیهمالیان بکەین. پێیان بڵێن هەرچی لەدەستیان دێت، با بیکەن.
– ناتوانین ئەمکارە بکەین.
وەزیـــری کاروبـــاری دەرەوەش وەکـــوو ئـــەوانیتر لـــە کێلنـــر دەترســـێ، بەمحاڵەشەوە ویستی قسەی خۆی کردبێ.
– هیچ ریسکێك لەئارادا نییە. بۆ خوولەکێك بیر لەم مەسەلەیە بکەنەوە. یاریزانـەکانی تـۆپی پـێ بـە ژەهـری سـیانوور کـوژراون. ئـەوان بەشـێوەی هاوکات لـە فڕۆکەدا بوونـە. ژەهراویکردنیـان کـارێکی دژوار نـەبووە. بـەڵام ژەهرخوارد کردنی هەزاران قووتابی ناکرێ. چۆن دەتوانن ئەمکارە بکەن؟
ئەلێکس وتی:
– کووتان.
جارێکی دیکە هەموویان سەیری ئەویان کرد.
ئـەو خێـرا رای خـۆی دەربڕیبـوو. وەبـیر گەشـتێك کەوتـەوە کـە ماوەیـەك پێشتر بۆ ئەمریکای باشووری هەبوو. دوایی وەبیر ئەوشتانە کەوتـەوە کـە لـە کونسـانتو بینیبـووی. بۆرییـەکانی تاقیکردنـەوە. ئەوانـە بۆچـی بـوون. ئێسـتا پەیوەنـدی دکتـۆر لیبەرمـەنی لەگـەڵ ئـەم کێشـەیە وەبـیر هاتـەوە.

باسێکی دیکەش لەئارادا بوو. کاتێك ئەو لەگەڵ خاتوو رۆدمەن خواردنی شەوی دەخوارد، نوکتەیەکی لەبارەی زانایەکدا وتبوو.

*رەنگە بکرێ بڵێین کە مردنی سرنجێك لە قوڵی هەموومانـدا بوو.*

سرنج لە قوڵ. لێدانی دەرزییەك، کووترانێك.

ئەلێکس وتی:

- هەموو قووتابییەکانی لەندەن لە کاتێکی دیاریکراو دەکوترێن.

ئێستا بۆ جارێکی دیکە ئەلێکس سەرنجی ئامادەبووانی بۆلای خۆی راکێشا. سەرۆك وەزیران، نیوەی کابینەکەی، بەڕێوەبەری پۆلیس و سوپا، بەرپرسانی پایەبەرزی حکوومی، هەموو ئەو دەسەڵاتدارانەی کە لە کۆبوونەوەکەدا بوون گوێیان لە قسەی ئەلێکس بوو. ئەلێکس بەردەوام بوو:

- کاتێك لە کونسانتۆ بووم، بۆرییەکی زۆری تاقیگەم بینی کە جۆرە ئاوێکیان تێدابوو. لەوە بگوزەرێین، سینییەکی زۆریشم بینی کە پڕ لە شتێکی هاوشێوەی هێلکەیان لەسەر بوو.

پزیشکی ئامادەبوو وتی:

- هەندی لە واکسینەکان لەناو هێلکەدا پەروەردە دەکرێن. کونسانتۆ یەکێ لە هەناردەکردنەکانی واکسین بۆ هەموو جیهانە. وابزانم ئەمە پەیوەندی بە زنجیری ساردیشەوە هەیە. ئاماژە بە هێنان و بردنی واکسینەکانە. واکسین دەبێ لە کەشێکی دیاریکراودا ئاگاداری لێبکرێ. ئەگەر زنجیر بپچڕێنن، واکسینەکە کەڵکیان نامێنێ.

سێر گراهام ئەدێر وتی:

- بەردەوام بە ئەلێکس.

- من بینیم کەسێکیان بەناوی دکتۆر لیبەرمەن کووشت. ئەو لە کونسانتۆ کاری دەکرد. جولیا رۆدمەن بە منی وت پارەیەکی زۆریان داوەتێ کە کاریان بۆ بکات. رەنگە ئەو شتێکی بە واکسینەکانەوە زیاد کردبێ. جۆرێك ژەهر کە بڕیارە لە قووتابییەکان بدرێ. هەمیشە لە دەسپێکی کۆرسی خوێندن منداڵەکان دەکوترێن و واکسینە دەکردرێن.

ئەدێر سەیرێکی لە پزیشکی رێکخراوی ئاسایشی کرد کە ئەویش بەنیشانەی بەڵێ سەری دانەواند.

– بەڵێ راستە. هەفتەی رابردوو لە لەندەن منداڵەکانمان بە (BCG) واکسینە کرد.

– هەفتەی پێشوو!

مارك کێلنر خۆی هاویشتە ناو قسەکانیان. شێوازی دەنگی بچووکترین گۆڕانکاری پێدانەهاتبوو. ئەو نەیدەتوانی ئەم قسانە قبووڵ بکات.

– ئەگەر هەفتەی رابردوو ژەهریان خستبێتە ناو واکسینەکانی منالآن، بۆچی تا ئێستا نەمردوون؟ ئەم خاتوو رۆدمەنە چۆن دەیهەوێ ئەم ژەهرانە رێك کاتژمێر چواری دوانیوەڕۆ چالاك بکات و هەزاران منالی پێ بکووژێت؟

چەند کەسێك سەریان بە نیشانەی قبووڵ کردنی ئەم قسەیە دانەواند.

– پیشم وا نییە کە یاریزانەکان ئەم دەرزیەیان لێدرابێ، ئەویش لە دەرەوەی ولآت. رەنگە بلێن کە من لە هەڵە دام.

راوێژکاری هەمیشەیی کابینە بە دەنگێکی توند وەلآمی دایەوە:

– بێشك ئەوانیش واکسین کراون.

ئەلێکس دەیدیت کە ناتوانن تووڕەیی خۆیان کۆنترۆڵ بکەن.

– ئەوان لە نیجریا بوون و ئەگەر واکسین نەکرابان، رێگەیان پێنەدەدرا بچنە ئەم ولآتە.

پزیشکەکە بە سەرسووڕمانەوە وتی:

– بەڵێ، ئەوانیش کوتراون و واکسینی تای زەردیان لێدراوە.

کێلنر وتی:

– مانگێك پێش بوو!

سێر گراهام وتی:

– کێشەکە ئەوە نییە کە چۆن ژەهرخوارد دەکرێن. کێشەکە ئەوەیە کە چۆن دەتوانن رێك لە کاتێکی دیاریکراودا ئەم ژەهرە وەگەڕ بێخن. ئەمە نهێنی شەمشێری نادیارە.

بلێنت پرسی:
- دەتوانی چیترمان پێ بڵێی؟
ئەلێکس وتی:
- ئێوە باسی کۆنترۆڵی ڕێگەی دوور دەکەن. خاتوو ڕۆدمەن بەبرێکی سیبریایی لە ژووری کارەکەی رادەگرێت. ئەم بەبرە هێرشی کردە من و وام هەست کرد دەمکووژێت -
کێلنر پرسی:
- ئایا بەڕاستی دەتهەوێ باوەڕ بەم قسەیە بکەین؟
ئەلێکس وەڵامی نەدایەوە و وتی:
- دوایی کەسێك هات و پەنجەی بە دوگمەی دەزگەیەکەوەنا کە وەکوو کۆنترۆڵی ڕێگەی دوور دەچوو. بەبرەکە خێرا لە تەختایی ژوورەکە راکشا و خەوی لێکەوت.
- نانوشل[١٦٠].
ژنێکی گەنج کە لە گۆشەیەکی ژوورەکە دانیشتبوو و ئەلێکسی وەبەرچاو گرتبوو، ئەم وشەیەی وت. ئەو ئەوەندە گرنگ نەدەهاتەبەرچاو کە لەسەر مێزەکە کوورسییەکیان پێنەدابوو. سی ساڵە دەهاتەبەرچاو. دوای ئەلێکس، کەم تەمەنترین بەشداربووی کۆبوونەوەکە بوو. جلێکی سپی رەنگی لەبەر بوو و ملوانکەیەکی زیوی خستبووە گەردەنی.
جێگری سەرۆك وەزیران پرسی:
- ئیتر نانوشل چییە؟ ئێوە کێن؟
پزیشکی رێکخراوی سیخووری وتی:
- ئەمە دکتۆر راشل ستیفنسۆن[١٦١]ە. نووسەر، توێژەر و پسپۆر لە بواری نانوتەکنەلوجیایە.
کێلنر توورە بوو و بەشێوەیەکی ناڕەزامەندیانە وتی:

---

[160] - Nanoshell
[161] - Dr. Rachel Stephenson

– بەم حسێبەوە، دەچینە ناو چیرۆکەکانی زانستییەوە.
دکتۆر ستیفنسۆن وەڵامی دایەوە:
– چیرۆکیٚ لەئارادا نییە. نانوتەکنەلۆجیا کەڵك وەرگرتن لە جۆرێك یەکەی ئەتۆمییە. زانکۆکان، کۆمپانیاکانی خۆراکی، کارگە و کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنانی دەوا و دەرمان و هەڵبەت سوپاساڵانە بە ملیۆنەها پاوند بۆ بەرنامەی بەرهەمهێنانیی خەرج دەکەن. لە ماوەیەکی کورتدا گشت حەسارەکان گۆڕانکاریان بەسەردا دێت.
سەرۆکی وەزیران وتی:
– لەبارەی نانوشل زیاتر شی بکەوە.
– بەڵیٚ، گەورەم.
دکتۆر ستیفنسۆن هۆش و هزری خۆی کۆ کردەوە و وتی:
– یەکەم جار لەبارەی وردکە زێڕ بابەتێکمان گویٚ لێبوو. وەبیر نانوشل کەوتمەوە. بەڵام ئەلێکس بابەتەکەی بەتەواوی شی کردەوە. بوارەکە زۆر تێکەڵاوە و دەزانم کە کاتێکی زۆرم لەبەردەستدا نییە. بەڵام هەوڵ دەدەم بە کورتی ئاماژەی پێبکەم.
کوتران دەبیٚ وەڵامی ئەم کێشەیە بێت. ئەم گروپە سەرەتا بە بیانووی نەخۆشی تای زەرد دەرزیان لە یاریزانەکان داوە. هەر خوا دەزانیٚ چەند منالٚ بە نانوشل و پێستەی زێڕ کوتراون.
ئێستا نەختێك بێدەنگ بوو.
– ئێمە باسی فیشەکیٚ دەکەین کە زۆر وردە. یەك سەدەمی نانومەتر. هەرئەمجۆرەی کە دەزانن، یەك نانومەتر یەك ملیاردەمی یەك مەترە. ئەگەر رێکتر و وردتر بیڵێم، داوە موویەکی سەری ئێوە پانتاییەکەی بەرامبەر بە یەك سەد هەزار نانومەترە. کەواتە هەر یەك لەم فیشەکانە هەزار جار بچووکتر لە نووکی مووی مرۆڤە.
ئێستا ئەو خوار بۆوە و دەستەکانی خستە سەر مێزەکە. هیچ کەسیٚ جووڵەی نەکرد. جگە لە هەناسە هیچ شتێکی دیکە نەدەبیسرا.
– بەڵام ئەم فیشەکانە لە چی درووستکراون.

- هەرکەس دەتوانێ رای خۆی بدات. بەڵام شتێکی وەکوو مالتسێر[١٦٢].
لەبیر مەکەن کە من لەبارەی چەند مولوکۆلەوە قسە دەکەم. پلیمر[١٦٣]
هەموو شتێ بەیەکەوە رادەگرێ و بە ئاسانی لەگەڵ سیانوور تێکەڵ دەبێ.
کاتێك پلیمر و سیانوور ئازاد دەبن، تاك دەمرێت.
- بەڵام چ شتێك دەبێتە هۆی ئەم ئازادبوونە؟ هەمان چوکلێتی سەر مالتسێر - بەم جیاوازییە کە ئێستا باسی زێر لەگۆڕێدایە. هەموو ئەم کارانە لەلایەن دکتۆر لیبەرمەن بەڕێوەچووە، هەمان پیاوەی کە لەلایەن دووپشکەوە کووژراوە.
دووبارە بێدەنگی ژوورەکەی داگرت.
- بمبوورن. رەنگە بوارەکەم زۆر تێکەڵاوتر کرد. بەڵام ئەوەی گرنگە ئەمەیە کە ناو فیشەکەکە ژەهری تێدایە و فیشەکەکەش بە، پرۆتین دادەپۆشرێ.
کەسێکیان پرسیاری کرد: ئەم پرۆتینە چییە؟
- هەموو شت رێنوێنی دەکات. وەکوو موشەکێکی کۆنترۆڵکراوی رێگەی دوورە. شی کردنەوە هەموو ئەم شتانە زۆر کات دەبات. بەڵام پرۆتین دەتوانێ رێگەی خۆی لە جەستەی مرۆڤدا بدۆزێتەوە. ئەوان باش دەزانن رێك بۆ کوێ بچن. کاتێك نانوشل لێدرا، پرۆتین ئەو بۆ لای دڵ رێنوێنی دەکات.
بلێنت پرسی:
- چەند نانوشل بۆ لێدان پێویستە؟
دکتۆر ستیفنسۆن وەڵامی دایەوە:
- ئەم پرسیارە وەڵامی نییە. رێك دەچێتە ناو دڵ. کاتێك ژەهرەکە ئازاد بوو، خێرا چالاك دەبێت. پێویستییەکی ئەوتۆتان پێی نییە. لەڕاستیدا، ئێمە لەبارەی کاریگەری نانوشل لەسەر جەستەی مرۆڤ لێکۆڵینەوەمان

[162] - Malteser
[163] - Polymer

کـردووه و وابـزانم بکـریٚ لـه ئـەو بـۆ دەرمـانی شـێرپەنجه سـوودی لێوەربگیرێت. بەڵام دووپشك کاریٚ بە دەرمان نییە. هەموو پلانی ئەوان کووشتنە. بەڵام خاڵێکی دیکەش لەئارادایە.
ئاوێکی ئەوەنده زۆر لەناو کووتانی (BCG)یدا نییە. تەنیا بەڕادەی یەك پەنجایەمی کەوچکێکی چایخۆری. بەڵام وابزانم بۆ هەر هەزار یەکەی واکسین، یەك دنك سیانوور پێویست بێت. کە ئەمە زیاتر لە یەك ملیار نانوشله و تەنیا دەتوانیٚ نووکی سرنجێك داپۆشی.
– بەڵام ئێوە باسی ئەوەتان کرد کە ئەم ژەهرە داپۆشراوە. یانی بە زێڕ پارێزگاری لێدەکرێت.
– بەڵیٚ، بەڵام زیرەکی ئەمانە لێرەدا بەدیار دەکەویٚ. پلیمر و ژەهر دەچنە ناو زێڕ. دەچنە ناو دڵ و کەس برینداز و زامدار ناکات. بەڵام دووپشك دەتوانیٚ زێڕەکە بشکێنێت و هەر ئەمجۆرەی کە ئەلێکس وتی، ئەمکارە لە ڕێگەی دوورەوە دەکەن. ئایا تا ئێستا هێلکەیەکتان خستووەتە ناو مایکرۆفێر، دوای چەند چرکە دەتەقیٚ. لێرەشدا هەر بەم شێوەیەیە.
– یانی دەڵێی دووپشك لە ماهوارە کەڵك وەردەگرێت؟
– بەڵیٚ، بەڕێزم. بەڵام لەڕاستیدا پێویستیان بە ماهوارە نییە. کاتێك پاریزانەکان لە فڕۆکەخانەی هیترۆ لە فڕۆکە هاتنە خواریٚ، ئەوان توانیان لە ڕێگەی دیشەکانی ماهوارە کە لەسەر چەند بینایەك هەیانبوو، ژەهرەکە چالاك بکەن و پاریزانان بکووژن.
سێر گراهام ئەدێر پرسی:
– ئایا ئەگەری ئەوە هەیە نانوشلەکان لەخۆیانەوە چالاك بن؟
– نا، شتێکی ئاوا ڕووی نادات. دەبیٚ ئەستوورایی زێڕەکە بزانن. ئەمجۆرە دەزانن لە چ فرێکانسێك کەڵك وەربگرن. بەبڕوای من، ئەلێکس بابەتەکەی لەناو بەبرەکەدا بینیوە. ئەگەری زۆر بووە ماددەی هێورکرەوەیان بە بەبرەکە دابیٚ و بە کەڵك وەرگرتن لە دەزگەیەکی کۆنتڕۆڵی ڕێگەی دوور، ئەم ماددەیە چالاك دەکریٚ بۆئەوەی بەبرەکە بخەویٚ.

– کەواتە، ئەگەر ئەوان لە ماهوارە کەڵك وەربگرن، ئێمە بەدوای چی داین؟
– دیشێك، دەتوانێ وەکوو دیشێکی تەلەڤزیۆنی بێت، بەڵام نەختێك گەورەتر بێت. ئەمجۆرەی کە دەڵێن، دەیانهەوێ منالآنی لەندەن بکووژن و کەواتە ئەم دیشە دەبێ لە شوێنێکی لەندەن دابێت. رەنگە ناوی شەمشێری نادیاریان لێنابێ، بەڵام لەڕاستیدا وەکوو تیرێکە کە لە دیشێکەوە دەهاویشترێ.
– چ ماوەیەکی پێدەچێ بۆئەوەی زێڕەکە بشکێت؟
– چەند خوولەك، یا کەمتریش.
دکتۆر ستیفنسۆن لەسەر کوورسییەکەی دانیشت. قسەیەکی دیکەی بۆ وتن پێنەمابوو.
سەرۆك وەزیران سەیری بەڕێوەبەری پەیوەندییەکانی کرد کە سەری داخستبوو و نینۆکەکانی دەجووت. هەموو چاوەڕوانی ئەوە بوون کە ئەو قسەیەك بکات.
کێلنر وتی:
– زۆر باشە، ئێستا هەموو شتێك دەزانین. بەڵام ئێستا دەبێ چی بکەین؟

## کاتی بڕیاردان

- ناچارن لەندەن چۆڵ بکەن.
ئەوە پێشنیاری سێر گراهام ئەدێر بوو. ئەو دوای قسە کردنێکی کوورت و خێرا لەگەڵ ئالان بلێنت بەم ئەنجامە گەیشت. دەنگی نەرمتر و لەسەرەخۆتر بوو، بەڵام ئەلێکس هەستی بە لەرزینی دەنگی کرد. راوێژکاری هەمیشەیی کابینە هەر دەتوت شەختە لێیداوە.
- دووپشك کاتێکی دروستی هەڵبژاردووە. کاتژمێر چواری دوانیوەڕۆ. هەزاران قووتابی لە کاتژمێر چواردا قووتابخانەکەیان جێدێڵن بۆ ئەوەی بۆماڵەوە بچنەوە. نازانین نیشانەکانی رادیۆیی ماهوارەیی چ بۆردێکیان هەیە. رەنگە ئەوان لە دیشێکی زۆر کەڵك وەربگرن. رەنگە لەسەر زۆربەی بیناکانی لەندەن دیشیان دانابێت... نزیك قووتابخانەکان، نزیك وێسگەی شەمەندەفەرکانی ژێرزەوینی. هیچ منالێك لە لەندەندا ئەمنییەتی نابێ. بەڵام هەر ئەمجورەی کە دکتۆر ستسفنسۆن وتی ئەگەر منالەکان لە ژێر ئەشەئەی رادیۆیی دوور بخرێنەوە، بەهەرحاڵ ژەهرەکە لە جەستەیان دێتەدەر. دەتوانین تا ئەو کاتەی پێویست بێ، منالەکان لە دووری شار بێڵینەوە.
ئەفسەری پۆلیس سەرێکی راوەشاند و وتی:
- بەتاڵ کردن بەشێوەیەکی ئاوا بەربلاو. دەزانن چ تەشکیلاتێکی پێویستە؟ سەیری کاتی رووداوەکە بکەن، یانی کاتژمێر چواری دوا نیوەڕۆی سبەینێ. پێموانەبێ لەکاتی خۆیدا بتوانین هەموو مندالەکان لە لەندەن دوور بخەینەوە.
- خۆ دەتوانن هەوڵی خۆتان بدەن.

– بمبوورن، سێر گراهام. بەڵام چ بیانوویەك دێننەوە؟ ئێوە هەموو قووتابخانەکانی لەندەن بەم کارەتان دادەخەن. هەموو ماڵەکان دەبێ بگوازرێنەوە. ئەمانە بۆ کوێ دەبەی؟ دەتهەوێ چییان پێ بڵێی؟

– راستییەکەیان پێ دەڵێین.

– من وا بیر ناکەمەوە.

ئەلێکس لەوەیکە بەڕێوەبەری پەیوەندییەکان خۆی هاویشتبووە ناو گفتوگۆکە، هیچ بەلایەوە سەیر نەبوو.

– دەتانهەوێ بە خەڵکی بڵێن ماددەیەکتان خستووەتە ناو جەستەی منداڵەکانیان کە ئەم ماددەیە دەتوانێ هەمووان بکوژێت.

بلێنت هاتە ناو قەسکانیانەوە.

– بەڵام ئەوە باشتر لەوەیە کە شەقامەکان لە تەرمی منداڵان پڕ بێت.

کێلنر بەردەوام بوو.

– چ گەرەنتییەك هەیە ئەگەر لە تەلەفزیۆن رابگەیەنن، دووپشکیش زووتر دەست بەکار نەبێ و ژەهرەکە چالاك نەکات.

سێر گراهام وتی:

– بەڵام رێگەی دیکەمان نییە. ناتوانین منداڵەکان لە بارودۆخی ئاوا مەترسیدار رابگرین. ئەگەر کارێ نەکەین، میللەت هیچکات لێمان نابوورن.

ئەلێکس سەیری سەرۆك وەزیرانی کرد کە لەلایەکەی دیکەی مێز دانیشتبوو. واپێدەچوو لەم چەند خوولەکەی رابردوودا بە تەواوی تێکشکاوە. لە دەسپێکی کۆبوونەوەکەدا رەنگی زیاتر گۆڕابوو. جێگری سەرۆك وەزیران خەریکی جووتنی نینۆکەکانی بوو و وەزیری کاروباری دەرەوەش چاویلکەکەی خاوێن دەکردەوە. هەموو ئەندامانی ئەم کۆبوونەوەیە چاوەڕوانی ئەوە بوون ئەم سێ پیاوە بڕیار بدەن. بەڵام واپێدەچوو کە ئەوان توانایی ئەم کارەیان لەدەست داوە. سەرۆك وەزیران سەیری کێلنری کرد و وەقسە هات و وتی:

– وابزانم حەق بە مارك بێت.

سێر گراهام وتی:

- بەڕێز سەرۆك وەزیران، ئەگەر کاتێکی زیاترمان هەبوایە، ڕەنگە توانایی بەرگریی کردنمان هەبوایە. بەڵام زیاتر لە بیست و چوار کاتژمێر کاتمان لەبەردەستدا نییە و ئەمە قسەیەکی ڕاست و حاشا هەڵنەگرە. ئەگەر بە خەڵکی ڕابگەیەنین، خەڵکی لە مەترسی دەهاوێین. هەروەها، دووپشکیش هۆشیارە. ئێمە دەزانین ئەم سیلاحەی کە دەبێ لەگەڵی ڕووبەڕوو بینەوە، کامەیە. شەمشێری نادیار. ئەمە تەنیا دەسکەرتێکە کە هەمانە و ناکرێ بە ڕاگەیاندنی لە تەلەفزیۆن و ڕاگەیاندنەکاندا ئەم دەسکەوتەش لەدەست بدەین.

جێگری سەرۆك وەزیران پرسی:

- کەواتە، دەبێ چی بکەین؟

مارك کێلنر بۆ لای دکتۆر ستینفسۆن سووڕایەوە. ئەلێکس دەیزانی کە بڕیاری خۆی داوە.

- دیشەکانی ماهوارەیی.

دکتۆر ستینفسۆن سەری بە نیشانەی بەڵێ هێنایە خواری:

- بەڵێ.

- ئێوە وتتان ئەم دیشانە زۆر گەورەن. ئایا ناتوانین بیاندۆزینەوە؟

دکتۆ ستینفسۆن بۆ ماوەیەك کەوتە بیر کردنەوە.

- زۆر لە بیناکانی لەندەن لەمجۆرە دیشانەیان داناوە. بەڵام دەتوانین ئاگاداری ئەوە بینەوە دیشێك بدۆزینەوە کە واپێدەچی لەخۆوە دانرابێت.

- بەبڕوای تۆ دەبێ لە بەرزایی زۆرەوە دانرابن؟

- بەڵێ، ڕەنگە. وابزانم دەبێ لە بەرزایی سەد مەتریدا بن. بەڵام ئەوە تەنیا شك و گومانە.

کێلنر لەبیری کردبوو کە هەر چەند خولەك لەمەو پێش وتبووی شتێ بەناوی شەمشێری نادیار ناتوانێ بوونی هەبێ. ئەو بۆ جارێکی دیکە کۆنتڕۆڵی خۆی بەدەستهێنابۆوە.

- ئەگەر قسەی ئێوە راست بێ، دەبێ ببینین لە کام بینای بەرز لە دوو سێ مانگی رابردوودا دیشی گەورە دانراوە. تەنیا ئەمە پێویستە دیشەکان لەکار بێخین. هەروەها، دەتوانین ئەمە بزانین کە چ کەسێك واکسینەکانی بەرهەمهاتوو لە کونسانتۆی وەرگرتووە. دەبێ هەموو ئادرەسەکان بدۆزینەوە. دەبێ دوایی ئەمە بزانین کە ئەم دیشانە لەکام گەڕەك و ناوچەی لەندەن دانراون.
سێر گراهام تووڕە دەهاتەبەرچاو.
- بمبوورن، بەڕێز سەرۆك وەزیران. ئێوە دەڵێن بەتاڵ کردنی لەندەن دژوارە، بەڵام ئەم پێشنیارە بەهیچ شێوە سەر ناگرێت و مەحاڵ دێتەبەرچاو. ئێمە نازانین بەدوای چەند دیشدا بگەڕێین. تەنانەت ئەگەر یەك دیشیش چالاك بێ، منداڵەکان گیانی خۆیان لەدەست دەدەن.
کێلنر وتی:
- بەڵام ڕێگەی دیکەمان نییە. ئەگەر کێشەکە بە خەڵکی رابگەیەنین و پێیان بڵێن وابڕیارە چی روو بدات، منداڵەکان بەهەرحاڵ گیانیان لەدەست دەدەن.
بەڕێوەبەری پۆلیس وتی:
- دەتوانم بیست و چوار ساعەتە بیست هەزار پۆلیس بە ئامادەباشی بهێڵمەوە. دەتوانم هەمووان لە باکوورەوە بۆ ئێرە بێنم.
ئەفسەرێکی پایەبەرزی سوپاش وتی:
- دەتوانین لە تواناییەکانی هێزی چەکداریش کەڵك وەربگرین.
سێر گراهام وتی:
- پێتان وا نییە ئەم هەموو چەکدارە وەسەربانی بیناکان بکەون، چ مەترسییەك لای خەڵکی دروست دەبێ؟
سەرۆك وەزیران دەستەکانی بەرز کردەوە و داوای بێدەنگی لێکردن.
- پیلانەکەمان هەر لە ئێستاوە دەست پێدەکات. دەڵێن لەگەڵ هەوڵێکی تیرۆریستی رووبەڕوو دەبینەوە. ناچار نییە ڕێك باسی مەسەلەکە بکەین.
کێلنر وتی:

– دۆزینەوەیان دژوار نییە. لە لەندەنیش زۆر بینای بەرزمان نییە. ئەو کارەی کە دەبێ بیکەین، تەنیا دۆزینەوەی دیشەکانە و بەس.

سەرۆك وەزیران لەکاتێکدا سەیری بلێنتی دەکرد، وتی:

– ئەگەری دیکەش لەئارادایە. ئەم ژنە، جولیا رۆدمەن، دەزانێ دیشەکان لە کوێن. ئایا دەتوانن دەستبەسەری بکەن؟

بلێنت هیچ هەستێکی لەخۆی نیشان نەدا. سەیری کەسێکی کرد کە لە ژوورەکەدا بوو.

– ئەگەری دەستبەسەر کردنی هەیە. دەتوانین هەوڵی خۆمان بدەین.

– کەواتە، هەرچی خێراتر دەست بەکار بن.

– زۆر باشە، بەڕێز سەرۆك وەزیران.

بلێنت هەستایە سەرپێ. سێر گراهام سەری داخست و ئەلێکسیش وەستا. هەستی بە ماندوویییەکی زۆر دەکرد. دەتوت چەند رۆژێکی لەم ژوورەدا گوزەراندووە.

سەرۆك وەزیران سەیری ئەلێکسی کرد:

– لەوەیکە توانیم لە نزیکەوە بیتبینم، زۆر خۆشحاڵم، ئەلێکس. لە هەموو ئەو کارانەی کە کردووتە، سوپاست دەکەم.

دوای ماوەیەکی کەم ئەلێکس لەبیر کرا. ئەو و بلێنت لە کۆبوونەوەکە هاتنە دەرەوە.

ئەلێکس دەیزانی داوای بەڕێوەبردنی چ کارێکیان لێ دەوێت.

لەکاتێکدا لەگەڵ بلێنت بە ئۆتۆمبێل چوونە ناو شەقامی لیڤەرپول، هیچ قسەیەکی نەکرد، بلێنتیش بەهیچ شێوە نەدوا.

لە کاتێکدا دەیانویست لە ئۆتۆمبێل بێنە خوارەوە، بلێنت رووی لە ئەلێکس کرد و وتی:

– زۆر باش بووی، ئەلێکس.

– سوپاست دەکەم.

ئەوە یەکەم جار بوو بەڕێوەبەری چالاکیی تایبەتی (ئێم ئای٦) ئاوا بە شایستەیی باسی بکات.

بەهەر حاڵ گەیشتنە نهۆمی شازدەهەم. ئەم ژوورەی کە ئەلێکس زۆر بەباشی ئەوەیی دەناسی. خاتوو جۆنز چاوەڕوانیان بوو. یەکەمجار بوو کە دوای ئەوەی هەوڵی کووشتنی دابوو، یەکتریان دەدیت. بەشێوەی جاران جلی لەبەر کردبوو. هەر دەتوت هیچ رووی نەداوە. جلێکی رەشی پۆشیبوو و پێیەکانی هاویشتبووە سەریەك.

کاتێك ئەلێکس چووە ناو ژوورەکە، بۆ ماوەیەکی کوورت بێدەنگی رووی دا.

– سلاّو، ئەلێکس.

– خاتوو جۆنز. لەم رووداوەی رووی دا، زۆر بەداخم.

– وابزانم شتێك هەیە کە دەبێ بیزانی، ئەلێکس.

دوایی سەیری بلێنتی کرد.

– ئایا پێت وتووە؟

– نا.

خاتوو جۆنز ئاخێکی هەڵکێشا و بۆلای ئەلێکس رۆیشت.

– دەزانم وابیر دەکەیەوە کە تەقەت لەمن کردووە. بەلاّم ئەم کارەت نەکرد. ئێمە زۆر بەجوانی لە جۆری تەقەکردنەکەت ورد بووینەوە. تۆ کەمتر لە دوو مەتر لە من دوور بووی و ئەگەری ئەوە نەبوو کە گوللەکەت پێم نەکەوێ. کەواتە تا ئەم جێگەیەی من بیزانم، لەدوایین کاتدا شتێك رێگەی ئەوەی لێگرتی رێك تەقە لە من بکەی. بەم هەموو نیفرەتەوە، باشیش دەزانم کە مافی ئەوەت هەیە زیاتر لەوە نیفرەتت لە من بێت، نەتتوانی بمکووژی.

– من نیفرەتم لە تۆ نییە.

ئەلێکس راستی دەوت. ئەو هەستێکی تایبەتی بەنسبەت خاتوو جۆنزەوە نەبوو.

– ناچار نی لە خۆت بێزار بی و نیفرەتت لە خۆت بێ، رەنگە دووپشك زۆر شتی بە تۆ وتبێ، بەلاّم تۆ لەوان نی.

– ئێستا ئامادەی بە کاری خۆمان رابگەین؟

بلێنت لە پشت مێزەکەی دانیشت و بەکوورتی باسی کۆبوونەوەی کوبڕای کرد.

- بڕیارەکەیان هەڵەیە. دەیانهەوێ بەدوای دیشەکاندا بگەڕێن. بەبڕوای ئەوان بەتاڵ کردنی شار زۆر لەوە دژوارترە.

- کێلنر.

- بەڵی، هەڵبەت سەرۆك وەزیران هەمیشە گوێی لێرادەگرێت و بە قسەی دەکات و سەیر لەوە دایە کە کێلنر لێکدانەوەکەی غەڵەتە. بە بڕوای من، تەنیا ئومێدمان بە شتێکە.

ئەلێکس وتی:

- دەتانهەوێ بگەڕێمەوە.

بە تەواوی دیار بوو. بە بلێنتیان وتبوو کە جولیا رۆدمەن بدۆزێتەوە. بەڵام ئەو وای نواندبوو کە شوێنەکەی پێنازانێ. هیچکەس شوێنەکەی پێنەدەزانی. تەنیا ئەگەری ئەوە هەبوو ئەلێکس بتوانێ بیدۆزێتەوە. ئەلێکس ژمارە تەلەفۆنێکی هەبوو. هەموویان چاوەڕوانی پەیوەندی ئەو بوون.

ئەلێکس وتی:

- ئەوان ئاگاداری ئەوە دەبنەوە کە من سەرکەوتوو نەبوومە. لانیکەم ئەوە دەزانن کە ئێوە منتان زیندانی کردووە.

خاتوو جۆنز وتی:

- دەتوانی راتکردبێ. دووپشك نازانێ کە من مردووم یا زیندووم. دەتوانی پێیان بڵێی منت کووشتووە و دواییش رات کرووە.

- بڕوام پێناکەن.

- کارێکی ئاوا بکە کە بڕوات پێبکەن. دەزانم کە داواکارییەکە زیادە لەڕادەیە، ئەلێکس. دەزانم دوای ئەو رووداوە ناتهەوێ بمانبینی. بەڵام دەزانی بوارەکە تا چ رادەیەك گرنگ و مەترسیدارە. ئەگەر رێگەیەکی دیکە هەبوایە....

- رێگەی دیکە لەئارادا نییە.

ئەلێکس تەنانەت پێش جێهێشتنی شەقامی داونینگ بڕیاری خۆی دابوو.

– پەیوەندیان پێوە دەگرم. نازانم کاریگەر دەبێ یا نا. تەنانەت نازانم وەڵامم دەدەنەوە یا نا. بەڵام تاقی دەکەمەوە.

– ئومێدەوارم ئەوان بتبەنە لای جولیا رۆدمەن. ئەوە تەنیا شانسی ئێمەیە بۆ دۆزینەوەی. ڕەنگە ئەو شوێنی دیشەکانمان نیشان بدات.

بلێنت پەنجەی خستە سەر موبیلەکەی.

– تکایە سمیترزی بنێرنە ئێرە.

سمیترز. ئەلێکس بزەیەکی هاتێ. بەلایەوە سەیر بوو کە ئالان بلێنت و خاتوو جۆنز پێشتر ئەم پلانەیان داڕشتووە. ئەوان دەیانزانی کە بۆ ئیتاڵیا دەینێرن و بە سمیترزیان وتبوو پێداویستییەکانی ئەلێکس دابین بکات.

بلێنت شی کردەوە:

– ئەمە کارێکە کە دەمهەوێ بیکەی. ئێمە بەرنامەی راکردنت بۆ رێک دەخەین. تەنانەت ئەگەر بتوانین لەناو هەواڵی شەوانەدا بڵاوی دەکەینەوە. تۆ پەیوەندی بە دوویشکەوە دەگری. دەتوانی پێیان بڵێی خاتوو جۆنزت کووشتووە. دەبێ بە دڵەڕاوکێ و ترسەوە خۆت نیشان بدەی. دوایی دەبێ داوای یارمەتیان لێبکەی.

– پێتوابێ بۆ یارمەتیم دێن؟

– دەبێ ئومێدەوار بین کە ئەم کارەی دەکەن. ئەگەر بتوانی پەیوەندی بە جولیا رۆدمەنەوە بگری، ڕەنگە بە جۆرێك بزانی کە دیشەکان لە کوێ دانراون. هەر کە ئاگادار بوویتەوە، پەیوەندیمان پێوە بگرە. کارەکانی دیکە ئێمە بەڕێوەیدەبەین.

خاتوو جۆنزیش پێیەوە زیاد کرد:

– دەبێ زۆر ئاگات لە خۆت بێت. دوویشك گێل نییە. ئەوان تۆیان بۆ ئێرە نارد و کاتێك بگەڕێیتەوە، لە راستیدا لێت وەشك دەکەون. دەتگەڕێن. ئەلێکس، هەر قسەیەك بکەی و هەر کارێك بکەی، لێکدەدرێتەوە. دەبێ درۆیان لەگەڵ بکەی. ئایا توانایی ئەم کارەت هەیە؟

ئەلێکس پرسی:

- چۆن دەتوانم پەیوەندیتان پێوەبگرم؟ پێموانەبێ ئەوان رێگە بدەن کەڵك لە تەلەفۆن وەربگرم.
لەم کاتەدا دەرگا کرایەوە و سمیترز هاتە ژوورەوە. بەشێوەیەکی غەریبانە ئەلێکس لە دیتنی خۆشحاڵ بوو. سمیترز بەڕادەیەك قەڵەو و خەپانی بوو کە کەس بڕوای نەدەکرد ئەندامی (ئێم ئای٦) بێت. ئەو جلەی لەبەری کردبوو، لانیکەم تایبەت بوو بە پەنجا ساڵ پێشتر. بە سەری بێ موو و سمێڵی رەش و رووخساری چرچ و لۆچی دەیتوانی مامی هەر کەسێك بێت.
بەڵام ئێستا بۆ جارێکیش بێ، جددی خۆی نیشان دەدا.
- ئەحواڵت چۆنە، ئەلێکس. ئایا بارودۆخەکەت باشە؟
- سڵاو، بەڕێز سمیترز.
- بەداخم لەوەیکە لەگەڵ گرووپی دووپشك رووبەڕوو بوویتەوە. بێشك باش نین. باندێکی تاوانکار و جەنایەتکارن.
سمیترز وەهەناسەبڕکێ کەوتبوو و لەم روویەوە لەسەر کورسییەك دانیشت.
بلێنت پرسی:
- ئێ، چیت بۆ ئێمە کردووە؟
- بەڵێ، بەڕێز بلێنت. ئێوە هەمیشە داواکاری سەیر و سەمەرەت هەیە و ئەمجارە لە هەمووجارێ خراپتر. زۆر شت هەیە کە دەتوانم بیاندەمە ئەلێکس. من هەمیشە لەسەر داهێنانی نوێ کار دەکەم. ماوەیەکە لەسە جووتێك رولربلید[١٦٤] کارم کردووە. تیغەکانی لەنێوان تایەکان دەشاردرێنەوە، بەڵام دەتوانن هەموو شتێ بڕن. جۆرێك قومبەلەی دەستیشمان هەیە. بەڵام پێموانەبێ کاتێك ئەلێکس دووبارە بۆلای ئەوان بگەڕێتەوە، لێگەڕێن هیچی پێبێ. ئەگەر شتێکی گومانلێکراو ببینن، ئاگاداری ئەوە دەبنەوە کە هاوکاری ئێمە دەکات.

---

164 -Rollerblade

خاتوو جۆنز وتی:

- ئەو پێویستی بە ئامێرێك هەیە کە بۆ هەر شوێنێك بچێ، بتوانین پێیبزانین. ئەو هەروەها پێویستی بە شتێك هەیە کە لەکاتی پێویستدا ئاگادارمان بکاتەوە.

- بەڵێ، دەزانم.

سمیترز دەستی خستە ناو گیرفانی. وابزانم بتوانم پێداویستیەکەتان دابین بکەم. شتێکە کە ئەوان چاوەڕوانی نین، بەڵام کووڕێکی مێرمندالّ پێویستی پێیە.

سمیترز کیسەیەکی پلاستیکی لە گیرفانی دەرهێنا. شتێکی پلاستیکی و ئاسنینی بچووك بوو. پێکەنینێك لەسەر لێوەکانی ئەلێکس بوو. دوایین جار کە شتێکی ئەوتۆی بینیبوو، لە ژووری ددانپزیشکێك بوو. وایەرێکی ددان بوو.

- ڕەنگە پێویست بێ نەختێك گۆڕانکاری تێدا پێکبێنین، بەڵام دەبێ بەباشی لەناو دەمتدا جێگەی بێتەوە.

سمیترز کیسەکەی کردەوە.

- ئەم وایەرە بە تەواوی روونە و نابینرێت. ئەمە لەڕاستیدا رادیۆیەکی پەیامنێرە. دەتوانی چالاکی بکەی. هەر کە ئەم کارەت کرد، هەلی ئاگادار کردنەوە بە ئێمە دەدەی.

خاتوو جۆنز سەرێکی جوولاند.

- زۆر باشە، سمیترز. کارەکەت بێ قسەیە.

سمیترز ئاخێکی هەڵکێشا.

- زۆر لەوە دەترسێم کە ئەلێکسی بەبێ چەك بۆ شوێنێك بنێرین! شتێکی زۆر باشی دیکەم بۆ ئەو ناردووە. لەسەر ئامێرێکی گرهاوێژ کارم کردووە. ناوەکەشیم ناوە ناپاڵم[١٦٥]؟

بلێنت وتی:

165 -Napalm

- پێویستی بە هیچ جۆرە چەك و سیلاحێك نییە.
خاتوو جۆنزیش بەنیشانەی قبووڵ کردنی قسەکەی بلێنت وتی:
- ناتوانین ریسکێکی ئاوا گەورە بکەین.
سمیترز بەئارامی لە جێگەی خۆی بەرز بۆوە.
- بەڵێ حەق بە ئێوەیە. ئاگات لەخۆت بێت، ئەلێکس. نەکا خۆت بە کووشتن بدەی. حەز دەکەم جارێکی دیکەش بتبینمەوە.
سمیترز لە ژوورەوە چووە دەرێ و دەرگای لەپشتەخۆی داخست.
خاتوو جۆنز وتی:
- زۆر بەداخم، ئەلێکس.
- نا.
ئەلێکس دەیزانی کە حەق بە خاتوو جۆنزە. تەنانەت ئەگەر دەیتوانی دوویشك لەوە دڵنیا بکاتەوە کە ئەرکە پێسپێردراوەکەی بە دروستی ئەنجام داوە، ئەوان متمانەیان پێ نەدەکرد. هەموو جەستەیان دەگەڕا.
خاتوو جۆنز وتی:
- هەر کە شوێنی دیشەکانت دۆزییەوە، پەیامنێرەکە چالاك بکە. ئەگەر گیانی خۆشت لە مەترسی کەوت، دیسانیش ئەم کارە بکە. خێرا کەسانێك بۆ رزگارکردنت دەنێرم.
ئەلێکس لە بیستنی ئەم قسەیە تووشی سەرسوورمان بوو. خاتوو جۆنز لە رابردوودا هیچکات نیشانی نەدابوو کە نیگەرانی سەلامەتی ئەوە. وادیارە چوونی ئەو بۆ بیناکەی خاتوو جۆنز زۆر شتی گۆڕیبوو.
ئەلێکس سەیری خاتوو جۆنزی کرد و واپێدەچوو خاتوو جۆنز دەیهەوێ قسەیەکی پێ بڵێت.
خاتوو جۆنز پرسی:
- ئەلێکس ئایا ئەوەندەت متمانە بە رۆیشتنتە، یانی بەبێ شك و گومان دەتهەوێ ئەمکارە بکەی؟
- بەڵێ.
بۆ ماوەیەك لە ژوورەکەدا بێدەنگی حاکم بوو.

- ئایا دەتوانن کارێکی ئاوا بکەن کە ئەوان بڕوا بەوە بکەن کە رامکردووە؟

بلێنت بە پێکەنینەوە وتی:

- بەڵی، کارێك دەکەین باوەڕ بکەن.

رووداوەکە لە لەندەن رووی دا و هەواڵەکە کاتژمێر شەش بلاو بۆوە.

ئۆتۆمبێلێك بە خێرایی لە وێستوای[166] لەرێدا بوو. ئەمە شەقامێکی سەرەکی بوو کە لە شارەوە بۆ دەرەوە دەچوو. ئۆتۆمبێل لەناکاو کۆنترۆڵی خۆی لەدەست دا. شایەدەکان بەچاوی خۆیان بینیان کە ئۆتۆمبێلەکە چەندجار بۆلای راست و بۆلای چەپ سووڕایەوە و دوایی بە ئۆتۆمبێلەکانی دیکە کەوت. دە دوازدە ئۆتۆمبێلی بەخۆیەوە خراپ کرد. ئۆتۆمبێلی فیات وەکوو کاغەزێکی پوچ ببۆوە. نیوە لە بەدەنەی ئۆتۆمبێلێکی بی ئێم چووبووە ناوەوە.

پیکابێکی پڕ لە گوڵ کە نەیتوانیبوو لە کاتی خۆیدا کۆنترۆڵی بکات، بە توندی بە ئۆتۆمبێلێکی دیکە کەوتبوو و گوڵەکانی رۆز تەواوی جاددەکەیان داپۆشیبوو. تاکسییەك سەبارەت بەوەیکە بە ئۆتۆمبێلەکانی دیکە نەکەوێت، بەجۆرێك لە جاددە چووبوە دەرەوە کە بە پەنجەرەیەکی خانوویەك کەوتبوو و تێکوپێکی دابوو.

موعجزەیەك رووی دابوو کە هیچکەس نەکووژرابوو، هەرچەند دە دوازدە کەسێك بۆ نەخۆشخانە گوازرابوونەوە. پولیسێك کە لەناو کۆپتەر لەسەرووی رووداوەکە دەوری لێدەدا، رووداوەکەی بۆ ئەوانیتر شی دەکردەوە. جاددەکە بەسترابوو. دوکەڵی ئۆتۆمبێلی سووتاو هێشتا بەرەو ئاسمان بەرز دەبۆوە.

لە گەڵ هەندێ لە شایەدانی رووداوەکە گفتوگۆ کرا و ئەوان ئەوشتەیان دەگێڕایەوە کە بینیبوویان. هەموویان وتیان کووڕێك کە لەناو ئۆتۆمبێلی پێشوودا بوو، هۆکاری ئەم رووداوە بوو. ئەوان هەروەها وتیان کە دوای

---

166 - Westway

رووداوەكـە كووڕەكـەیان بینیـوە كـە لـە ئۆتۆمبێلەكـە هاتووەتـەدەر و بـە ڕاكردن لـەناو ترایفلایـت و قـەرەباڵغی ئۆتۆمبێلـەكان ون بووە. پیاوێك بـە كـۆت و پـانتۆڵێكی ڕەش و چـاویلكەیەكەوە هـەوڵی دابـوو كـە بـەدوای بكـەوێت، بـەڵام واپێدەچـوو ئـەم پیـاوە تووشـی پێكـان بووبێـت، چـونكە دەشەلی. كووڕە مێرمنداڵەكە ڕایكردبوو.

دوو كاتـژمێر دواتـریش جاددەكـە هـەر بەسـترابوو. پـۆلیس وتـی كـە زۆر جددیانە بەدوای ئەم كووڕە مێرمنداڵە دایە بۆئەوەی قسـەی لەگـەڵ بكـات. بەڵام پۆلیس هەر ئەوەنـدەی دەزانـی كـە كووڕە مێرمنداڵەكە تەمەن نزیـك چواردە ساڵە بووە و جلی ڕەشی لەبەر بووە. كـەس نـاوی ئـەم كووڕەشـی نـەدەزانی. هێشـتا لـە ڕۆژئـاوای لەنـدەن قـەرەباڵغی و ترافیـك بـوو. چـەند ڕۆژێكی دەكێشا تا خراپبوویی سەبارەت بەم رووداوە نۆژەن بكرێتەوە.

لە هۆتێلی مەیفر[١٦٧] جولیا ڕۆدمەن گوێی لە ڕاپۆرتەكە بوو. ئەو هەڵبەت ئـەم كـووڕەی دەناسـی. نەیـدەتوانی كەسـی دیكـە بێـت. نەیـدەزانی چ ڕووداوێك ڕووی داوە. لە هـەموو ئەمانـە گرنگتر، بیری لـەوە دەكـردەوە كـە ئەلێكس ڕایدەر چ كاتێك پەیوەندی لەگەڵ دەگرێت.

كاتژمێر حـەوتی دوانیـوەڕۆ ئـەلێكس زەنگـی لێـدا. ئـەو لـەناو كیوسـكێكی تەلـەفۆنی نزیـك بـە ماربـل ئـەرچ[١٦٨] بـوو. وایـەری ددانـی لـەناو دەمـی هاویشـتبوو و بـەم شـێوەیە دەیوسـت ددانـی لەگـەڵ وایەرەكـە ڕابێـت. بەمحاڵەوە، هێشتا بەدژواری دەیتوانی قسە بكات.

پیاوێك وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ؟
- من ئەلێكس ڕایدەرم.
- لەكوێی؟

---

167 -Mayfair

168 - Marble Arch

- لەناو کیوسکێکی تەلەفۆن لەشەقامی ئەدجوێر[١٦٩].
بەڵێ، راستی وتبوو. ئەلێکس جارێکی دیکە جلی رەشی نینجای لەبەر کردبوو کە دووپشك پێیدابوو. کیوسکی تەلەفۆن لە نزیك رێستۆرانتێکی لوبنانی بوو. لەوە دوودڵ نەبوو کە دووپشك بە کەڵك وەرگرتن لە ئامێر و ئامرازی بەتوانا کە تایبەت بە خۆیان بوو، شوێنی ئەویان دەدۆزییەوە. نەیدەزانی چە ماوەیەکی پێدەچێ تا دەیدۆزنەوە.
جارێکی دیکە بیری لە رووداوەکەی پێکدادانی ئۆتۆمبێلەکە کردەوە. لەم رووداوەدا (ئێم ئەی٦)ە کە زۆر بەجوانی رووداوەکەی خوڵقاندبوو. ئەوان لەماوەی کەمتر لەچەند کاتژمێر نزیك بە بیست ئۆتۆمبێلیان بۆئەم رووداوە رێکخست. تەنانەت یەك کەسیش بریندار نەببوو. دووپشك بە دیتنی رووداوەکە و پێکدادانی ئۆتۆمبێلەکان چارەیەکی لەوە زیاتر نەبوو کە رووداوەکە بە رووداوێکی سرووشتی وەربگرێت. ئەوە هەمان قسەیە بوو کە بلێنت لەسەرەوتاوە وتبووی.
لەسەر لاپەڕەی یەکەمی ئەڤێنینگ ستاندارد[١٧٠] وێنەی تاکسییەکیان دانابوو کە چووبووە ناو پەنجەرەی بیناکەی نزیك رووداوەکە.
بەڵام ئەمانە بۆ ئەو کەسە گرنگ نەبوو کە بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ ئەلێکس دەکرد.
- ئایا ئەو ژنە مردووە؟
دووپشك ئیتر ناوی خاتوو جۆنزی نەدەهێنا. بڕیار نییە مردووەکان ناویان هەبێ.
- بەڵێ.
کاتێك دەیاندۆزییەوە، دەیاندیت کە دەمانچەی کارپی٩ی لە گیرفانی دایە و فیشەکێکی پێ هاویشتووە. ئەگەر سەیری دەستەکانیان دەکرد (کە بلێنت لەمکارە دوودڵ نەبوو)، کاریگەری باروتیان لەسەر پەنجەی

169 - Edgware
170 - Evening Standard

دەدیت. لەسەر قۆڵی کراسەکەشی پەڵە خوێنێك دیار بوو. هەمان خوێنی راستەقینەی خاتوو جۆنز. چونکە خاتوو جۆنز نموونەی خوێنی خۆی لە قۆڵی کراسی ئەلێکس هەڵسووبوو.

– دوایی چی بوو؟

– لەکاتی چوونەدەرەوە لە بیناکە دەستبەسەریان کردم. دوایی منیان بۆ شەقامی لیڤەرپول برد و پرسیاریان لێکردم. ئەمڕۆ دوانیوەڕۆ دەیانویست بۆ شوێنێکی دیکە بمگوازنەوە کە توانیم رابکەم.

ئەلێکس لێگەڕا بۆ ماوەیەك ترس لەناو دەنگیدا خۆی دەربخات. بەهەرحاڵ ئەو مێرمنداڵێك بوو کە یەکەم کەسی کووشتبوو.

– سەیرکەن. ئێوە بەڵێنیتان پێدام کاتێك کارم تەواو بیّ، من دەپارێزن و ئاگادارم دەبن. من لەناو کیوسکێکی تەلەفۆنی دام. بەدوامدا دەگەڕێن. دەمهەمیّ نیلی ببینم.

بێدەنگییەك لەنێونیاندا هاتەئاراوە.

– زۆر باشە. بۆ وێسگەی شەمەندەفەری بەنك[171] بڕۆ. لەویّ شەقامێك جیا دەبێتەوە، شەقامی سیڤێن[172]. رێك کاتژمێر نۆ لەدەرگای سەرەکی وێسگە بوەستە. لەویّ تۆ تەحویل وەردەگرێین.

– چ کەسیّ –

بەڵام تەلەفۆن داخرابوو.

ئەلێکس تەلەفۆنەکەی دانا و لە کیوسکەکە هاتەدەریّ. دوو ئۆتۆمبێلی پۆلیس کە چراکانیان پێکرابوون، بە خێرایی لە تەنیشتی تێپەڕین، بەلام کاریان بەئەو نەبوو.

ئەلێکس بۆلای رۆژهەلاّت بەڕێکەوت. وێسگەی شەمەندەفەری ژێرزەوینی بەنك لەلایەکەی دیکەی لەندەن بوو و لانیکەم بە پێیان کاتژمێرێك دوور بوو. پارەی نەبوو و لەوە دەترسا ئەگەر بیّ بلیت سواری پاس بێت،

---

[171] - Bank

[172] - Seven

دەستبەسەر بکرێ. لەسەرەتای شەقامی سێڤن دووپشك ئەویان دەدۆزیەوە و ئەگەر (ئێم ئای٦) بەدوای کەون، ئەوا دەیانتوانی لەم شەقامە کە چەند شەقامی دیکەی لێ جیا دەبۆوە، خۆیان رزگار بکەن.
ئەلێکس لەقەراغ پیادەڕۆ دانیشت. بیری لەوە کردەوە کە چ کارێکی بکات. شەو کەم کەم دەگەیشتێ. بەرەبەرە مانگیش لە ئاسمان دەرکەوت. بەیانی دەبوایە هەموو شتێك یەکلایی بکرێتەوە. لەڕاستیدا سبەی بۆ ئەویش رۆژێکی گرنگە.
ئەم مەسەلەیەی بە خاتوو جۆنز نەوتبوو.
لە مالاگوستو، لە دوایین رۆژ کە لەوێ بوو، دەروونناس پێی وتبوو کەمێك لاوازە و دوایی دەرزێکیان لێدابوو. پێیان وتبوو کە پێویستی بە کەمێك ڤیتامین هەیە.
ئەلێکس لەوە دوودڵ نەبوو کە هەمان ژەهریشیان لەوی داوە کە لە قووتابییەکان و یاریزانەکانی تۆپی پێیان دابوو. خاتوو رۆدمەن لەوکاتەدا کە خواردنی شەوی لەگەڵ دەخوارد، بیری لەوە کردبۆوە کە چۆن لەدەستی رزگاری بێت.
ئەو هیچ شتێکی لەمبارەیەوە بە خاتوو جۆنز نەوتبوو. چونکە نەیدەویست ئەو ئەمە بزانێ. نەیدەویست کەس بزانێ چ کارێکی گێلانەی کردووە. بەلام ئەبەباشی دەیزانی کە بە پاڵدانی دوگمە ئەویش دەمرێت.
دووپشك پێی وتبوو کە تۆڵەسەندنەوە کارێکی باشە.
کەواتە تۆڵە سەندنەوە ئەوکارە بوو کە ئێستا ئەلێکس بەدوایەوەی بوو و دەیویست بیکات.

## کەنیسەیەکی پیرۆزی لەبیرکراو

گەڕان دەستی پێکردبوو.
سەدان پیاو و ژن لە سەرتاسەری لەندەن کاری خۆیان دەست پێکردبوو. کۆمپیوتەرەکان و تەلەفۆنەکان چالاك کرابوون. زانایان را و سەرنجی دکتۆر ستنفسۆنیان قبوول کردبوو کە دیشەکان دەبێ لانیکەم لە بەرزایی سەد مەتری لە زەوییەوە بن بۆئەوەی کاریگەریان هەبێت. ئەمەش کارەکەی ئەوانی ئاسانتر دەکرد. ئەگەر غەیری ئەمە بوایە، بەهیچ شێوەیەك گەڕانی ئەم هەموو کۆڵان و شەقام و ماڵبەماڵە نەدەکرا. هەموو هێزی سوپا و پۆلیسیش نەیاندەتوانی ئەمکارە بکەن. بەڵام ئێستا بەدوای جێگەیەك دەگەڕان کە بەرزایی زۆری هەبێ. دیشە جۆراوجۆرەکانی ماهوارەیی دەناسرانەوە.
ئەوکات رێك دوای کاتژمێر دەی بەیانی رۆژی پێنجشەممە، شەش کاتژمێر پێش هەوڵە مەترسییەکەی دووپشك، دیشەکان دۆزرانەوە.
بینایەکی زۆر لە دەوروبەری ناتینگ هیل گیت(١٧٣)، کە سێتەرەین بەسەر شاری لەندەنەوە هەبوو، یانی بەرزترین بوورجی شاری لەندەنیان دروست کردبوو، بوورجێك کە بەرزترین و ناحەزترین بوورجی لەندەن بوو.
واپێدچوو ئەو ئەندازیارەی ئەم بینایەی چاك کردبوو، بیری لەوە کردبۆوە کە هیچکات خۆی ژیانی تێدا ناکات.
سەربانی ئەم بینایە چەن دیواری خشتی لێ ساز کرابوو. وایەری ئەسانسۆرەکان، یەکەی هەواکەشەکان، جەنراتۆرەکان، هەموویان لەسەر بانێك بوون کە پۆلیسەکان سێ دیشی نوێیان لەوێ دۆزییەوە کە سێرەیان لە باکوور، باشوور و رۆژهەڵات گرتبوو.

---

173 - Notting Hill Gate

کەس نەیدەزانی ئەم دیشانە بۆ چین و بە کەڵکی چی دێن. دوای ماوەیەکی کەم، ژمارێکی زیاتری تەکنەسیەن و کەسانی پسپۆر هاتنە سەربانەکە و کۆپتەرێکی زیاتر لەسەر ئەم بینایە هاتووچۆیان دەکرد. بەدیار کەوت کە وایەر و کێبڵەکان بە ئامێرێکەوە وەسڵن و ئەم ئامێرە بەجۆرێك بەرنامەڕێژی کرابوو کە کاتژمێر چوار فرێکانسی بەهێز بۆ دیشەکان بگوازێتەوە.

مارك کێلنر گشت بەرپرسەکانی ئاگادار کردەوە کە دیشەکانیان دۆزیوەتەوە و ئێستا وایەرەکانیان دەبڕن.

کۆبوونەوەی کوبرا هێشتا بەردەوام بوو. ئامادەبووانی ناو کۆبەونەوەکە هاوارێکی پڕ لە خۆشیان کرد.

کێلنر بەردەوام بوو:

– ئەگەری ئەوە هەیە کە دووپشك دیشی دیکەشی دانابێت کە لەکاتی پێویست لەکاریان بکات، یانی لە شوێنی دیکەی شاری لەندەن. .

دوایی بەردەوام بوو:

– هەوڵ دەدەم ئەوانیش بدۆزمەوە. بەڵام دەتوانم ئەمە بڵێم کە قەیرانەکە جاریٚ کۆتایی پێهاتووە.

لەشەقامی لیڤەرپولیش بەڕێز بلێنت و خاتوو جۆنز ئەم هەواڵەیان گویٚ لێبوو.

خاتوو جۆنز پرسی:

– رای تۆ چییە؟

بلێنت سەری جووڵاند.

– دووپشك زۆر لەوە بەهۆشترە. ئەگەر دیشەکان دۆزراونەتەوە، بۆ ئەوەیە کە دووپشك ویستوویەتی بدۆزرێنەوە.

– کەواتە کێلنر دووبارە هەڵە دەکات.

بلێنت سەیری کاتژمێرەکەی کرد.

– ئەو گێلەپیاوێکی تەواوە.

– کاتێکی زۆرمان لەبەردەستدا نییە.

خاتوو جۆنز سەیری کرد و وتی:
– هەموو ئومێد و هیوامان ئەلێکس رایدەرە.

ئـەلێکس لەلایـەکی دیکـەی لەنـدەن بـوو. زۆر لـەم شـوێنە دوور بـوو کـە دیشەکانی لێدانرابوو.
شـەوی پێشـتر هـەر ئـەمجۆرەی کـە پێیـان وتبـوو، کاتـژمێر نـۆی شـەو لـە وێسـگەی ژێـرزەوینی شـەمەندەفەر دۆزیانـەوە – بـەڵام نـە بـە ئۆتۆمبێـل. ژنێکی لاو کە پێشـتر هیچکات نەیدیتبوو لە تەنیشتی تێپەڕی و هـەر بە رێکردنـەوە دوو وشـەی بـە هێواشـی پێوتبـوو و بلیتێکـی شـەمەندەفەری ژێرزەوینیشی پێدابوو.
– بەدوام بکەوە.
ئەم ژنـە سواری شـەمەندەفەری کرد و ئـیتر هـیچ قسـەیەکی دیکـەی لەگـەڵ نـەکردبوو. نـەختێک ئـەولاتری ئـەو وەسـتابوو، بـەڵام جۆرێک پێدەچوو کە بـەهیچ شـێوەیەک ناینـاسـێت. دووجـار شـەمەندەفەریان گـۆڕی. رێـک لـە دوایـین کاتـدا سـواری شـەمەندەفەر دەبـوون. نـەختێک بـەر لـە داخرانـی دەرگای شەمەندەفەر، بۆئەوەی ئەگەر کەسێک بەدوایان دەکـەوێ، بیبینن. لە کۆتاییدا، لـە وێسـگەی کینگزکـراس(١٧٤) گەیشـتنە شـوێنی دیاریکراو. لەناو شەقامدا ئەم ژنە ئیشارەی بە ئەلێکس کردبوو کە چاوەڕوان بێت. چەند خوولەک دواتر تاکسییەک گەیشتێ.
– بەڕێز ئەلێکس رایدەر؟
– بەڵێ.
– سوار بە.
کارەکە بە ئاسانی و سادەیی کۆتایی هاتبوو. کاتێک بەڕێکەوتن، ئەلێکس ئاگاداری ئەوە بۆوە کە هیچ کەسێکی (ئێم ئای٦) بەدوایەوە نییە و ئەمە رێک بەشێوەیەک بوو کـە دووپشک بەرنامەڕێژی بۆ کردبوو. ئەویان بۆ

---

174 -Kings Cross

ماڵێك بردبوو. ئەمە لەگەڵ ئەو ماڵە جیاواز بوو کە پێشتر بردبوویان. ئەم ماڵە لە نزیك پارکی ریجێنت[١٧٥] بوو.

لەوێ ژن و پیاوێك چاوەڕوانی بوون. ئەلێکس ئەوانی ناسییەوە. هەمان ژن و پیاوە بوون کە وەکوو دوو ئیتاڵی ئەویان بۆ لەندەن هێنابوو. ئەوان ئەویان بۆ نهومی سەروو و ژوورێکی بچووك بردبوو کە تەختێکی خەوتن و دەستشۆرێکی تێدابوو. لە سینییەکدا خواردنی درەنگوەختی شەو چاوەڕوانی بوو. بەتەنیا هێشتیانەوە و دەرگایان لەسەر داخست. ژوورەکە تەلەفۆنی تێدا نەبوو. ئەلێکس پەنجەرەی تاقی کردەوە، ئەویش داخرابوو.

ئێستا کاتژمێر یەك و سی خوولەکی سەرلەبەیانی بوو. ئەلێکس لەسەر تەختەکە دانیشتبوو و لە پەنجەرەوە سەیری دارەکانی دەکرد. نەختێك هەستی ناخۆشی هەبوو. کەم کەم بیری لەوە کردەوە کە دووپشك دەیهەوێ تا کاتژمێر چواری دوانیوەڕۆی سبەی لێرەدا بیهێڵێتەوە. دەیهەوێ ئەویش لەگەڵ منداڵەکانی دیکەی لەندەن کاتژمێر چوار بمرێ. ئەم بیرکردنەوەیە ئەوی وەبیر نانوشلی هێنایەوە کە دەیتوانی لەناو دڵیدا جێگەی خۆش کردبێ. وەبیر ئەو دەرزیە کەوتەوە کە لێیاندابوو. وەبیر پێکەنینەکەی دکتۆر ستاینر کەوتەوە کە سرنجەکەی لێدابوو. بیرکردنەوەکەشی ئەوی دڵگران دەکرد. ئایا لەڕاستیدا بەوە سزار درابوو کە دوایین چرکەکانی ژیانی بە تەنیایی لە ژوورێکدا زیندانی بکرێ.

دەرگا کرایەوە.

نیل هاتەژووری و جولیا رۆدمەنیش بەدوای ئەودا خۆی بە ژوورەکەدا کرد.

خاتوو رۆدمەن کۆتێکی گرانبەهای لەبەر کردبوو، یەخەکەی لە چەرم بوو. کۆتەکە تا ژێر ئەوکی قوبچەی هەبوو. بزەیەکی لەسەر لێوان بوو و چاوەکانی دەبریقانەوە.

---

175 -Regent

خاتوو رۆدمەن بە دڵکوتەوە ئاخێکی هەڵکێشا.
- ئەلێکس.
واپێدەچوو لە دیتنی ئەو خۆشحاڵە. بەلاّم ئەلێکس زۆر بەباشی دەیزانی حەرەکە و جووڵەکانی بە ئەنقەست و فریودەرن. بەهیچ شێوە نەیدەتوانی متمانەی پێبکات.
ئەلێکس وتی:
- پێموانەبوو بێن؟
- نا نا، هاتین، ئازیزم. بەلاّم رۆژێکی پڕکارم هەبوو. ئەحواڵت چۆنە، ئەلێکس؟ زۆر لە دیتنت خۆشحاڵم.
نیل پرسی:
- ئایا بەڕاستی کووشتت؟
نیل کۆتێکی فش و پانتۆڵێکی جینی لەبەر بوو.
خاتوو رۆدمەن وتی:
- نیل، ناچار نی ئاوا قسە بکەی.
دوایی شانەکانی هەلاّویشت.
- هەڵبەت ئەو لەبارەی خاتوو جۆنز قسە دەکات و من حەز دەکەم بزانم چی رووی دا. ئایا لە کارەکەتدا سەرکەوتوو بووی؟
ئەلێکس سەری بە نیشانەی بەڵێ هێنایەخوارێ.
- بەڵێ.
ئەمە مەترسیدارترین بەشی رووداوەکە بوو. ئەلێکس دەیزانی کە ناتوانێ زۆر قسە بکات. دەترسا ئاشکرا بێ. لەوە بگوزەرێن، زۆر نیگەرانی وایەری ددانی بوو. هەڵبەت وایەرەکە زۆر بەباشی جێگەی خۆی گرتبوو، بەلاّم لەسەر قسەکردنی کاریگەری دانابوو. وایەرەکە بەهۆی رووناکی لەسەر ددانی نەدەبینرا، بەمحاڵەشەوە خاتوو رۆدمەن پێیدەزانی.
نیل وتی:
- ئێ، بیگێڕەوە.

- توانیم بچمە ژوور بیناکە. ڕێك ئەمجۆرەی کە ئێوە پێتان وتبووم رووی دا. دەمانچەم بەکار هێنا.
- دوایی چیت لێهات؟
- بە ئەسانسۆڕەکە هاتمە خوارەوە، بەلام دوو نیگابانەکەی خوارەوە یەخەیان گرتم.

ئەلێکس نیوەی ئەم شەوە راهێنانی کردبوو کە چۆن ئەم رووداوە بگێڕێتەوە.

- نازانم لە کوێوە زانیبوویان کە من ئەمکارەم کردووە. بەلام لەناکاو هێرشیان کرد و منیان لەسەر پشت خەواند.

ئێستا خاتوو رۆدمەن سەیری ئەلێکسی دەکرد.

- بەردەوام بە.
- دوایی منیان بۆ تاکەژوورێك برد.

ئەم بەشە لە قسەکەی ئاساییتر بوو.

- ئەم ژوورە لە شوێنێکی ژێر شەقامی لیڤەرپول بوو. ئەم شەوە لەوێ مامەوە و بەیانی رۆژی دواتر بلێنت هاتە لام.
- چی وت؟
- زۆر قسەی نەکرد. ئەو دەیزانی کە بۆ ئێوە کار دەکەم. ئەوان وێنەیەکی ماهوارەییان لە هاتنی من بۆ مالاگوستو گرتبوو.

نیل سەیرێکی خاتوو رۆدمەنی کرد.

- وابزانم راست دەکات. من هەمیشە هەستم دەکرد لەژێر چاوەدێری داین.

ئەلێکس بەردەوام بوو:

- نەیدەویست زۆر قسە بکات. حەزی نەدەکرد لەگەڵ من بدوێ. ئەو وتی لە جێگەیەك لە دەرەوەی لەندەن لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکرێ. بۆ ماویەك لێمگەڕان. دوایی ئوتۆمبیلێك هات و منیان سوار کرد.
- خاتوو رۆدمەن پرسی:
- قۆڵبەستیان کردی؟

- نا. ئەمە هەڵەی ئەوان بوو. من سواری ئۆتۆمبێلێکی ئاسایی بووم. شوفێر لەپشت سووکان دانیشتبوو و من و پیاوێکی (ئێم ئای٦) لە پشتەوە سوار بووین. نەمدەزانی بۆ کوێم دەبەن و نەمدەویست بڕۆم. بەلامەوە گرنگ نەبوو چی روو دەدات. تەنانەت بۆم گرنگ نەبوو کە بکووژرێم. لێگەڕام تا نەختێك خێراییان زیاتر بوو و دوایی خۆم هاویشتە سەر شوفێرەکە. دەستەکانم لەسەر چاوی دانا. کارێکی ئەوتۆی لەدەست نەدەهات. ئەو کۆنترۆڵی ئۆتۆمبێلی لەدەست دا و تووشی پێکدادان بۆوە.

خاتوو رۆدمەن وتی:

- چەند ئۆتۆمبێلێك پێك کەوتن.

- بەڵێ، بەلاّم من شانسم هێنا. بەخۆشییەوە، ئۆتۆمبێل وەستا و منیش هاتمە دەرێ و رامکرد. توانیم خۆم بگەیەنمە ناو کیوسکێکی تەلەفۆنی و تەلەفۆنم بۆ ئەم ژمارەیە کرد کە ئێوە پێتان دابووم. ئێستاش لەخزمەت ئێوە دام.

لە هەموو ئەم ماوەیەدا، نیل بە وردی سەیری دەکرد و ئێستا پرسی:

- باشە، کوشتنی خاتوو جۆنز چ هەستێکی پێدای؟

- هەستێکی تایبەتیم نەبوو.

نیل بە نیشانەی بەڵێ سەری هێنایەخوارێ.

- بەڵێ، بۆ منیش کە یەکەمجار کەسێکم کووشت، ئاوا بووم.

خاتوو رۆدمەن لەحاڵێکدا هێشتا نەختێك دوودڵی بەدەنگییەوە دیار بوو، وتی:

- زۆر بەباشی ئەرکی خۆت بەڕێوەبردوە، ئەلێکس. دەبێ ئەوە بڵێم کە لە راکردنت تووشی سەرسووڕمان بوومە. لە هەواڵەکانی تەلەڤزیۆندا رووداوەکەم سەیر کرد. بڕوام بەوە نەبوو سەرکەوتوو دەبێ. بەلاّم تۆ لەتاقی کردنەوەدا سەرکەوتی. تۆ بەڕاستی یەکێ لە ئێمەی.

- ئایا بەم مانایەیە کە من بۆ ڤێنیز دەبەن؟

- نا، هێشتا.

خاتوو رۆدمەن بۆ کاتێکی کەم چووە ناو بیر و ئەلێکس هەستی کرد کە ئەو خەریکی بڕیاردانە.

– ئێمە خەریکی چالاکییەکی زۆر گرنگین. ڕەنگە بۆتۆش گرنگ و خۆش بێت، رات چییە؟

ئەلێکس شانەکانی هەڵاویشت. نەدەبوو خۆی زۆر بە حەزەوە نیشان دابا.

– نازانم.

– تۆ لە مونسانتۆ دکتۆر لیبەرمەنت بینی. هەمان کات کە نیل بە خزمەتی گەیشت. بەڵام دەبێ ئەنجامی کاری ئەو بزانی.

خاتوو رۆدمەن دووبارە پێکەنینێکی هاتێ.

– حەز دەکەم لە کۆتایی کاردا لەگەڵم بی.

ئەلێکس هەستی بەوە کرد کە ئەو دەیهەوێ مردنەکەی ببینێ.

– حەز دەکەم لە شوێنی ڕووداوەکە بم.

چاوەکانی خاتوو رۆدمەن کز بوونەوە و واپێدەچوو پێکەنینەکەی شەختە لێیدابێ.

– بەڵام بەداخەوە دەبێ بتگەڕێین. هەڵبەت من متمانەم پێتە، بەڵام هەر لەم ماوەیەی کە لەگەڵ دووپشك کار دەکەی، دەبێ ئاگاداری ئەوە بوبییەوە کە هیچ شتێك بە قەزا و قەدەر ناسپێرین. (ئێم ئای٦) تۆی زیندانی کرد. هەمیشە ئەگەری ئەوە هەیە کە بێ ئەوەی ئاگات لێبێ، کارێکیان لەگەڵ کردبی. کەواتە، بەر لەوەی ئێرە جێبێڵین، دەمەوێ لەگەڵ نیل بۆ ئاودەست بچی؟ ئەو دەبێ بتگەڕێت. دوایی دەبێ بەتەواوی جلەکانت بگۆڕی. دەزانم ڕەنگە کەمێك دڵگران بی، بەڵام باش دەزانم کە درکمان دەکەی و حەقمان پێدەدەی.

– من هیچ شتێکم نییە کە بیشارمەوە.

ئەلێکس زمانی بەسەر وایەری ددانی کێشا. لەوە دڵنیا بوو کە خاتوو رۆدمەن دەیدۆزێتەوە.

– هەڵبەت، بێشك نیتە. من تەنیا دەمهەوێ زیاتر دڵنیا بم.

نیل ئاودەستی پێ نیشان دا و وتی:

- وەرە بڕۆین.

بیست خوولەك دواتر، نیل و ئەلێکس لە پەیژەکان هاتنەخوارەوە. ئێستا ئەلێکس پانتۆڵێکی جینی فشی لەبەر بوو و قەمیسێکی یەخە بازنەیی پۆشیبوو. نیل هەموو جەستەی ئەوی گەڕابوو. تەنیا دەمی نەگەڕابوو و کەواتە وایەری ددانیشی نەبینیبوو.

خاتوو رۆدمەن بەپەلە بوو.

- باشە؟

نیل وەڵامی دایەوە:

- هیچی پێنەبوو.

- باشە، کەواتە دەتوانین بڕۆین.

کاتێك ئەلێکس لەگەڵ خاتوو رۆدمەن و نیل بۆلای دەرگا بەڕێکەوت، کاتژمێری دیواری دووبارە وەدەنگ هات، کاتژمێر دووی نیشان دەدا.

خاتوو رۆدمەن وتی:

- کاتەکەی هاتووە. تەنیا دوو کاتژمێر کاتت هەیە، ئەلێکس.

ئەلێکس پرسی:

- دوو کاتژمێر بۆ چ کارێك؟

- تا دوو کاتژمێری دیکە ئاگاداری هەموو شتێك دەبی.

خاتوو رۆدمەن دەرگای کردەوە.

لە دەرەوە ئۆتۆمبێلێك چاوەڕوانیان بوو. لە ناو دڵی لەندەن تێپەڕین و بۆلای باشووری لەندەن بەڕێکەوتن. ئالدویچ[١٧٦]یان دەور لێدا و لە پردی واتێرلۆ[١٧٧] گوزەران. ئەلێکس سەیری جوانترین بەشی ئەم شارەی کرد. بینای پەرلەمان و بیگ بێن[١٧٨]. دوای دوو کاتژمێری دیکە چی روو دەدات؟ رووداوێکی مەترسیداری هاتەبەرچاو، ژمارێکی زۆر ئۆتۆمبێلی

176- Aldwych

177 - Waterloo

178- Big ben

فریاگوزاری و ئۆتۆمبێلی پۆلیس لە تەواوی شاری لەندەن وەجووڵە دەکەون. خەڵکی بە ناباوەڕییەوە سەیر دەکەن. پەیادەڕەوەکان پڕ لە مەیتی منداڵانە. وەکوو شەڕێکی جیهانی دیکە، بەڵام بێ هاویشتنی تاکە فیشەکێك.

ئێستا گەیشتبوونە کەنارەی باشووریی رووبار. لە واترلۆ تێدەپەڕین و بۆلای رۆژهەڵات دەرۆیشتن. ئێستا بەرەبەرە بیناکان تۆزاویتر و کۆنتر دەبن. وای دەهاتەبەرچاو کە زیاتر لە چەند سەد ساڵە بەرێکەوتوونە. ئەلێکس لە ریزی پشتەوەی ئۆتۆمبێل لەگەڵ نیل دانیشتبوو. خاتوو رۆدمەن لەپێشەوە دانیشتبوو. شوفێرەکە پیاوێکی رەشپێست بوو. هیچکامیان قسەیان نەدەکرد. ناو ئۆتۆمبێل گەرم بوو. خۆر دەدرەوشایەوە، بەڵام ئەلێکس کە بیری لە رووداوەکە دەکردەوە، تەزوویەکی ساردی بەجەستە دادەهات و سەرمای بوو. ئەو باش دەیزانی بۆ شوێنێك دەچن کە بەرزاییەکەی زۆر بێت. جێگەیەك کە شەمشێری نادیاریان لێ دانابوو. بەڵام نەیدەزانی چاوەڕوانی چ رووداوێك بێت. بینایەکی ئیداری؟ رەنگە بینایەك کە خەریکی دروست کردنی بن. ئەلێکس سەیرێکی دەرەوەی کرد. سەری وەپشت پەنجەرە کەوت، هەوڵی دا هێوری خۆی بپارێزێت.

وەستان.

ئۆتۆمبێل لە مەودای پازدە مەتری جاددەیەك وەستا کە کۆتایی دەهات. خاتوو رۆدمەن و بیل لە ئۆتۆمبێلەکە هاتنەخوارەوە و ئەلێکسیش بەدوای ئەواندا ئەمکارەی کرد. واپێدەچوو ئەویان بۆ شوێنی دیشەکان نەهێنابوو.

هیچ بینایەکی بەرزی لێنەبوو و یا لانیکەم تا یەك مایلی ئەم شوێنە بینای بەرزی لێنەبوو. شەقامەکە زۆر پیس بوو. رۆژنامەی دڕاو و قدولکەی بەتاڵ و یا کۆتی دڕاو تەواوی ئەم شەقامەی داگرتبوو.

ئەلێکس بینایەکی لە کۆتایی شەقامەکە بینی. کۆتایی شەقامەکە کەنیسەیەکی لێبوو کە زیاتر تایبەت بە شارەکانی وەکوو رۆما و ڤێنیز

بوو تاوەکوو لەندەن. بێشك ماوەیەکی زۆر بوو ئەم کەنیسەیە کەڵکی لێوەرنەدەگیرا. کەنیسە زۆر خراپ ببوو و بەم حاڵەوە گەورەیی خۆی پاراستبوو. ژێر تاقی چوونەژوور دوو دینگەی گەوەرە بەرچاو دەکەوتن. بەردی مەرمەڕ و کانزای مس لەدەرگاکەیدا بەکارهاتبوون. بەڵام ئێستا ڕەنگی مسەکە لەسەوز دەچوو و ئیتر ڕەنگی زێڕینی نەمابوو. لە بەشی دواوەی کەنیسەکە، منارەی کەنیسەکە لەژێر ڕووناکی خۆر دەدرەوەشایەوە. پەیکەرێك دەستی نەبوو، زۆربەیان بێ ڕووخسار بوون. ئەوانە زەمەنێك جێگەی پەرستش بوون و پیرۆز بوون. بەڵام دووسەد ساڵ مانەوەیان لە لەندەن، هەموویانی بەجۆرێك تێکوپێك دابوو.

ئەلێکس پرسی:

– بۆچی بۆ ئێرە هاتووین؟

خاتوو ڕۆدمەن لە نزیکی ئەو وەستابوو و کەنیسەی سەیر دەکرد.

– وامزانی ڕەنگە حەزت لەوە بێت کە شەمشێری نادیار ببینی.

– من لەبارەی شەمشێری نادیار هیچ زانیارییەکم نییە.

ئەلێکس بێ ئەوەی قسەیەکی دیکە بکات، بە چاوەکانی بەدوای دیشی گەوەرە دەگەڕا. بەڵام لەسەر منارەی کەنیسە هیچ دیشێکی لێنەبوو و تا ئەوجێگەیەی ئەو دەیبینی، ئەم کەنیسەیە ئەوەندە بەرز نەبوو. دیشەکانی دەبوایە لە شوێنێکی بەرزتر دانرابن.

– ئێرە کوێیە؟

خاتوو ڕۆدمەن بە سەیروسەمەرەیی سەیری ئەلێکسی کرد.

– دەزانی، ئەلێکس. دەتوانم سوێند بخۆم شتێکی شاراوە لەتۆدا هەیە.

ئەلێکس بە خێرایی دەمی بەست بۆئەوەی وایەرەکە بشارێتەوە و دوایی سەیری خاتوو ڕۆدمەنی کرد.

– نیل، ئایا لە تەپڵی سەری تا نووکی پێیەکانیت گەڕاوە؟

– بەڵێ، ڕێك ئەمجۆرەی کە وتبووت.

ئێستا ئەلێکس تووڕە بوو، بەڵام ڕووخساری کردە لایەکی دیکە بۆئەوەی ددانەکانی نەبینرێت.

- ئێوه هەرچی به منتان وت بەڕێوەم برد. ئەوەندەی نەمابوو بمرم.
- ئەلێکس، من به هیچکەس، تەنانەت متمانەم به نیلیش نییه. بەلام چونکه پرسیارت کرد، دەبێ بڵێم که ئێره نزیك به دووسەد ساڵ پێشتر چاك کراوه. کۆمەڵێك قەشەی کاتۆلیك لێره دەژیان. لێره عیبادەتی پەرستشگه لەبیرنەکراوەکانیان دەکرد. دوایی ئەم کەنیسەیان جێهێشت. لەسەردەمی شەڕ ئەم کەنیسەیه بۆمباران کرا و لەو کاتەوه تا ئێستا کەسی تێدا نەژیاوه. دووپشك چەند ساڵ لەمەوپێش ئێرەی خاوێن کردەوه. چەند شوێنێکمان چاك کردەوه. حەز دەکەی ژوورەکەی ببینی؟
ئەلێکس شانەکانی هەڵاویشت.
- هەرچی ئێوه بیڵێن.
ئیتر جێگەی هەڵبژاردنی نەبوو. جولیا رۆدمەن سەبارەت بەوه ئەلێکسی بۆ ئێره هێنابوو که دوای چالاکی لەندەن و کووشتنی منداڵەکان، ئەویش به مردوویی لێره دیڵێتەوه.
سێ کەسی بەڕێکەوتن. ئۆتۆمبێل ئەوانی جێهێشتبوو. ئەلێکس سەیری دوکانەکانی هەردوولای شەقامی کرد تەنانەت یەکێکیشیان نەکرابوونەوه. بیری لەوه کردەوه که ئایا کەسێ لەدوورەوه ئاگای لەئەو نییه. هەر کەسێك که دەیویست بۆ ئەم کەنیسەیه بێت، دەبوایه لێره تێپەڕێت و بەمحاڵەوه زۆر به ئاسانی دەیتوانی وێنەیان لێ هەڵبگرێتەوه. گەیشتنه ناو دەرگای سەرەکی کەنیسه. دەرگا بەشێوەی ئۆتۆماتیك کرایەوه. خاتوو رۆدمەن وتبووی که له کەنیسەدا چەند کارێکی بەڕێوەبردووه.
چوونه ناو هۆڵێکی گەورەی چوارگۆشه. هەمووشت بەڕەنگی خۆڵەمێشی دەهاتەبەرچاو. میچ، دیوارەکان، دینگەکان. ئەلێکس سەیری دەوروبەری خۆی کرد و چاوەکانی کەم کەم خووی به رووناکی ناو کەنیسەوه گرت. پەنجەره بازنەییەکانی کەنیسه، شووشەی زۆر ئەستووریان هەبوو که رێگەیان نەدەدا رووناکی دەرەوه بێته ناو کەنیسەوه. دوو پەیکەری - پیرۆزه لەبیرکراوەکان - له ناو هۆڵەکەدا دەبینران و بۆنی خەم لەوێ بلاودەبۆوه. بەتەواوی دیاربوو که ماوەی پەنجا ساڵیش دەبێ کەس بۆ

ئەم کەنیسەیە نەهاتووە. ئەلێکس کۆخەیەکی کرد کە دەنگی کۆخەکەی دەنگی دایەوە. بێدەنگییەکی تەواو لەناو هۆڵەکەدا بوو. شەقام لە پشت سەری ئەوانەوە بوو. دیوارێك ڕێگەی ڕۆیشتن بەرەوپێشی بەستبوو. بەلاَم دوای ماوەیەکی کەم خاتوو ڕۆدمەن بەڕێکەوت. پاژنەی پێلاَوەکانی لەسەر بەردفەرشەکانی کەنیسە دەنگی تایبەتیان هەبوو. لەگەڵ بەڕێکەوتنی خاتوو ڕۆدمەن، چەند چرایەك پێکران و دەنگی زەنگێك بەگوێ کەوت. لەم کاتەدا، پێنج دەربیچە کە لەناو دیواردا بوون، یەك بەدوای یەك کرانەوە. ئەم دەربیچانە بەجۆرێك چاك کرابوون کە واپێدەچوو بەشێك لە دیوارە خشتییەکە بن. ئێستا ڕووناکییەکی زیاتر هاتە ژوورەکە و دوایی دەنگی هاتووچۆ و کارکردنی ئامراز و ئامێر و چالاکییەکی زۆر بەگوێ گەیشت.

خاتوو ڕۆدمەن بە دەنگێکی بەرز وتی:

- بۆ شەمشێری نادیار بەخێرهاتن.

ئەلێکس ئەمجارە زانی بۆچی ئەویان بۆئێرە هێناوە. خاتوو ڕۆدمەن سەبارەت بەوە ئەلێکسی بۆ ئێرە هێنابوو کە کارەکەی بەڕوو داتەوە.

ئەلێکس لە دەرگا تێپەڕی و چووە ژوورەوە. کەنیسەیەکی کلاسیك بوو. شتێکی وەکوو دێرەکەی مالاگوستو. واپێدەچێ دوویشك زۆری حەز لە پەرستشگە و کەنیسەکانە.

کەنیسە پڕ بوو لە ئامێر و ئامرازی ئەلەکترۆنی، کۆمپیوتەر، مۆنیتۆرەکان، تەلەڤزیۆنەکان، ڕووناکی پیشەیی و ژمارێکی زۆر لە ئامێری کارەبایی. بیست سی کەسێك لەکاتی کارکردندا بوون کە لانیکەم نیوەیان موسەلسەلیان بەدەستەوە بوو. لەکاتێکدا ئەلێکس سەیری ئەمانەی دەکرد، دەنگێ بەرز بوویەوە.

- شەش خولەك تا هەڵدان.

ئەلێکس زانی کە بۆ ناوەندی عەمەلیات و چالاکیی دوویشك هاتووە. لەکاتێکدا سەیری دەکرد، زمانی گەیاندە سەرووی دەمی و دوگمەیەك کە سمیترز چاکی کردبوو، بە نووکی زمان پاڵیدا. مارك کێلنر، بەڕێوەبەری

پەیوەندییەکانی سەرۆك وەزیران، ئەمجارەش هەڵەی کردووە. دووپشك دیشەکانی لەسەر بینای بەرز دانەنابوو.

شەش پیاو کە جلی رەشیان پۆشیبوو خەریکی هەواکردنی باڵۆن بوون. گۆڕەپانێکی بەربلاو بوو و منارەی کەنیسە بەڕادەی بینایەکی شەش نهومی بەرز بوو. باڵۆنیان بە رەنگی شین و سپی دەرهێنابوو، بەجۆرێك کە کاتی ناردانی بەرەو بەرزایی لە شینایی ئاسماندا وون دەبوو. چۆن دەیانویست ئەم باڵۆنانە بۆ ئاسمان بنێرن؟ ئەلێکس وەلامێکی بۆ ئەم پرسیارە پێنەبوو. کەنیسە بە تەواوی لەلایەن منارەکەوە داپۆشرابوو. بەهەرحاڵ، ئەوە کارێك بوو کە دەیانویست بیکەن. باڵۆن شێوەی کۆن و قەدیمی هەبوو، بەلام ئەو سەکۆیەی کە باڵۆنەکەیان لەسەر دانابوو، زۆر مۆدێرن و لە جۆری پەلاستیکی بوو.

ئەلێکس بەخێرایی سەیرێکی ئامێر و ئەجیزەکانی کردەوە. چوار دیش بە چوار گۆشەی باڵۆنەوە بەسترابوون کە هەرکامیان روویان لەلایەکەوە بوو. بە رەنگی سیلڤەری مات بوون. پانتایی هەر دیشێك دەگەیشتە سێ مەتر. هەر دیشەی بە وایەرێکی زۆرەوە لە سندووقێکی نێوان سەکۆکە بەسترابوونەوە. باڵۆن ئێستا پڕ لە هەوا ببوو.

ئێستا چەند پیاوی دیکە بۆ هاوسەنگ راگرتنی سەکۆکە رایانکرد.

جولیا رۆدمەن بیری لە هەموو شتێك کردبۆوە. ئەو بیری لەوە کردبۆوە کە حکوومەتی ئینگلتەرا دوای کووژرانی یاریزانەکان ئەگەری ئەوەی هەیە بەدوای دیشەکاندا بگەڕێت و هەربۆیەش لەم کەنیسە کۆنە کەڵکیان وەردەگرت. تەنیا ئەوە بەس بوو کە بۆ چەند خوولەکێك ئەم دیش، و باڵۆنە بەرەو ئاسمان بەرز ببنەوە. بەرپرسانی ئینگلتەرا ئەوکات بەم ئەنجامە دەگەیشتن کە ئیتر زۆر درەنگ بووە. نانوشلەکانی زێڕین دەتوانەوە و هەزاران منداڵ دەمردن.

ئەلێکس ئاگاداری ئەوە بۆوە کە نیل کۆتەکەی دەرهێناوە و شتێك لە پشتی خۆی دەبەستێ. ناوقەدبەندێکی چەرمی بوو، لەگەڵ دوو سیلاحی وێرانگەر، نا بە تەواوی شەمشێر بوون و نە خەنجەر. شتێك لەنێوان ئەم

دووەدا بوون. ئەلێکس وەبیری هاتەوە کە دکتۆر لیبەرمەن چۆن کووژرا. ئەو زۆر بەباشی دەیزانی ئەلێکس لە شەڕکردن بە خەنجەر و شەمشێر لێهاتووییەکی بێ وێنەی هەیە. ئەو زۆر بەباشی دەیزانی کە نیل دەتوانێ لە کاتێکی زۆر کەمدا چەند کەسێك بکووژێت.

ئەلێکس هیچ کارێکی لەدەست نەدەهات، جگە لەوەیکە چاوەڕوان بمێنێتەوە و سەیریان بکات. ئەو هیچ چەکێکی شاراوەی پێنەبوو. خاتوو رۆدمەن واپێدەچوو بڕوای بە قسەکانی کردبێ، بەلاّم هێشتاش چاوی لێهەڵنەدەگرت. خاتوو رۆدمەن هێشتا لەشك و گوماندا بوو. ئەگەر ئەلێکس بێ ئیزنی خاتوو رۆدمەن بشکۆخیبا، ئەوا لەت بە لەتیان دەکرد.

بەلاّم چ ماوەیەك بوو پەیامنێرەکەی ناو دەمی چالاك کردبوو؟ شەست چرکە؟ رەنگە زیاتریش. ئەلێکس هەستی کرد کە وایەری سەر ددانەکانی وەجووڵە کەوتن. هەربۆیەش بەم ئەنجامە گەیشت کە پەیامی ئەو بەدەست (ئێم ئای٦) دەگات. چ ماوەیەکی دەکێشا بۆئەوەی ئەوان بگەنێ؟

خاتوو رۆدمەن لە ئەلێکس نزیك بۆوە و دەستێکی لەسەر شانی دانا.

- با بۆت شی بکەمەوە کە ئێمە لێرە چی دەکەین، ئەلێکس. وەکوو ئەندامێکی دووپشك، دەزانم زۆر حەز دەکەی بزانی ئێمە چی دەکەین.

ئەلێکس پرسی:

- دەتانهەوێ بە باڵۆن بچنە بەرەو بەرزایی و ئاسمان بچن؟

خاتوو رۆدمەن بزەیەکی هاتێ:

- نا، من بۆ هیچ شوێنێك ناچم. دوو رۆژ پێشتر ئێمە هەندێ داواکاریمان دایە بەرپرسانی حکوومی ئینگلتەرا. ئەم داواکاریانە دژ بە حکوومەتی ئەمریکا بوو. بەلاّم وتمان ئەگەر ئەمریکاییەکان گوێ لە داواکارییەکانمان نەگرن، ئینگلیزییەکان تاوانەکەی دەدەنەوە. کاتی تۆڵەسەندنەوە بە کۆتایی دەگات.

خاتوو رۆدمەن سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد.

- پازدە خوولەکی ماوە. ئەمریکاییەکان داواکارییەکانی ئێمەیان جێبەجێ نەکرد. ئێستاش کاتی سزادانە.

ئەلێکس پرسی:
– دەتانهەوێ چی بکەن؟
– تا چەند خوولەکی دیکە باڵۆن بە تەواوی پڕ لە هەوا دەبێ. ئێمەش بۆ سەرووی کەنیسەی دەبەین. پەتەکانی باڵۆن، تا سەد مەتری بەرز دەبنەوە و باڵۆنکە لەگەڵ خۆیان دەبەن. هەر کە گەیشتە بەرزایی، سەکۆ چالاك دەبێت. بۆ ماوەی دوو خولەك پەیامێك بۆ دیشەکان دەنێردرێ و بەداخەوە ژمارێکی زۆر لە خەڵکی دەکووژرێن.
– بۆچی؟ ئێوە چ داواکارییەکتان لە ئەمریکاییەکان کردووە؟ دەتانویست ئەوان چی بکەن؟
– لەڕاستدا نەماندەویست هیچ کارێکی تایبەتی بکەن. داواکاری ئێمە زۆر سەیر و گاڵتەجاریانە بوو. داوامان لێکردن چەك بن. داوای ملیارەها دۆلارمان لێکردن. دەمانزانی ئەوان بەگوێمان ناکەن.
– کەواتە بۆچی ئەم داوایەتان لێکردن؟
– چونکە مشتەرییەکەی ئێمە خوازیاری تۆڵەسەندنەوەیە. تۆڵەسەندنەوە سەبارەت بە زۆرەملییەکانی ئەمریکا و ئینگلتەرا و تێکەڵاوبوونیان لەو شتانەی کە هیچکات پەیوەندیان بەئەوانەوە نییە. مشتەری ئێمە دەیەوێ پەیوەندی دۆستانەی نێوان ئینگلتەرا و ئەمریکا نەمێنێ و ئێمە ئەمجۆرە داواکاری ئەوان بەجێ دەگەیەنین.
– بەداخەوە ژمارێکی زۆر لە خەڵکی دەکووژرێن. مردنێکی لەناکاو و چاوەڕواننەکراو روو دەدات. وادیتەبەرچاوو کە بە شەمشێرێکی نادیار کووژراون. ولات بە تەواوی دەهەژێت. دوایی هەواڵەکەی لە هەموو شوێن بڵاو دەبێتەوە. ئەمانە مردن چونکە ئەمریکاییەکان و ئینگلیزییەکان بەگوێی ئێمەیان نەکرد. ئەوانە مردن چونکە ئەمریکاییەکان نەیانویست پشتگیری لە یەککگرتوویی ئەم دوو وڵاتە بکات. ئایا دەتوانی بیر لەوە بکەیتەوە کە رۆژنامەکان چی دەنووسن؟ ئایا دەتوانی ئەمە بێنیتە بەرچاو کە خەڵکی چۆن بیر دەکەنەوە؟ سبەی بەیانی ئینگلیزییەکان رقیان لە ئەمریکییەکان دەبێتەوە و بە نیفرەتەوە لێیان بێزار دەبن.

- دواتر، تا چەند مانگی دیکە شەمشێری نادیار هێرشی خۆی دەست پێدەکاتەوە. ئەمجارە نۆرەی نیویۆرك دەبێت و ئەم رووداوە لەوێ روو دەدات. ئەمجارە داواکارییەکانمان مەنتیقیتر دەبێت. داوای کەمتر دەکەین و ئەمریکاییەکان بۆمانی جێبەجێ دەکەن. چونکە ئەوان بینیویانە لەندەن تووشی چ رۆژێکی رەش بووە. جگە لەمە چارەیەکی دیکەیان نییە. ناتوانی ئەمە بێنیتە ناو مێشك و هزرت کە چ نیفرەتێك لەنێواز ئەم دوو ولاتەدا پەیدا دەبێ. دووپشك لەم ناوەدا سەد ملیۆن پاوند قازانج دەکات.

خاتوو رۆدمەن نەختێك بێدەنگ بوو. واپێدەچوو چاوەڕوانی ئەوەبوو کە ئەلێکس پیرۆزبایی لێبکات. بەلاّم ئەلێکس نەیدەتوانی کارێکی ئەوتۆ بکات. تەنانەت نەیدەتوانی بەئەنقەستیش ئەمکارە بکات و ئاژا نیشان بدات.

ئەلێکس بە لەسەرەخۆیی وتی:

- ناتوانن ئەم کارە بکەن. ناتوانن سەبارەت بەوەیکە پارە بەدەست بێنن، منالّەکان بکوژن.

بەلاّم هێشتا ئەم وشانە لە دەمی نەهاتبوونە دەرەوە، زانی تووشی چ هەلّەیەك بووە. کاردانەوەی جولیا رۆدمەن بە خێرایی مارێکی ژەهراوی بوو. بە خێرایی دووپشکێك. ماوەیەکی کوورت لەمەوپێش پێکەنینێکی لەسەر لێوان بوو و ئێستا هۆشیار و مەترسیدار سەیری دەکرد.

نیل سەیری دەکرد. هەستی دەکرد کێشەیەك لەئارادایە. ئەلێکس نەختێك وەستا بۆئەوەی بە تەواوی بیورەکە لەناوقەدی خاتوو رۆدمەن بدات!

خاتوو رۆدمەن دەمی کردەوە:

- منالّەکان؟ من هیچکات باسی منالّەکانم نەکردووە....

ئەلێکس هەولّی دا قسەکەی چاك بکاتەوە.

- بەلاّم منالّەکانیش هەموویان دەمرن. مێر منالّ و منالّ.

- نا، ئەلێکس. تۆ باش دەزانی کە بڕیارە منالّەکان ئامانجی ئێمەن. من هیچکات لای تۆ باسی منالّەکانم نەکردبوو. بێشك کەسێکی دیکە ئەم قسەیەی لای تۆ کردووە.

- نازانم لەبارەی چی دەدەوێی؟

خاتوو رۆدمەن لێی نزیکتر بۆوە و بەوردی سەیری رووخساری کرد.

- دەمزانی گۆڕانکارییەك رووی داوە. چیت لەناو دەم دایە؟

مەجالی شارنەوەی نەمابوو. ئەلێکس دەمی کردەوە.

- من لە وایەری ددان کەڵك وەردەگرم.

- بەڵام تۆ لە پوزیتانۆ وایەری ددانت نەبوو.

- لەسەر ددانم رامگرتبوو.

- دەری بێنە.

- دەرنایەت.

- من بە چەکووچ دەری دێنم.

ئەلێکس ئیتر چارەی نەبوو. بە دەستی وایەری لاستیقی لە دەمی دەرهێنا. نیل لێی نزیك بۆوە. بە وردی کونجکاو ببوو.

- دا بزانم، ئەلێکس.

وەکوو منالێکی شەیتان کە لەکاتی جووتنی بنێشت گرتوویەتی، ئەلێکس دەستی بۆلای نیل درێژ کرد. وایەر لەناو دەستی ئەلێکس دابوو و بە تەواوی دیار بوو کە وایەرێکی ئاسایی نییە. کلیلێکی بچووکی پێوە دیار بوو.

ئایا لەکاتی خۆیدا دوگمەکەی پاڵدابوو؟

خاتوو رۆدمەن بە قیژاندنەوە وتی:

- فڕێیدە!

ئەلێکس هاویشتیە سەر عەرد و خاتوو رۆدمەن هەنگاوێکی بەرەو پێشەو نایەوە و بە توندی پێلاقەی پێدادا. کاتێك پێی لەسەر هەڵگرت، وایەرەکە دوولەت ببوو.

خاتوو رۆدمەن رووی لە نیل کرد.

- زۆر گێلی، نیل. پێو وتی لە تۆقی سەرییەوە تا بەری پێی بیگەڕێ.

نیل نەیدەتوانی هیچ شتێ بڵێت.

- تەنیا جێگەیەك کە نەمگەڕا، ناو دەمی بوو.

ئێستا خاتوو رۆدمەن بۆلای ئەلێکس گەڕایەوە.
– تۆ ئەوت نەکووشتوە، ئەلێکس. وایە مەگەر نا؟ خاتوو جۆنز هێشتاش زیندووە.
ئـەلێکس هیچـی نـەوت. خـاتوو بـە تونـدی سـەیری دەکـرد و دوایـی بروسکئاسا زلەیەکی لە روومەتی ئەلێکس دا. زەلەکە لە ناو کەنیسەکەدا دەنگی دایەوە. ئەلێکس چەند هەنگاوێك بۆلای پشتەوە چوو. هەست بە سوورهەڵگەڕانی رووخساری دەکرا. خـاتوو رۆدمـەن ئیشاڕەیەکی کرد و دووپیاوی چەکدار لە تەنیشت ئەلێکس وەستان.
خاتوو رۆدمەن بە دەنگی بڵند وتی:
– رەنگە کەسانێك بۆ ئێرە بێن. گرووپەکانی سێ، چوار و پێنج حاڵەتی بەرگرێی بگرن.
پیاوێکی گرووپەکانی سێ و چوار و پێنج فەرمانی ئامادەباشی دا. بیست کـەس بـەرەو پێشـەوە رایـانکرد. پێیـەکانیان لەسـەر تـەختایی ژوورەکـە دەنگی تایبەتی دەدایەوە.
ئێستا خاتوو رۆدمەن سەیرێکی ئەلێکسی کرد. چاو لێکردنەکەی زاڵمانە بوو.
– رەنگـە خـاتوو جۆنز زینـدوو بێ، بـەڵام تـۆ بـە زینـدوویی نامێنیتـەوە. ئەوەنـدە لـە زیندوومانـەوەت نـەماوە. وابیر دەکەیـەوە بۆچـی تـۆم بـۆ ئێـرە هێناوە؟ بۆئەوەی دەمهەوێ بۆخۆم شایەدی مردنت بم. هۆیـەکی تایبـەتیم هەبوو بۆئەوەی بتکووژم، باوەڕم پێبکەی یا نا، تۆ پێشاوپێش مردووی.
خاتوو رۆدمەن سەیری باڵۆنەکەی کرد کە پڕ لە هەوا ببوو و نێوان عەرد و منارەکـەی پـڕ کردبـوو. سـەکۆکە لـەژێر باڵۆنەکـە بـوو کـە مـەترێك مەودای لەگـەڵ زەوییـەوە هـەبوو. گوریسـەکان ئامـادە بـوون. دیشـەکان لەحاڵـەتی ئۆتۆماتیکدا بوون.
خاتوو رۆدمەن ئەمری پێکردن:
– چـالاکی و پـلان دەست پێبکات. کـاتی ئـەوە هـاتوو کـە لەنـدەن هێـز و توانای شەمشێری نادیار ببینێ.

## بڕیاری یەکلاکەرەوە

- هەڵدان.... هێڵی سوور.... هەڵدان ..... هێڵی سوور.

- بە بیستنی ئەم دەنگە، پسپۆڕێکی دوورپشک بە دەست دوگمەیەکی پاڵدا. دەنگی جووڵانەوەی ئاسنێکی گەورە بیستراو چەرخێك لە سەر ئەوان دەستی بە سووڕان کرد. ئەلێکس سەیری سەرەوەی کرد. لە یەکەم نیگا، وایهاتەبەرچاو کە پەرستگەکان و فریشتەکان باڵیان گرتووە و دەفڕن. بەڵام دوای ماوەیەکی کوورت زانی کە چ شتێك روو دەدات. هەموو میچەکەی کەنیسە لەحاڵی ڕۆیشتن و جێگۆڕکێدا بوو. منارەی کەنیسەیان بەجۆرێك نۆژەن کردبۆوە کە بەئارامی لێکدەکرایەوە. درزێك لەسەرووی منارەکە بەدیار کەوت و بەرەبەرە زیاتر دەکرایەوە تا بە دوو بەش دابەش کرا. خاتوو ڕۆدمەن سەیری سەرووی خۆی کرد. رووخساری لە خۆشیان دەبریقایەوە. تەنیا لەمکاتەدا بوو کە ئەلێکس هەستی بەوە کرد تا چ رادەیەك کات و پارەی لێ خەرج کراوە. تەواوی کەنیسەکەیان گۆڕیبوو. واپێدەچوو ملیۆنەها پاوندیان لێ خەرج کردبێ تا ئەم کاتە تایبەت و ئامادە بێت.

هیچکەس شکی ئەم شوێنەی نەکردبوو. پۆلیس و هێزەکانی سوپا تەواوی لەندەنیان گەڕابوو. هەر بینایەکیان لانیکەم بە سەدجار گەڕابوو. بەڵام دیشەکان لەناو ئەم کەنیسەیەدا بوون. تەنیا لە کاتێکی زۆر کەمدا باڵۆن ئەوانی بۆ بەرزایی دەگواستەوە. بێشك ئاگاداریی ئەم بارەدۆخە و باڵۆنەکە دەبوونەوە، بەڵام تائەو کاتەی کە دەیانویست کارێك بکەن، ئیتر کار لەکار ترازابوو. دیشەکان کاری خۆیان دەکرد. بە هەزاران منداڵ گیانی خۆیان لەدەست دەدا.

ئەلێکسیش یەکێك لەم منالآنە بوو. خاتوو رۆدمەن ئەوی نەکووشتبوو. چونکە پێویستی بەمکارە نەبوو. ئەو بۆخۆیشی ئەمەی وتبوو: تۆ *پێشاوپێش مردووی.*
خاتوو رۆدمەن بە دەنگێکی ئارام وتی:
– بالۆنەکە بنێرنە سەرەوە.
دوو پیاو هەنگاویان بەرەوپێش نایەوە و میکانیزمی بەربوونی بالۆنەکەیان وەگەڕ خست و خێرا سەکۆکە بەرز بۆوە. ئێستا منارەی کەنیسە میچی نەبوو. لەکاتێکدا بالۆن بەئارامی خۆی لە زەوی دوور دەخستەوە، ئەلێکس سەیری دەکرد. هیچ بایەکی نەدەهات. واپێدەچوو کەش و هەواش لایەنگرێی لە دووپشك کردووە.
ئەلێکس سەیری دەوروبەری خۆی کرد. رووخساری هێشتا سەبارەت بە زلەکەی خاتوو رۆدمەن دەسووتایەوە. بەلآم ئەو کاری بە ژان و سووتانەوە نەبوو. ئەو نیگەرانی چرکەکان بوو، بەلآم هیچ کارێکی لەدەست نەدەهات. نیل بەنیفرەتێکی لەڕادەبەدەر سەیری دەکرد. دوو شەمشێری سامۆرایی هێشتا لەژێر قۆلی بەستبوو و ئەلێکس باش دەیزانی کە زۆر حەز دەکات کەلکیان لێوەربگرێت. ئەو نەتەنیا بە دووپشك، بەلکوو خیانەتی بە نیلیش کردبوو. ئەو لەبەرچاوی خاتوو رۆدمەن نیلی بچووك کردبۆوە و هەر بۆیەش نیل لەهەرکاتێکدا ئامادەیی هەبوو جەستەی ئەلێکس بە دووکەرت دابەش بکات. بەدوای بیانوویەکی بچووك دەگەڕا. دوو نیگابانی چەکدار هێشتا لە تەنیشتی ئەلێکس وەستابوون و هیچ کارێکی لەدەست نەدەهات.
(ئێم ئا٦ی) لەکوێ بوو؟ ئەلێکس سەیری وایەری شکاوی ددانی کرد. بیری لەوە کردەوە چ باشتر دەبوو کە هەر بە بینینی کەنیسە، پیامنێری ئامێرەکەی وەکار خستبا. بەلآم چۆن و لە کوێوە ئەوەی دەزانی کە ئەم کەنیسەیە چوێنی چالاکی دووپشکە؟ کێ دەتوانی زانیارییەکی لەمبارەیەوە هەبێت؟
خاتوو رۆدمەن سەیری ئەلێکسی کرد.

- ئەلێکس، پێش ئەوەی بمرێ، دەمهەوێ شتێکت پێ بڵێم.
- حەز ناکەم بیزانم.
- بۆچی، وابزانم زۆریشت حەز لێیەتی. لەبارەی باوکت دایە. لەبارەی دایکت دایە. شتێکە دەبێ بیزانی.

ئەلێکس هیچ حەزی لەوە نەبوو گوێی لێبێت و لەوە بگوزەرێین بە بڕیارێك گەیشتبوو. ئەو بڕیار بوو بمرێ، نەیدەویست بەم شێوەیە بمرێ. دەیویست بەجۆرێك زیان بە جولیا رۆدمەن بگەیەنێت. رۆدمەن درۆی لەگەڵ کردبوو. نابەجێ کەڵکی لێوەرگرتبوو. لە هەموو ئەمانە خراپتر، ببوو بە هۆی ئەوەی خیانەت بە هەموو ئەو کەسانە بکات کە دەیانناسێت. هەوڵی دابوو وەکوو باوکی ئەویش بباتە ناو گروپی دووپشك. بەڵام باوکی هەرچی بوو و هەر کارێکی کردبوو، حەزی نەدەکرد وەکوو ئەو بێت.

بیری لەوە کردەوە کە هێرش بکاتە سەر جولیا رۆدمەن، بەڵام ئەگەر رەشاشی[179] دەستی نیگابانەکان کون کونیان نەکردبا، بێشك نیل دوولەتی دەکرد.

بەڵام هەر لەم کاتەدا پەنجەرەیەك ورد بوو و شتێك لەناو کەنیسەدا تەقییەوە. دوکەڵێکی رەش هەموو شوێنێکی پڕ کرد. دوای ماوەیەکی کەم، دەنگی تەقەی رەشاش بیسترا و تەقینەوەی دووهەم رووی دا. جولیا رۆدمەن هاوسەنگی لەدەست دا و کەوتە خوارێ. نیل سوورپایەوە. پەڵە سپییەکانی سەر رووخساری زیاتر لەهەموو کات دەبریقانەوە. چاوەکانی دەرپەڕیبوون.

ئەلێکس ویستی خۆی رزگار بکات.

---

[179] - رەشاش بەم چەکە دەڵێن کە بە پەلاپیتکەیەك چەند گوولە بەیەکەوە دەردەچن. رەشاش قەبارە و جۆری جیاوازیان هەیە. (موسەلسەل – تیربار)

بە جوولەیەکی لەناکاو، بە ئەنیشك لێدانێکی توندی لە سکی نیگابانی لای چەپی دا. پیاوەکە سکی گرت و خوار بۆوە. هەر لەم کاتەدا، نیگابانی دووهەم بۆلای ئەلێکس سووڕایەوە. ئەلێکس لەسەر پاژنەی پێی سووڕا و لێدانێکی توندی ئاراستەی ڕەشاشەکەی کرد. ئەوە ڕێك لەو کاتەدا بوو کە نیگابانەکە پەنجەی بە پەلاپیتکەی ڕەشاشەلەکەی داهێنا. گوللەکان بەسەر شان و پیل و سەریدا تێپەڕین و چەند گوللەیەك بە نیگابانەکەی دیکە کەوتن. ئەلێکس بە سەر لێدانێکی توندی لە نیگابانەکە دا. نیگابانەکە لەتاو ژان هاواری لێ بەرز بۆوە و لەم کاتەدا مستی توندی ئەلێکس لەسەر قورگی هاتەخوارێ. نیگابانەکە هاوسەنگی لەدەست دا و بە توندی بەعەردی کەوت.

ئێستا ئەلێکس ئازاد ببوو.

هەمووشت شێواو و تێکەڵپێکەڵ ببوو. دەنگی تەقەی موسەلسەلەکان بەردەوام بوو و ئێستا تەقینەوەیەکی دیکە بەگوێ گەیشت. ئەلێکس چاوی بە باڵۆنەکە کەوت کە بەئارامی لەسەرووی کەنیسە وەستاوە و بێ ئەوەی خراپ ببوبێت، بۆلای بەرزایی شاری لەندەن بەڕێوەبوو. باڵۆن ئامێرگەلێکی لەگەڵ خۆی دەبرد کە بەشێوەی ئۆتۆماتیك کاریان دەکرد. چالاك کرابوو. ئەگەری ئەوە هەبوو کە هێرش بکرێتە کەنیسە و جولیا ڕۆدمەن بگرن. ئەگەری ئەوەش هەبوو باڵۆنەکە بێننەخوارەوە. بەڵام زیاتر لە چەند خوولەکێك بۆ کارەسات، بۆ وێرانبوونێکی چاوەڕواننەکراو، بۆ کوشت و کوشتارێکی نامرۆڤانە نەمابوو. ڕەنگە زۆر درەنگ بووبێت.

تەنیا کارێکی لەدەست دەهات. دوو گووریس (پەت) بە باڵۆنەوە بەسترابوون کە بڕیار بوو کاتێك باڵۆن گەیشتە بەرزایی دیاریکراو، لەم دوو گووریسە بۆ هاوسەنگ کردن و ڕێك ڕاگرتن کەڵك وەربگیرێت. ئەلێکس خێرا بۆلای گووریسێکیان ڕایکرد. پاسەوانێکی دووپشك هەولێ دا ڕێگەی لێبگرێت، بەڵام ئەلێکس بە لێدانێکی خێرا و توند کەواندییە سەر عەرد. ئەلێکس دەستەکانی بە گووریسەوە گرت و بەهۆی بەرەوسەرەوە ڕۆیشتنی باڵۆنەکە، لە عەرد هەڵکەندار.

خاتوو رۆدمەن قیژاندی:

- رایبگرن!

ئەو ئەلێکسی بینیبوو، بەڵام رەشەدووکەڵ نەیدەهێشت پاسەوانەکان ئەلێکسی ببینن. دەنگی تەقەی رەشاش بەرز بوو. ئەلێکس سەیری خوارەوەی کرد، مەودای لەگەڵ زەوی زۆر ببوو. خاتوو رۆدمەن، نیل و نیگابانەکانی دیکەی دووپشك دەستیان پێ رانەدەگەیشت.

خاتوو رۆدمەن لەکاتێکدا لەژێر کاریگەریی هێرشی غافڵگیرانەدا بوو، ناچار بوو نەختێك کات سەرف بکات بۆئەوەی ئارام بێتەوە. دوایی بۆلای مۆنیتۆرەکان رۆیشت بۆئەوەی ئاگاداری باروودۆخی دەرەوە بێت. لە دەرەوە سەربازەکانی رەشپۆشی بینی کە دەیانهەوێ مەترسیدرا بن و زیاتر هێرش بکەن. سەربازەکان بە جلی رەش و کڵاوی پارێزگاریی لەسەر، لە دەرەوەی کەنیسە ئامادەی هێرش کردن بوون. وای بیر کردەوە کە دوایی دەتوانێ دەروەستیان بێت، بەڵام ئێستا ئەلێکس لە هەموو شتێك گرنگتر بوو کە بەلایەوە بایەخی هەبوو.

- نیل، بەدوای بکەوە!

تەقینەوەی یەکەم کە پەنجەرەکەی ورد کردبوو، نیلی زامدار کردبوو. وادیاربوو ناتوانێ چالاکییەکی خێرای هەبێت. گێژ و کاس دەهاتەبەرچاو.

خاتوو رۆدمەن قیژاندی:

- هەر ئێستا! زووکە!

نیل جووڵایەوە. گووریسێك هێشتا لەخوارێ بوو و بەرامبەر بەچاوی وەسەما کەوتبوو. نیل دەستی بە گووریسەکەوە گرت وەکوو ئەلێکس بەرز بۆوە.

سەکۆیەکە ئێستا چل مەترێك لە زەوی دوور بوو. دەبوایە شەست مەتری دیکە بەرز بێتەوە، تا دیشەکان چالاك بن. کێشە زیادەکەی نیل و ئەلێکس لە خێرایی باڵۆنەکەی کەم کردبۆوە. بەڵام ئامێری هەوا گەرم کەرەوە هێشتا هەوای دەناردە ناو باڵۆنەکە. ئامێرێکی دیجیتاڵ کە لەسەر سەکۆکە

بوو، مەودای بەرزایی لەگەڵ زەوی دیاری دەکرد. چل و یەك... چل و دوو.... ئامێرەکان هیچکات نەیاندەزانی لەخوارەوە چی روودەدات و ئەمەش گرنگ نەبوو. ئامێرەکان بەپێی پلانی داڕێژراو کاریان دەکرد. دیشەکان چاوەڕوانی عەلامەتێك بوون تا کاری ناردنی پەیام دەست پێبکەن.

باڵۆن هێشتا بەرز دەبۆوە. چوار خوولەك تا دەسپێکی پلان و چالاکی دووپشك مابوو.

خاتوو جۆنز خێرا دەست بەکار ببوو. پێنج گرووپی تایبەتی لە ناوچە جیاجیاکانی شار لە ئامادەیی تەواودا بوون. هەر کە پەیامی ئەلێکسی وەرگرت، ئەو نزیکترین گرووپی ئاگادار کردەوە و چوار گرووپەکەی دیکەش وەکوو گرووپی پشتیوان بەرێکەوتن.

هەشت پیاو بەئارامی لە کەنیسە نزیك بوونەوە. هەموویان جلی تایبەتیان لەبەر کردبوو و جۆرەها کەرەستەیان پێبوو، هەروەها چەکی ئاوایان پێبوو کە بتوانن دەرگای کەنیسەی پێ بشکێنن، ئەوان ئامادەی شەڕ بوون. زۆربەی سەربازەکان دەمانچەی "سیگی ٩میلیمەتری[١٨٠]"یان لە رانی خۆیان بەستبوو. قومبەلەی دەستی لەو چەك و سیلاحانە بوون کە پێیان بوو. هەمو سەربازەکان رەشاشیی نیوە ئوتۆماتیکی "هێکلر و کاك ٩میلیمەتری ئێم پی[١٨١]"یان پێبوو کە زۆر بەدڵی ئێس ئای ئێس بوو. هەموویان دەیانزانی کە کەنیسە ئامانجی ئەوانە، بەڵام ئەم چالاکییە بۆ گشت سەربازەکان حوکمی کابووسی هەبوو. پێش گەیشتن و هێرشکردنی ئێس ئای ئێس، پۆلیس هەموو زانیارییەکانی پێویستی بۆ ئەو شوێنە پێدەدەدان کە دەیانویست هێرشی بکەنەسەر: بەرینایی دیوارەکان، جۆری دەرگا و پەنجەرەکان و شتەکانی دیکە. بەڵام ئەمجارە کۆمپیوتەر

---

180 - Sig 9mm

181 - Heckler & Koch 9mm MP5

کاتی ئەوەی نەبوو لەبارەی ئەم کەنیسەیەدا زانیاری بنێرێت. کاتی ئەم کارەی نەبوو.

ئەمر و فەرمان زۆر دیار و روون بوو: ئەلێکس رایدەر بدۆزنەوە و رزگاری بکەن. دیشەکان بدۆزنەوە و لەناویان ببەن. بەمحاڵەوە و دوای ئەم هەموو ئەمر و فەرمانە، ئالان بلێنت لەبارەی گرنگییەکانیدا قسەی کردبوو. دیشەکان لە ئەلێکس گرنگترن.

سەربازەکان رێك کاتێك گەیشتنە شوێنی دیاریکراو کە بانی کەنیسە کرابۆوە و باڵۆنەکە لەسەرووی کەنیسە دەبینرا. درەنگ گەیشتبوون. ئەگەر مۆشەکی شتینگرز[182]یان پێبایە، ئەوا بە یارمەتی ئەو کە بەدوای گەرمایی دەکەوێ، دەیانتوانی باڵۆنەکە دابەزێنن و بیکەوێننە خوارەوە. بەڵام ئێرە ناوەراستی لەندەن بوو. ئەم سەربازانە بۆ رووبەرووبوونەوە لەگەڵ گرۆگانگیرەکان ئامادە بوون، هیچکات بیریان لەوە نەدەکردەوە لەگەڵ شەڕێکی تەواو عەیار رووبەڕوو ببنەوە.

باڵۆن لەبەرچاوی ئەوان بەرز بۆوە و ئیتر هیچ کارێکیان بۆ راگرتنی لەدەست نەدەهات. ئەوان بەم ئەنجامە گەیشتن کە دەبێ خێرا بچنە سەربانی کەنیسە. سەربازێك راکەتێکی ٩٤میلیمەتری (ئێچ ئای ئی تی[183]) هاویشتە باڵۆنەکە. بەڵام موشەکەکە پێی نەکەوت و لە رێگەی گەرانەوە کەوتە ناو کەنیسەوە و تەقینەوەیەکی گەورەی پێکهێنا. هەر ئەم تەقینەوەیە هەلی خستە دەست ئەلێکس و خۆی گەیاندە گووریسەکەی باڵۆنەکە.

هەلێك بوو بۆئەوەی هێزی دووپشك توانایی خۆیان دەربخەن. هێزی ئێس ئای ئێس لەچەند لایەکەوە گوللەباران کران. کەسێك قومبەلەیەکی هاویشت. گڕ و تەقینەوەیەکی گەورە رووی دا.

---

182 - Stingers

183 - HEAT

هێزی ئێس ئای ئێس کە پێشبینی شەڕی نەدەکرد، خۆی لەناو شەڕێکی تەواوعەیاردا بینیەوە. ژمارەی هێزەکانی دووپشک لەوان زیاتر بوو. کەنیسە وەکوو قەڵایەکی داگیرنەکراو دەچوو. باڵۆن هێشتاش بەرز دەبۆوە.

سەربازێك کە چۆکی دادابوو، زۆر بەتاو بە بێسیمیك قسەی دەکرد.

– ئێرە دلتا یەك – سێیە. ئێمە لەگەڵ دووژمن رووبەڕوو بووینەتەوە و لەژێر ئاگری قووڕسی ئەوان داین. خێرا پێویستیمان بە یارمەتییە. خێرا. دیشەکانی ماهوارەیی دۆزرانەوە و بە باڵۆنێکەوە بەرەو بەرزایی ئاسمان دەچن. دووبارەی دەکەمەوە، دیشەکان لەناو باڵۆن دان. دەستمان پێیان راناگات..... بارودۆخی سوور. تەواو.

پەیامەکە خێرا گەیشتە مەقەڕی فەرماندەیی هەوایی لە ئێر ئەی ئێف(184) های وایکومب(185) لە سی مایلی دەرەوەی شاری لەندەن.

چەند چرکەیەکی زیاتر نەکێشا تا لە پەیامەکە تێبگەن. چەند چرکەیەکی گرانبەهای دیکەش بەم شێوەیە بەسەرچوو تا ئەوان باوەڕی پێبکەن. بەڵام لەماوەی کەمتر لە دوو خوولەك دوو جێتی "تورنادۆ جی ئار(186)" (فڕۆکەی تایبەت بەشەڕی هەوایی) لەفڕۆکەخانە بەرەو شاری لەندەن بەڕێکەوتن. هەردوو فڕۆکە دەزگەی لیزەریان پێوەبوو. فڕۆکەوانەکان بۆ شەڕ لە بەرزایی کەمەوە راهێنرابوون. بەخێرایی حەوت سەد میل لە کاتژمێردا، ئەوان دەیانتوانی کەمتر لە پێنج خوولەك خۆیان بگەیەننە کەنیسە و باڵۆنەکە لە هەوادا بتەقێننەوە.

بەرنامەکە بەم شێوەیە بوو.

---

184 - RAF

185 - Higt Wycombe

186 - Tornado GR4

بەڵام بەداخەوە ئەوان زیاتر لە پێنج خوولەك كاتیان لەبەردەستدا نەبوو. ئەمە یەكەمین تاقی كردنەوەی تواناییەكانی سیستەمی شەڕ لەگەڵ تیرۆریزم بوو. دووپشك تا دوایین كات دەستی خۆی روو نەكردبوو.
تا فڕۆكەكان دەگەیشتن كەنیسە و باڵۆنەكە، بێشك دووپشك كاری خۆی كردبوو.
ئەلێكس رایدەر خۆی لە گووریسەكەوە دەكێشایە سەرەوە. ئەو سەركەوتن بە گووریسی لە راهێنانەكانی ژیمناستیكی قووتابخانەكەی فێر ببوو. بەم حاڵەشەوە، پێویستی بە وەبیرهێنانەوەی ئەم بابەتە نەبوو كە سەركەوتن لە گووریسی قووتابخانە لەگەڵ سەركەوتن لەم گووریسە جیاوازییەكی زۆری هەبوو.
باڵۆن بە ئارامی بەرز دەبۆوە. هەوای گەرمی ناو باڵۆن بیست و یەك گرام لە هەر فوتەی چوارگۆشەدا بوو. بەڵام هەوای فێنكتری ئاسمانی لەندەن بیست و هەشت گرام لە هەر فوتەی چوارگۆشەدا بوو. هەر ئەم جیاوازییە دەبوو بە هۆی ئەوەی باڵۆن بۆلای بەرزایی ئاسمان بچێت و ئەمەش رێك ئەو شوێنە بوو كە ئەلێكس بۆی دەچوو.
ئەگەر ئەلێكس خوارووی سەیر كردبا، دەیدیت كە پەنجا مەتر لە زەوی دوور بووەتەوە. بەڵام ئەو سەیری خوارووی كرد. دەیزانی جیاوازییەكی سەرەكی ئەم گووریسە و گووریسەكەی قووتابخانە لەوەدایە كە ئەگەر لێرە بكەوێتە خواری بێشك دەمرێت.
سەكۆكە نزیك بە دەمەتر لە بەرزایی ئەودا بوو. لەسەر سەكۆكە ئامێری گەرمكردنی هەوا هێشتا كاری دەكرد. قۆڵ و شانی ئەلێكس ژانیان دەكرد. هەر جووڵەیەكی دەیكرد، ژانێكی زیاتر بۆ ئێسكەكانی دەگوازرایەوە. جمگەی دەستی هێزی لەبەردا نەمابوو و واپێدەچوو لەبەر یەك دەپچڕێن. دەنگی تەقینەوەیەكی دیكە هات و بەدوایدا دەنگی تەقەییەكی زیاتر بیسرا. بیری لەوە كردەوە كە رەنگە ئێس ئای ئێس تەقەی لێدەكەن. ئەگەر ئەوان باڵۆنیان دیتبێ، كە بێشك بینیویانە،

دەیانویست هەرجۆرێك بێ دایكێشنە خوارەوە. گیانی ئەو بەرامبەر بە هەزاران منداڵ كە بڕیار بوو بكووژرێن، چ بایەخێكی هەبوو؟
بیر كردنەوە لە گیانی منالآن هێزێكی بێووچانی پێبەخشی. ئەگەر تەنانەت گوللەیەكیشی پێبكەوێ، بێشك دەكەوێتەخوارێ. تەنیا بەهۆیەك دەبوایە خۆی بگەیەنێتە سەر سەكۆكە. ئەلێكس ددانی لێك چیر كردن و خۆی لە گوریسەكە هەڵكێشایە سەرووتر.
شەست و پێنج مەتر.... شەست و شەش .... باڵۆنەكە نەدەوەستا. بەلآم مەودای ئەلێكس و ئامانجەكەی بەرەبەرە كەمتر دەبۆوە. ئێستا تەقینەوەی سێیەم رووی دا و ئەلێكس غیرەتێكی دایە بەرخۆی و سەیری خوارەوەی كرد. بەلآم خۆزگەی خواست كە بریا ئەم كارەی نەكردبا. زەوی مەودای لەگەڵ ئەو زۆر بوو. پیاوانی ئێس ئای ئێس زۆر بە بچووكی و وردی دەبینران. سەربازەكان لەناو شەقامدا ئامادەی شەڕ و پێكدادان بوون و دەیانویست لەدەرگای كەنیسەوە بچنە ژوورەوە. پیاوانی دووپشكیش لە سوپەرماركەت و دووكانەكانی هەر دوولای كەنیسەوە سەنگەریان گرتبوو. دەنگی تەقینەوەیەكی دیكە بیسرا كە واپێدەچوو دەنگی نارنجۆكێك بێت.
بەلآم شەڕ و پێكدادانی ئەم خواروویە بۆ ئەلێكس بێ مانا بوو. ئێستا بوارێكی دیكە نیگەرانی كردووە. لە گووریسی دیكەی باڵۆن پیاوێكی دیكە باڵی گرتبوو و بەپێ پەڵە سپییەكانی سەر رووخساری هیچ لەوە دوودڵ نەبوو كە نیلە. بەئارامی سەردەكەوت، واپێدەچوو لەهەناسە كەوتبێت. ئەلێكس بەلایەوە سەیر بوو. ئەو دەیزانی كە نیل جەستەیەكی ئامادە و هێزێكی زۆری هەیە. دەبوایە بەرلەوەی نیل خۆی بگەیەنێتێ، كاری دیشەكان یەكلایی بكاتەوە. ئەگەر نیل گەیشتبایە ئەلێكسی، بێشك هیچ بەختێكی بۆ ئەم كارە نەدەبوو.
لەكاتێكدا ئەلێكس چاوەكانی لە نیل بڕیبوو، خۆی لە گووریسەكەوە دەكێشایە سەرەوە. ئێستا شتێكی بەدەست كەوت، ئیتر بە سكۆكە گەیشتبوو. بیری لەوە كردەوە رەنگە هەر لەوێ بتوانێ دیشەكان

بەرداتەوە خواریّ. بەلاّم دوایی بینی کە دیشەکانیان زۆر بە توندی بە وایەر بەستۆتەوە و ئەم کارە مەحاڵە.
دەبوایە بچێتە سەر سەکۆ و ئەمە کارێکی ئاسان و ئاسایی نەبوو. بەم حاڵەوە، دەبوایە پەلەی کردبا و بەر لەوەی نیل خۆی بگەیەنێتێ، دەبوایە دیشەکان لەکار بێخێت.
ئەلێکس دەستێکی لە گووریسەکە هەڵگرت. ئەوەندەی نەمابوو هاوسەنگی خۆی لەدەست بدات، بەلاّم توانی ئەو میلە ئاسنە بگرێت کە لە دەورتادەوری سەکۆکە کێشرابوو. دوایی بە جووڵەیەکی خێرا خۆی لە سەکۆکە کێشایە سەرەوە. بەلاّم هاوسەنگی خۆی لەدەست دا و چۆکی بە توندی بە سیلەندری غاز کەوت و ژانێکی زۆری پێکەوت. ئەلێکس بیری لە ژانی جەستەی نەدەکردەوە. دەبوایە هەرچی زووتر کارێك بکات.
ئەلێکس سەیرێکی باڵۆنەکەی کرد.
دوو سیلەندری غاز کە مەوداکەیان نزیك بە مەترێك بوو، کاریان بە دەزگەیەکی گەرمکردنەوەی هەوا دەکرد. بۆرییە لاستیقییەکان، سیلەندرەکانیان بە دەزگەی گەرمکردنی هەوا دەبەستەوە. بیری لەوە کردەوە کە بە کردنەوەی ئەم بۆریانە پێش لە چوونی گەرما بۆ ناو باڵۆن دەگرێت. ئایا بەمکارە باڵۆن دەکەوتەخواریّ، یا لەژێر کاریگەری ئەو هەوا گەرمەی کە لەناوی دابوو، دیسان زیاتر بەرز دەبۆوە.
ئەلێکس سەیری سندووقەکانی سەر سەکۆی کرد. بێشك هەر سنددوقەی دیشێکی کۆنتڕۆڵ دەکرد. شەبەکەیەکی تێکەڵاو لە کێبڵەکان ئەوانی بەیەك دەبەستەوە. هەر سندووقەی چرایەکی چاوترۆکێنی هەبوو کە ئێستا رەنگیان زەرد بوو. سندووقێکی پێنجەمیش هەبوو کە کۆنتڕۆڵی سەرەکی بەدەستەوە بوو. ئەم سندووقە بەرزایی باڵۆن لە زەوی نیشان دەدا. هەفتا و حەوت.... هەفتا و هەشت.... هەفتا و نۆ. باڵۆن کەم کەم لە بەرزایی دیاریکرا و نزیك دەبۆوە.
دوایی ئەلێکس بە وەلاّمەکە گەیشت. دەبوایە دیشەکان لە چالاکی بێخێت و ئەمکارە دەبوایە بەرلەوەی بەرزایی باڵۆن بگاتە سەد مەتر، جێبەجێ

بکرێت. دەبوایە بەر لە گەیشتنی نیل ئەم کارە بکات. کاتێکی زۆری لەبەردەستدا نەبوو. بیری لەوە کردەوە ئەم گووریسەی کە نیل پێی دێتەسەر، بیبڕێت. بەڵام خێرا بەم ئەنجامە گەیشت کە بەمکارە دەبێتە هۆی کووشتنی مرۆڤێك. بەهەرحاڵ بڕینی گووریسیش کاتی پێویست بوو. ئەمجارە بیری لەوە کردەوە کە چوار سندووقەکە لەکار بێخێت.

بێ ئەوەی هاوسەنگییەکی باشی هەبێت، لەسەر پێیەکانی وەستا و هەنگاوێکی کوورتی نایەوە. سەکۆ لەژێر پێی ئەو نەختێك دەجووڵایەوە. لەناکاو هەستی بە ترسان کرد. ئایا سەکۆ بەجۆرێك داڕێژرابوو کە کێشی ئەو تەحەموول نەکات؟ ئەگەر بە خێرایی بڕوات، ئەگەری کەوتنەخواریشی هەبوو. سەیرێکی نیلی کرد، تەنیا بە خوولەکێکی دیکە دەیگەیشتێ.

بەڵام باڵۆن چەند مەتر لە زەوی بەرز ببۆوە؟

هەشتا و سێ.... هەشت و چوار....

دەبوایە پەلە بکات.

ئەلێکس چۆکی دادا و کێبڵێکی بەدەست گرت.

سەیری کێبڵەکەی کرد. کێبڵێکی ئەستوور بوو کە بە سەرپێچێکی بەهێز بە سندووقی سەرەکییەوە وەسڵ بوو. هەوڵی دا خێرا سەرپێچەکە بکاتەوە، بەلام ئەمکارە نەدەکرا. دەبوایە بیبڕێت، کە ئەمکارەش نەدەکرا. بە تەواوی هێزەوە کێبڵەکەی راکێشا، بەڵام کێبڵەکەی هیچ لێنەهات. کێبڵەکان زۆر بەهیز بوون و لە توانای ئەلێکسدا نەبوو.

ئەلێکس دانیشت و پێیەکانی بە سندووقەکەوەنا. باڵۆنەکە هێشتا سەردەکەوت. پارچە هەورێکی بچووك لە تەنیشتی تێپەڕی. رەنگە دووکەڵی تەقینەوەکانی خوارێش بووبێت. ئەلێکس ددانەکانی چیڕ کردەوە و بە تەواوی هێزەوە کێبڵەکەی راکێشا، ئەمجارە کێبڵەکە هاتەدەر..

ئەلێکس هەستی کرد کە کێبڵەکەی پچڕاندووە. بەڵام بەهۆی پاڵەپەستۆ بۆ دواوە ئەلێکس تەقڵەیەکی لەسەر سەکۆکە لێدا و سەری بە ئاسنەکەی دەوری سەکۆکە کەوت. بەم حاڵەوە بێ ئەوەی بیر لە ژانێ سەری بکاتەوە،

دووباره خۆی کۆنترۆڵ کردەوە. کێبڵەکە بەری دەستی بڕیبوو و سەریشی زۆر دەهێشا. بەڵام کە ئێستا سەیری کرد بینی گلۆپێکی چاوترۆکێن کووژاوەتەوە. دیشێکی لە کار خستبوو.
نەوەد و سێ..... نەوەد و چوار.....
سێ کێبڵی دیکە مابوو و ئەلێکس دەیزانی کە کاتی ئەوەی لەبەردەست دا نییە هەموو کێبڵەکان بپچڕێنێ.
بەمحاڵەشەوە، دووهەم کێبڵی بەشێوەی پێشەوە گرت و دووبارە پێی خستە سەر سندووق و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.
بەڵام لەمکاتەدا، شتێك لەبەرچاوی بریقەی دا. ئەلێکس بەپێی هەستی بەهێزی خۆی بۆ لایەك هاویشت. شەمشێری سامۆڕایی کە بەرزاییەکەی بەنیو مەتر دەگەیشت، بەشێوەیەك لەنزیك رووخساری تێپەڕی کە هەستی پێکرد. ئەلێکس دەیزانی کە شەمشێر بەئامانجی قوڕگی هاویشتراوە.
نیل گەیشتبووە سەکۆکە. ئەو لە تەنیشت سەکۆ وەستابوو و دەستی بە ئاسنەکە گرتبوو. ئەو دوو شمشێری بە پشتەوە بەستبوو و ئێستا نیل شەمشێری دووهەمی بەدەستەوە بوو. ئەلێکس لەسەر تەختاییەکە راکشابوو و هێزی هەستانە سەرپێی نەبوو. باڵۆن تەنیا چەند مەتری مابوو بگاتە بەرزایی دیاریکراو.
نەوەد و حەوت.... نەوەد و هەشت.... نەوەد و نۆ....
ئێستا دەنگێك لە سەندووقی کۆنترۆڵەوە بەگوێ گەیشت و سێ چرای سەر سندووقەکان رەنگیان سوور بوو. سیستەمەکە چالاك ببوو.

* * *

لەناو کەنیسەدا خاتوو رۆدمەن کەم کەم بەم ئەنجامە دەگەیشت کە ململانێیەکەی دۆڕاندووە. هێزەکانی زۆر بەباشی شەڕیان کردبوو. ژماریشیان لە پیاوانی ئێس ئای ئێس زیاتر بوو، بەڵام زۆریان لێ کووژرابوو. هەروەها دوو گرووپی دیکە لە ئێس ئێسەکان خۆیان گەیاندبووە شوێنی رووداوەکە.

ئەو شەڕی دەرەوەی کەنیسەی لەبەرچاو بوو. کامێرا شاراوەکان هەموو رووداوەکەی دەرەوەی کەنیسەی بۆسەر مۆنیتۆرەکان دەگواستەوە. پیاوانی ئێس ئای ئێس بریندارێکی هاوڕێیان لە ناو گەرمەی شەڕدا دەگواستەوە.

ئۆتۆمبێلەکانی پۆلیس لە هەرلایەکەوە دەگەیشتن، بۆخۆیان نەدەبینران، بەڵام دەنگی لووره و هۆڕنیان ئەم ناوەیان پڕ کردبوو.

تەقینەوەیەکی دیکە رووی دا. ئەمجارە نزیکتر بوو. دووکەڵێکی رەش لەسەر منارەوە هاتە ناو کەنیسەوە. زۆربەی وێنەکێشراوەکان کەوتنە خوارەوە. زۆربەی هێزەکانی دووپشک شوێنی خۆیان جێهێشتبوو. پیاوێکی دووپشک لەکاتێکدا خوێن رووخساری داپۆشیبوو، بۆلای خاتوو رۆدمەن رایکرد.

- هاتوونەتە ناو کەنێسەوە. ئیتر کارمان تەواوە. من لێرە دەڕۆم.

خاتوو رۆدمەن زۆر جددیانە بەسەریدا قیژاندی.

- تۆ لەسەر شوێنی خۆت دەمێنیتەوە!

پیاوە بریندارەکە بەهێواشی جنێوێکی دا.

- ئەوا هەموویان دەڕۆن.

خاتوو رۆدمەن نیگەران بوو کە بەتەنیا بمێنێتەوە.

- تکایە تفەنگەکەتم بدەیە.

- بەڵێ، فەرموو.

- زۆر سوپاس.

خاتوو رۆدمەن ئەمەی وت و گوللەیەکی لە سینگی پیاوەکە بەتاڵ کرد.

خاتوو رۆدمەن سەیری مۆنیتۆرەکانی کرد. پیاوانی ئێس ئای ئێس مەوادی تەقەمەنی پلاستیکیان لەسەر دیوارەکانی کەنیسە دادەنا. خاتوو رۆدمەن پێیوابوو بۆ تەقاندنەوەی دیوارەکان پێویستیان بە تەقەمەنییەکی زیاتر هەیە. ئەو بۆ خۆی نەخشەی دیواری داڕشتبوو و زۆر لەوە بەهێزتر بوو.

خاتوو رۆدمەن سەیری باڵۆنەکەی کرد. لەبەرزایی سەد مەتری ئەودا بوو. دەیزانی کە بە بەرزایی دیاریکراو گەیشتبوو. ئامێرەکانی ناو کەنیسە ئەم هەواڵەیان پێ دەدا. تا خوولەکێکی دیکە هەموو شت دەبوایە کۆتایی پێبێت. وەبیر ئەلێکس رایدەر کەوتەوە کە لەناو باڵۆنەکەدا بوو. بەم ئەنجامە گەیشت کە هێنانی ئەلێکس بۆ ئەم شوێنە هەڵە بوو. باشە ئەوی بۆچی هێنابوو؟ بێشک سەبارەت بەوەی مردنی ئەو ببینێت. مردنی باوکی، جۆن رایدەری نەبینیبوو، بەڵام دەیویست مردنی ئەلێکس ببینێ. بەڵام ئەمەشی دەزانی کە ئەندامەکانی دیکەی باندی دووپشک ئەم کارەی ئەویان بەلاوە خۆش نابێ.

ئێستا تەقینەوەیەکی زۆر بەهێز رووی دا. کەنیسە وەلەرزە کەوت. خاتوو رۆدمەن رەشاشەکەی هاویشتە خوارەوە و بۆلای دەرگایەك رای کرد کە شێوەیەکی نادیار و شاراوەی هەبوو. بەڵام پێشتر بیری لە هەمو شتێك کردبۆوە و دەیویست بێ ئەوەی ببینرێت، خۆی لە کێشەکە دەرباز بکات. ئەو نیگابانەی کە خاتوو رۆدمەن کووشتبووی، راستی وتبوو و ئێستا کاتی رۆیشتن بوو.

ئەلێکس لەسەر پشت راکشابوو. شانەکانی بە ئاسنەکەی دەوری سەکۆکەوەنا. یەکەم شەمشێر کە نیل هاویشتبووی، لەمەودای چەند سانتی مەتری سەری ئەلێکس لەسەر سەکۆکە کەوتبوو و هێشتاش هەر لەوێ بوو. نیل شەمشێری دووهەمی بەدەستەوە بوو. ئەلێکس دەیزانی کە پێویست بە پەلە ناکات. جێگەیەکی نەبوو کە خۆی تێدا بشارێتەوە. کەمتر لە سێ مەتر لێی دوور بوو. ئەلێکس توانایییەکانی نیلی بەچاوی خۆی بینیبوو. ئیتر نەیدەتوانی بەم شێوەیەی بیری لێکردووەتەوە کۆتایی بە چالاکی دووپشك بێنێت.

بەم حاڵەشەوە...

بۆچی ئاوا لەسەرەخۆ بوو؟ شەمشێرەکەی بەدەستێکەوە بوو و دەستی دیکەی بە شیشی سەکۆکەوە گرتبوو.

ئەلێکس سەیری کرد. بەدوای شتێکدا دەگەڕا.

ئەویشی نەدۆزییەوە.

ئەم جۆرە نیگایەی پێشتریش بینیبوو. وەبیر وۆلف۱، سەربازی ئێس ئای ئێس کەوتەوە کە پێشتر دەورەی لەگەڵ بینیبوو. ئێستا لەناکاو هەموو شت مانای پەیدا کرد. هەمان خاڵە لاوازە بوو کە خاتوو رۆدمەن ئاماژەی پێکردبوو. هەمان هۆکار کە نیل لە فێرگەی مالاگوستو پلەی دووهەمی بەدەست هێنابوو. وەبیر ئەو شەوە کەوتەوە کە لە سەر بوورجی دێر نیلی بینیبوو. لەوێش نیل خۆی بە دەرگاوە وەنووساندبوو و حەزی نەدەکرد هەنگاوێك بێتە پێشەوە. ئێستاش زۆر بە توندی ئاسنەکەی دەوری سەکۆی گرتبوو. بێ هۆ نەبوو لە هاتنەسەری بۆ سەر سەکۆکە ئەوەندەی پێچوبوو.

نیل لە بەرزایی دەترسا.

بەڵام ئەمە ئەلێکسی رزگار نەدەکرد. پازدە چرکە لە سووربوونی گڵۆپەکانی سەر سندووقەکان تێپەڕیبوو. حەتمەن نانوشلەکان لەناو دڵیدا خەریکی کووشتنی بوون. لە سەرتاسەری لەندەن منداڵەکان دەکوژران.

ئێستا نیل دەستی بە قسەکردن کرد.

- پێم وتی کە ئەگەر خیانەتمان پێ بکەی، دەتکووژم.

رەنگە پێکەنینەکەی سەر رووخساری بە ئەنقەست یا بە زۆری بوو. بەڵام لەو کارەی کە دەیویست بیکات، هیچ شك و گومانی تێدا نەبوو. شەمشێرەکەی ئامادەی هاویشتن کرد.

- وتم کە دەتکووژم و ئێستاش ئەم کارە دەکەم.

- بەڵێ، بێشك ئەم کارەی دەکەی، نیل. بەڵام چۆن بۆ خوارەوە دەگەڕێیتەوە؟

- چی؟

پێکەنین لەسەر لێوەکانی نەما.

ئەلێکس بەردەوام بوو:

- سەیری خوارەوە بکە. سەیر بکە ئێمە لە کوێین.

- بێدەنگ بە!

ئەو دەستەی کە ئاسنەکەی دەوری سەکۆی گرتبوو، سپیتر ببوو. ئەلێکس بینی کە پەنجەکانی لەسەر ئاسنەکە توند و توندتر دەبن.

– سەیری خەڵکی بکە. ئۆتۆمبێلەکان ببینە. ببینە کە تا چ رادەیەك بچووکن.

– بەسە!

ئێستا ئەلێکس هەوڵی خۆی دەست پێکرد. ئەو دەیزانی چی دەکات. نیل هێزی دەستکردنەوەی لەدەست دابوو. هەموو خێرایی و هێزەکەی بە کۆتایی گەیشتبوو. ئەلێکس بە جووڵەیەك شەمشێری یەکەمی دەست دایە و دوایی بە توندی و بە خێرایی و بە هەموو هێزەوە لە بۆرییە لاستیکییەکەی ئامێری گەرمکردنەوەی هەوای دا.

دوایی هەموو شت بە خێرایی رووی دا.

بۆرییەکە پچڕا. وەکوو مارێکی بریندار بۆلای راست و چەپ خوار دەبۆوە و خۆی لوول دەدا و دەهات و دەچوو. هێشتا لەسەری بۆرییەکە غاز دەهاتە دەرێ. کاتێك بۆرییەکە لە تەنیشت ئامێری گەرمکردنەوەی هەوا تێپەڕی، گری گرت. لەناکاو بوو بە ئاگرێکی زۆر گەورە و دوایی بە جووڵەیەکی توند لەکاتێکدا کۆنترۆڵ نەدەکرا، بە توندی بە سینگی نیل کەوت.

نیل تازە توانیبووی شەمشێرەکەی بەرز بکاتەوە و بیهاوێت. ئەو نیشانەی لە سینگی ئەلێکس گرتبوو. بەڵام گلۆڵەی ئاگر ئەمانی پێ نەدا. هاوارێکی کرد و لەناکاو ون بوو. نیل وەکوو پارچە قوماشێك ئاگراوی لە مەودای سەد مەتری بەرەو زەوی باڵی گرتبوو.

واپێدەچوو ئەلێکسیش دەیویست رێگەی نیل بگرێتەبەر.

تەواوی سەکۆکە لە ئاگردا دەسووتا. غازی ئاگراوی لە هەموو شوێندا بڵاو ببۆوە و دەگەیشتە هەر شتێك، ئەوا لەناو خۆیدا دەیتواندەوە. لەکاتێکدا گڕەکان لە ئەلێکس نزیك دەبوونەوە، ئەو بە جووڵەیەك لەسەر پێیەکی خۆی وەستا. دەبوایە چی بکات؟ ئامێری گەرمکردنی هەوا کووژابۆوە، بەڵام واپێنەدەچوو باڵۆنەکە خۆی لە زەوی نزیك بکاتەوە.

سەکۆکە تا ماوەیەکی کەمی دیکە دەکەوێتە خوارەوە. ئەم گووریسانەی کە سەکۆیان لە باڵۆنەکە بەستبوو، نایلۆنی بوون و هەر چوار گووریس لەئاگردا دەسووتان. گووریسێك پچڕا و سەکۆکە بۆلایەك خوار بۆوە. ئەلێکس کەوتە سەر تەختاییەکەی سەکۆکە. کێبڵەکان دژە ئاگر بوون. گلۆپە بچووکەکان هێشتا سوور بوون و واپێدەچوو خەریکی گواستنەوەی خۆیانن. لەکاتی هاتنی نیل بۆسەر سەکۆکە خوولەکێك تێدەپەڕی. ئەلێکس بەدەست پاڵی بە پەراسووەکانی وەنا. چاوەڕێی ئەوە بوو ژەهر لە لەناو جەستەیدا چالاك بێت و خوێنی ژەهراوی بکات و بیکووژێت.
بەڵام ئەو هێشتا نەمردبوو و دەیزانی کە چەند چرکە زیاتر بۆ راکردن لەسەر سەکۆکە لەبەردەستدا نییە. ئەگەری خۆهەڵدان و رزگارکردنی گیانی لەئارادا نەبوو. مەودای لەگەڵ زەوی سەد مەتر بوو. ئێستا گووریسی دووهەمیش بە دەنگێکی بەرز پچڕا. ئاگرەکە لە کۆنترۆڵ کردن چووبووە دەرێ. لەناو گڕی ئاگردا لەناو دەچوو. هەموو شتێکی دەسووتاند.
ئەلێکس خۆی هەڵدا.
نە بۆ خوارێ، بەڵکوو بۆ سەرەوە. ئەلێکس بە زەحمەتێکی زۆر خۆی گەیاندە ناو باڵۆنەکە. ئێستا دوایین گووریس کە سەکۆی بە باڵۆنەوە وەسڵ دەکرد، سووتا و گووریسەکە پچڕا. سەکۆ کەوتەخوارێ و لەگەڵ خۆی ئامێری گەرمکردنی هەوا و دیشەکانی بۆ خوارەوە برد. ئەلێکس دەستەکانی بە پەتە نایلۆنییەکانی باڵۆنەوە گرتبوو. ئایا باڵۆن دەکەوتەخوارێ؟ بەڵام کێشی سەرەکی بەستراو بەباڵۆنکە لێی جیا ببۆوە. باڵۆن لەو شوێنە مایەوە کە لێیبوو.
ئەلێکس سەیرێکی خوارەوەی کرد و لەناو گڕ و دووکەڵی ئاگردا بینی کە سێ گلۆپەکەش کووژاونەتەوە. لەمبارەوە دوودڵ نەبوو کە یا گڕی ئاگر کاری خۆیان کردبوو و یا دیشەکان رێك بەرلەوەی بکەونە خوارەوە، چالاکی خۆیان راگرتبوو. ئێستا تەنانەت منالێکیش گیانی خۆی لەدەست نەدەدا.

کەس نەیدەزانی ئەم ژنە بە کۆڵەبارێکەوە لە کوێ هاتەدەرێ. ڕەنگە لە قەبرستانی پشت کەنیسەی لەبیرکراو خەوتبوو. بەڵام ئێستا هەنگاوی نایە ناو شوێنێك کە تا چەند خولەك لەمەوپێش گۆڕپانی شەڕ و کووشت وکووشتار بوو.

ئەو شانسی هێنابوو. پۆلیسەکانی ئێس ئای ئێس کۆنترۆڵی کەنیسەیان بەدەستەوە گرتبوو. زۆربەی هێزەکانی باندی دووپشك کووژرابوون و ئەوانیتریش چەکەکانیان دانابوو و خۆیان بەدەستەوە دابوو. تەقینەوەیەکی دیکە دەرگای کەنیسەی بە تەواوی لەناو برد. ئێستا سەربازەکان لە هەموو شوێن بەدوای ئەلێکسدا دەگەڕان.

ژنی ماڵ لەسەرکۆڵ ئەم هەموو هەرا و هوریایەی بەلاوە سەیر بوو. پرچی خۆڵەمێشی گرێدراوی کەوتبووە سەر شانی. کۆتێکی کۆن و دڕاوی پۆشیبوو و بە پەتێك لەناوقەدی بەستبوو. بە دەستێك دوو کیسە زبڵی پێبوو. واپێدەچوو ئەمە گەنجینەکانی بوون کە لەماڵی دونیادا هەیبوون.

سەربازێك پیرێژنەکەی بینی و بەسەریدا قیژاندی:

- لێرە بڕۆ دەرێ! مەترسیدارە!

- زۆر باشە، ئازیزم. ئەمە چ باسە؟ ناکا شەڕی سێهەمی جیهانی دەستی پێکردبێ.

لەژێر ئەم پرچەدەستکردە و ئارایش و جلە کۆنانە، خاتوو رۆدمەن بزەیەکی هاتێ. باوەڕی بەوە نەدەکرد ئەم پۆلیسە گێلانەی ئێس ئای ئێس ڕێگەی پێبدەن لەوێ دوور بکەوێتەوە. ئەو لەژێر کۆتەکەیدا ڕشاشێکی پێبوو و هەرکەسێ رایگرتبا، ئەوا دژ بەئەو کەڵکی لێوەردەگرت. بەڵام پیاوانی ئێس ئای ئێس بەجۆرێك خەریکی هاتنەناو کەنیسەوە بوون کە بەهیچ شێوەیەك ئەویان نەناسییەوە.

تا ئەوەیکە سەربازێك هاواری کرد:

- بوەستە!

ئەویان بینیبوو، خاتوو رۆدمەن خێرایی هەنگاوەکانی زیاتر کرد.

بەڵام سەربازەکە نەیدەویست دەستبەسەری بکات. دەیویست لە مەترسی ئەم شوێنە ئاگاداری بکاتەوە. لەناکاو سێبەرێك کەوتە سەر رووخساری. سەری بەرز کرد. شتێك لە ئاسمانەوە بەرەو زەوی دەکەوتە خوارەوە. جولیا رۆدمەن دەمی کردەوە تا بقیژێنێ، بەڵام دەنگەکە مەجالی ئەوەی پەیدا نەکرد بۆئەوەی بە گوێی کەسێ بگات. ئەم شتەی لە ئاسمانەوە دەکەوتە خوارێ، کەوتە سەر خاتوو رۆدمەن و بە تەختایی زەوییەوە پانی کردەوە. زیاتر وەکوو وێنەکانی کارتۆنی دەچوو. پۆلیسەکەی ئیس ئای ئێس کە پێشتر هاواری کردبوو، بە ترسەوە سەیری شتێکی قەبارە گەورەی کرد کە لەحاڵی سووتاندا بوو. دوایی سەری بەرز کردەوە تا بزانێ ئەمە لە کوێی ئاسمانەوە هاتووە، بەڵام ئاسمان پاك و ساف و بێ گەرد بوو.

ئێستا بە کەوتنەخواری سەکۆ و ئازادبوونی گوریسەکانی باڵۆنەکە لە کاتێکدا ئەلێکس هێشتا لە ژێرەوە خۆی هەڵواسیبوو، بۆلای باکوور بەڕێوەبوو. ئەلێکس ماندوو و شەکەت بوو. پێ و سینگی دەسووتان. بەم رادەیە لە هەوڵدا بوو کە خۆی بە باڵۆنەوە رابگرێت.

بەڵام هەوای ناو باڵۆن سارد ببوو و بۆلای زەوی بەڕێوەبوو. ئەلێکس شانسی هێنابوو کە بەدەنەی باڵۆن نەدەسووتا.

هەڵبەت هێشتا ئەگەری کووژرانی ئەلێکس هەبوو. ئەو هیچ کۆنترۆڵێکی بەسەر باڵۆنەکەدا نەبوو و با دەیتوانی بە وایەری ناو شەقامەکانی دادات. ئەو لە رووبار تێپەڕیبوو و دەیتوانی گۆڕەپانی ترافالگار ببینێ.

ئەلێکس دەبوایە بە هەڵواسراوی بمابایەوە تا کۆتایی بەم رکابەرییە لە گەڵ مردن دەهات. لەگەڵ ئەم ژانەی کە لەناو شان و قۆڵەکانی هەستی پێدەکرد، لەناخەوە هەستی بە ئارامی و هێوری و حەسانەوە دەکرد. دوای هەموو ئەم کێشە و گرفتانە، تا ئێستا بە زیندوویی مابۆوە. نیل مردبوو. خاتوو رۆدمەن رەنگە قۆڵبەست کرابێت و ئیتر نانوشلەکان هەڕەشە بۆ مردن نەبوون.

بەڵام ئەو چی بەسەر دەهاتەوە؟ بایەکە ڕێگەی خۆی گۆڕیبوو. ئێستا ئەو بۆلای ڕۆژئاوا بەڕێوەبوو. بە گرێین پارك(١٨٧) گەیشتبوو. ئێستا مەودای ئەو تا زەوی پەنجا مەترێك دەبوو. خەڵکی دەدیت کە ئیشارەی پێدەکەن و هاواریان دەکرد.

ئەلێکس هێشتا بە باڵۆنەوە وەنووسابوو. ئەگەر نەختێك شانسی هەبوایە، دەگەیشتە چێلسی و ماڵی خۆی، ئەو جێگەیەی کە جەك ستاربرایت چاوەڕوانی بوو. تا ئەوێ مەودای چەندە بوو؟ ئایا باڵۆنەکە ئەو توانایەی هەبوو کە ئەلێکس بۆ ئەوەی ببات؟

ئومێدەوار بەوە بوو. تەنیا حەزی لەوە بوو کە بۆ ماڵەکەی خۆی بگەڕێتەوە.

187 -Green park

## سەرپۆشێکی گەورە

لە کۆتاییدا نۆرە گەیشتە ژووری ئالان بلێنت لە شەقامی لیڤەرپول.
ئەویان بۆماوەی هەفتەیەك بەتەنیا جێهێشتبوو و دوایی رۆژی هەینی دوانیوەڕۆکەی بە تەلەفۆن تکایان لێکردبوو کە بۆ دیتنی ئالان بلێنت بچێت. تکایان لێکردبوو، نەئەوەیکە پێی بڵێن. لانیکەم ئەمە گۆڕانکاری و جیاوازییەکی گرنگ بوو. بۆ ئەم دیدارەش رۆژی شەممەیان هەڵبژاردبوو بۆئەوەی ناچار نەبێ لە وانەکانی بەجێبمێنێ.
باڵۆن ئەوی بردە هاید[188] پارك و وەکوو گەڵای پاییزی خستبوویە سەر چیمەنی پارکەکە. کۆتایی رۆژ بوو و لەم کاتەی رۆژدا خەڵکێکی زۆر لە پارکدا نەبوون. ئەلێکس توانیبووی بەئارامی و پێش ئەوەی ئۆتۆمبێلەکانی پۆلیس بە ورەوڕ بگەنێ، ئەوێ جێبهێڵێت. هاید پارك تا ماڵی خۆیان بە پێیان رێگەی ٢٠ خولەك بوو. جەك لەماڵەوە چاوەڕوانی بوو. خواردنی شەوی خوارد و حەمامێکی کرد و بەپەلە خۆی گەیاندە ناو تەختی خەوتن.
ئەلێکس بە جددی زامدار نەبوو. چەند داڕوشەکان و نەختێك سووتان لەسەر پێ و سینگی دیار بوو. جمگەی دەستیشی ئەستوور ببوو، کە

---

[188] -Hyde park

سەبارەت بە خۆهەڵواسینی باڵۆنەوە بوو. خاتوو رۆدمەنیش زلەیەکی لێدابوو کە ئێستاش جێگەی پەنجەکانی بە روومەتیەوە دیار بوو.
پێنج رۆژ بوو کە بۆ قووتابخانەی بروکلەند گەڕابۆوە. مامۆستا گێری یەکەم کەس بوو کە لەناو حەوشەی قووتابخانە ئەلێکسی دیتبوو. سەرێکی راوەشاندبوو، بەڵام هیچی نەوتبوو. بەڵام لەوە دڵگیر بوو کە ئەلێکس لە گەشتەکەی قووتابخانەدا لەناکاو نادیار ببوو. ئەلێکس حەزی دەکرد باسی هەموو شتێکی بۆ بکات، بەڵام هیچی نەوت. لەم ناوەدا، تام هریس، هاوڕێی ئەلێکس لە هەموویان خۆشحاڵتر بوو.
- دەمزانی کە بەساغ و سەلامەتی دەگەڕێیتەوە. کاتێك ئەمڕۆژە بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ کردی، ورەت زۆر باش نەبوو. هەمان کات بوو کە لە رێکخراوی بەرهەمهێنانی دەرمان تەقینەوە رووی دابوو. بەڵام لانیکەم خۆشحاڵ بووم کە زیندووی. دوای چەند رۆژ، جەری پارەیەکی زۆری بە چەکێك سەبارەت بە لەناوچوونی پەرەشووتەکەی وەرگرت. پێنج بەرامبەر نرخی کڕینەکەی. ئێستا لەسایەی سەری تۆوە چووەتە نیوزلەند[189] بۆئەوەی لە ئۆکلان[190] لە بینایەکی بەرز هەڵدانی ئازاد بکات. هەمیشە حەزی لەوە بوو ئەم کارە بکات. تام رۆژنامەیەکی لەناو جانتاکەی دەرهێنا.
- ئەمە تۆ بووی؟
ئەلێکس سەیری رۆژنامەکەی کرد. وێنەیەك لە باڵۆن بوو کە بە ئاسمانی لەندەندا دەفڕی. وێنەکە نیشانی دەدا کەسێك بە دەست خۆی لە باڵۆنەکە

---

189 - New Zealand
190 - Auckllan

هەڵواسیوە. بەڵام بەخۆشییەوە بەهۆی ئەوەی وێنەکە لە ڕێگەی دوورەوە گیرابوو، رووخساری ئەلێکس دیار نەبوو.
کەس نەیدەزانی لەناو کەنیسە پیرۆزە لەبیرکراوەکە چی رووی داوە و کەسیش نەیدەزانی ئەلێکس لەناو رووداوەکەدا دەستی هەبووە.
ئەلێکس بە ئیشارە قسەی تامی قبووڵ کرد.
– بەڵێ. بەڵام تام، لەمبارەیەوە نابێ قسە لەگەڵ کەس بکەی.
– بەڵام من بە جێریم وتووە.
– بەڵام بە کەسی دیکە مەڵێ.
– بەڵێ، دزانم. باری ئاسایش و پاراستن.
دوایی برۆی تێکنا.
– رەنگە وا باشتر بێت منیش بێمە ناو (ئێم ئای٦). بێشك پۆلیسێکی نهێنی گەورە دەبم.
ئەلێکس لەکاتێکدا رووبەڕووی ئالان بلێنت و خاتوو جۆنز دانیشتبوو، وەبیر قسەکانی تام کەوتەوە. جەك رەزامەندی لەسەر ئەوە نەبوو ئەلێکس بۆئێرە بێت.
– هەر کە زانیان دەتوانی بەڕێدا بڕۆی، بۆ کۆریای باکوورت دەنێرن. بۆ چرکەیەکیش دەست لەتۆ هەڵناگرن، ئەلێکس. تەنانەت نامهەوێ ئەوە بزانم دوای ڤێنیز چی بەسەرت هاتووە. بەڵام بەڵێنیم پێبدە کە ئیتر تووشی رووداوی ئەمجۆرە نەبیتەوە.
ئەلێکس ئەم قسەیەی بەدڵ بوو. حەزی دەکرد لەماڵێ بێت، بەڵام دەیزانی کە پێویستە سەردانی بەڕێز بلێنت بکات. بەهەر حاڵ، دوای ئەم رووداوەی کە لە ماڵی خاتوو جۆنز هاتبووەپێش، هەستی دەکرد پێیان قەرزدارە.

ئالان بلێنت وتی:

– لە دیتنت زۆر خۆشحاڵم، ئەلێکس. جارێکی دیکە کارێکی زۆر گەورەت کرد.

ئەمە گەورەترین ستایش بوو کە ئالان بلێنت پێی شك دەهات.

بەڕێز بلێنت بەردەوام بوو و وتی:

– دەبێ هەواڵەکانت پێ بدەم. بێشك دەزانی کە دووپشك بە تەواوی لە پلانەکەیدا شکستی خوارد و پێموانییە جارێکی دیکە غیرەتی ئەوەی هەبێت کارێك بەم گەورەییە بکات. ئەوان کەسایەتییەکی زۆر گرنگیان لەدەست داوە. ناوی نیل بوو. ئەو لە کەوتنەخوار لە باڵۆن کووژرا. ڕاستی ئەمە چۆن ڕووی دا؟

ئەلێکس وەڵامێکی کورتی بەم پرسیارە دا.

– هەڵخلیسکا.

– ڕەنگە حەز بکەی هەواڵی مردنی خاتوو ڕۆدمەنیشت بدەمێ.

هەواڵێکی تازە بۆ ئەلێکس بوو. ئەلێکس وایدەزانی رایکردووە.

– ئەم سەکۆیەی کە لە باڵۆنەکە کەوتەخوارێ، ڕێك کەوتە سەری و پانی کردەوە.

بلێنت ئاخێکی بڵندی هەڵکێشا:

– بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە منداڵەکانی لەندەن نامرن. هەر ئەمجۆرەی کە دکتۆر ستینفسۆن شی کردەوە، نانوشلەکان بە تێپەڕبوونی زەمەن لە جەستەی منداڵەکان دەچێتەدەر. دیشەکان نزیك بە خوولەکێك ئەشەعەیان نارد. بەڕاستی تەنیا چەند چرکەمان بۆ کارەساتێکی گەورە مابوو.

ئەلێکس وتی:

– ئەمجارە هەوڵ دەدەم خێراتر بەرێکەوم.

– بەڵێ، بەڵام مەسەلەیەکی دیکە. رەنگە بەلاتەوە سەیر بێت کە مارک کێلنر ئەمڕۆ وازی لە پۆستەکەی هێنا، ئەو بەڕێوەبەری پەیوەندییەکانی سەرۆك وەزیران بوو. ناوەکەیت لەبیرە؟ ئەو بە دەزگا راگەیاندنەکانی وتووە کە دەیهەوێ کاتێکی زیاتر لەگەڵ بنەماڵەکەی بێت. سەیر ئەوە دایە کە بنەماڵەکەی توانایی تەحەموول کردنی ئەویان نییە. هیچکەس، ناتوانێ لەگەڵی بسازێت. کەس بیری لە باڵۆنی بە هەوای گەرم نەدەکردەوە. بەڵام دەبێ کەسێك تاوانەکەی ئەم کەمکاریانە بداتەوە. زۆر خۆشحاڵم کە ئەو تاوانەکەی دایەوە.

– باش، ئەگەر قسەکانی تۆ ئەمانە بوون، واباشترە بۆ ماڵەوە بگەڕێمەوە. لە خوێندن و وانەکانم وەپاش کەوتووم و دەبێ خۆم بگەیەنمەوە

– نا، ئەلێکس. دەبێ کەمێکیتر دانیشی.

خاتوو جۆنز لە هەمووکات زیاتر جددی بوو. ئەلێکس هەستی بەوە کرد کە دەبێ سەبارەت بە تاوانەکەی ماڵی خاتوو جۆنز سزا بدرێت

– خاتوو جۆنز، لەوکارەی کە کردم، زۆر بەداخم. بەڵام وابزانم کەم یا زۆر تاوانەکەیم داوەتەوە.

– نا، ئەمە ئەو شتە نییە کە دەمهەوێ لەبارەیدا قسەت لەگەڵ بکەم. تا ئەو جێگەیەی من دەیزانم، تۆ هیچکات بۆ ماڵی من نەهاتووی. بەڵام شتێکی گرنگتر هەیە کە دەبێ پێتی بڵێم. من و تۆ هیچکات لەبارەی ئالبێرت بریج قسەمان بەیەکەوە نەکردووە.

– بەڵام من حەز ناکەم لەبارەیدا بدوێم.

– بۆچی نا؟

- چونکە دەزانم کە کارەکەتان دروست بوو. من ئێستا لە نزیکەوە دووپشکم بینیوە. دەزانم چ جۆرە کەسانێکن. ئەگەر باوکم پیاوی ئەوان بووە، ئەو کارە دروست بووە کە لەگەڵتان کردووە. حەقی ئەوەی بووە بمرێت.

قورگی ئەلێکس پڕ لە گریان بوو.

- ئەلێکس، کەسێك هەیە کە حەز دەکەم ببیینی. ئەو ئەمڕۆ بۆ ئێرە هاتووە و لەدەرەوە چاوەڕێیە. دەزانم کە ناتهەوێ زیاتر کاتی خۆت لێرە بەفیڕۆ بدەی. بەڵام تکایە رێگە بدە ئەو قسەت لەگەڵ بکات. زیاتر لە چەند خوولەك کاتت ناگرێت.

ئەلێکس شانەکانی هەڵاویشت.

- زۆر باشە.

نەیدەزانی خاتوو جۆنز دەیهەوێ چ شتێك بسەلمێنێت. حەزیشی لەوە نەبوو بچێتەوە ناو بارودۆخی مردنی باوکی.

دەرگا کرایەوە و پیاوێکی باڵابەرز هاتەژوور. ریشی بە رووخساریەوە بوو. پرچە رەشەکانی کەم کەم سپی دەبوون. کۆتی چەرمی و پانتۆڵی جینی لەبەر بوو. واپێدەچوو کە سەرەتای تەمەنی سی ساڵی تێپەڕێنێت. رووخساری بەشێوەیەك ئاشنا دەهاتەبەرچاو.

- ئەلێکس رایدەر؟

دەنگی خۆش بوو.

- بەڵێ.

- ئەحواڵت چۆنە؟

ئەمەی وەت و دەستی بۆلای ئەلێکس درێژ کرد. ئەلێکس دەستی رێککوشی. حاڵەتێکی دۆستانەی هەبوو.

– ناوم جێمز ئەدێر[191]ە. وابزانم باوکی منت بینیوە، سێر گراهام ئەدێر.
ئەلێکس زۆر بەباشی ئەوی لەبیر بوو. ئەو راوێژکاری هەمیشەیی کابینە بوو. بەڵام ئەو ناوی جێمز ئەدێری لە شوێنێکی دیکەش بیستبوو. ئەوی لە شوێنێکی دیکەش بینیبوو. بەڵێ، لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن. لەسەر ئالبێرت بریج؟

خاتوو جۆنز شی کردەوە.

– جێمز ئەدێر مامۆستای پەیمانگای ئمپریال[192]ی لەندەنە. بەڵام چواردە ساڵی پێش ئەو قووتابی بوو. باوکیٚ فەرمانبەرێکی پلەبەرزی حکوومی بوو–

ئەلێکس قسەکانی خاتوو جۆنزی بڕی.

– ئێوەیان دزیبوو. ئێوە لەلایەن دووپشکەوە دزرابوون.

– بەڵیٚ، وایە. دەتوانین دانیشین؟

جێمز ئەدێر لەسەر کوورسی دانیشت. ئەو لەوکاتەی باوکی کووژرا لەسەر پردەکە بوو. بەجۆرێك باوکی سەبارەت بەئەو کووژرابوو. بۆچی خاتوو جۆنز ئەوی بۆئێرە هێناوە.

– من رووداوەکەم دەگێڕمەوە و لێرە دەڕۆم. کاتێك هەژدە ساڵە بووم، منیان دزی بۆئەوەی باوکم کاری نابەجیٚ و ناڕەوایان بۆبکات. باندێکی تاوانکاری بەناوی دووپشك ئەم کارەی کرد. ئەوان وتبوویان ئەگەر باوکم بە قسەی ئەوان نەکات، ئەشکەنجەم دەکەن و دوایی دەمکووژن. دووپشك

191 -James Adair
192 - Imperial

هەڵەی دەکرد. باوکم نەیدەتوانی گۆڕانکاری لە سیاسەتەکانی حکوومەتدا پێکبێنێت. لەم رووەوە، دووپشك پێی وتم کە دەبێ ئامادەی مردن بم.

– ئیتر لە دوایین کاتدا، گۆڕانکارییەك لە بەرنامەکەیاندا پێکهات. ژنێك بەناوی جولیا رۆدمەنم بینی. ژنێکی جوان بوو، بەڵام تا بڵێی عیفریتە و ناجسن بوو.

ئەو وتی کە بڕیارە لەگەڵ کەسێکی خۆیان بمگۆڕنەوە. ئەو لەلایەن (ئێم ئای٦)ەوە گیرابوو. ئەم گۆڕینەوەیە دەبوایە لەسەر ئالبێرت بریج بەڕێوەبچێت.

بەیانییەکی زۆر زوو منیان بۆ ئەوێ برد. دەبێ ئەوە بڵێم کە زۆر ترسابووم. باش دەمزانی کە فریودانێك لەئارادایە. وام بیر دەکردەوە کە بە گوللە بمکوژن و بمهاوێنە ناو رووباری تیمز\ەوە. بەڵام پێدەچوو هیچ کێشەیەك لەئارادا نەبێ. وەکوو فیلمێکی تاوانکاری دەچوو. لە لایەکی پردەکە سێ پیاو لەگەڵ من وەستابوون. هەموویان چەکدار بوون. لە لایەکەی دیکەی پردەکە دەمتوانی رووخساریێ ببینم. ئەو باوکت بوو. چەند کەس لە پۆلیسانی (ئێم ئای٦) دەورەیان دابوو.

دوایی سەیری خاتوو جۆنزی کرد.

– ئەم خاتوونە یەکێ لەوان بوو.

خاتوو جۆنز وتی.

– یەکەمین بەرنامەی چالاکیی من بوو.

ئەلێکس وتی:

– بەدرەوام بە.

- كەسێك عەلامەتێكی دا و ئێمە دوو كەس بەڕێكەوتین. واپێدەچوو لە دوئیلێكدا[193] بەشداری بكەین. هەڵبەت بەم جیاوازییە كە دەستەكانمان بەسترابوون. دەبێ ئەوە بڵێم كە هەستم دەكرد درێژایی پردەكە نزیك بە مایلێكە. هەستم دەكرد هەرچی هەنگاو دەنێمەوە، بەڵام بە هیچكوێیەك ناگەم.

بەڵام ئێمە دوو كەس لەناوەڕاستی پردەكە بەیەك گەیشتین. من بەشێوەیەك مەمنوونی ئەوەم، چونكە لەسایەی سەری ئەو بوو نەدەكووژرام. بەڵام دەشمزانی كە بۆ دووپشك كار دەكات، لەم روویەوە وام هەست كرد كە ئەویش لە مرۆڤە خراپەكانە.

- دوایی ئەو قسەی لەگەڵ من كرد.

٢- دوو كەس دەمانچە بەدەست رووبەڕووی یەكتر و لە كاتێكدا تەقە لە یەك دەكەن. ئەوەی زیرەكتر بێت ئەوا ئەویتر دەكووژێت.

ئەلێكس هەناسەی لە سینگیدا راگرت. وەبیر كاسێتی ڤیدیۆ كەوتەوە كە خاتوو رۆدمەن نیشانی دابوو. تا ئێرە هیچ كێشەیەك نەبوو. باوكی لەگەڵ مێرمنداڵێك دوابوو. ئەو نەیتوانیبوو گوێی لە هیچ دەنگێك بێت و نەشیدەزانی ئەوان چی بە یەكتر دەڵێن.

جێمز ئەدێر بەردەوام بوو.

- ئەو زۆر ئارام بوو. هیوادارم لە قسەكانی من دڵگران و ناڕەحەت نەبی، ئەلێكس. ئێستا كە سەیری تۆ دەكەم، رووخساری باوكت لەتۆدا دەبینم.

ئەو بەتەواوی بەسەرخۆیدا زاڵ بوو. ئەو پێی وتم:

- *بڕیارە تەقە بكرێ. دەبێ خێرا بڕۆی.*

---

193 -Thames

- *چی؟ مەبەستت چییە؟*
- *کاتێك تەقە دەستی پێکرد، سەیری دەورووبەری خۆت مەکە، زۆر بەخێرایی رابکە. هیچ کێشەیەکت بۆ نایەتەپێش.*

بێدەنگییەکی دوورودرێژ ژوورەکەی داگرت.

ئەلێکس پرسی:

- ئایا باوکم دەیزانی کە بڕیارە تەقەی لێبکرێ؟
- بەڵێ.
- بەڵام چۆن؟
- رێگەم بدە با قسەکانم تەواو بکەم.

جێمز ئەدێر دەستی بە ردێنی خۆی داهێنا.

- دە هەنگاوم نابۆوە کە گوێم لە دەنگی گوللەیەك بوو. باوکت ئاگاداری کردبوومەوە کە نابی سەیری پشتەوەی خۆم بکەم. بەڵام سەبرم کرد، تەنیا چاولێکردنێکی کەم. باوکت لە پشتەوە گوللەی پێکەوتبوو. لەسەر کۆتەکەی خوێنی پێوەدیار بوو. دوایی وەبیر قسەکانی ئەو کەوتمەوە و دەستم بە راکردن کرد. دەبوایە خۆم لە کووشتن رزگار بکەم.

ئەلێکس رایدەر ئەمەی لەناو فیلمەکەشدا بینیبوو. ئەو بینیبووی کە جێمز ئەدێر بە خێراییەکی زۆر رایکردبوو. بەڵام ئەو باش دەیزانی کە چی دەکات.

سەبارەت بەوەیکە هۆشداری پێداربوو.

لە لایەن جۆن رایدەرەوە.

ئەو بەردەوام بوو:

- لەسەر پردەکە بەرێکەوتم. دوایی پیاوانی دوویشك دەستیان بە تەقە کرد. هەڵبەت مەبەستیان ئەوە بوو من بکووژن، بەڵام پۆلیسەکانی (ئێم

ئای٦) بە ڕەشاش دەستیان بە تەقە کرد و وەڵامی تەقەی ئەوانیان دایەوە. دەبێ بڵێم کە موعجیزە بوو کە من گوللەم پێنەکەوت. توانیم خۆم بە بەشی باکووریی پردەکە بگەیەنم. لەوێ لەناکاو ئۆتۆمبێلێکی گەورە گەیشتێ. دەرگاکەی کرایەوە و منیش خۆم هاویشتە ناوی. تا ئەوجێگەیەی کە پەیوەندی بە منەوە هەیە، ڕووداوەکە کۆتایی هات. منیان لەم شوێنە دوورخستەوە و دوای چەند خوولەك باوکمم بینی. ئەو وای لێکدابۆوە کە ئیتر من نابینێت.

قسەکانی مەنتیقی دەهاتنەبەرچاو. کاتێك ئەلێکس سێر گراهام ئەدێری بینیبوو، ئەو لەڕادەبەدەر هاوڕێیانە دەهاتەبەرچاو. ئەو دەیویست هەرجۆرێك بێ، ئەوە نیشان بدات کە لەڕووی مەعنەوییەوە پێی قەرزدارە.

ئەلێکس وتی:

– کەواتە باوکم سەبارەت بەتۆ لەخۆبردەیی نیشان دا.

بۆ ئەلێکس پرسیارێك لەئارادا بوو. باوکی بۆ دوویشك کاری دەکرد، بۆچی ئامادە بوو سەبارەت بە کەسێك بکووژرێت کە هیچکات نەیبنیبوو؟

– خاڵێکی دیکە هەیە کە دەبێ بۆتی شی بکەمەوە. ڕەنگە لەم قسەیەی من تووشی سەرسووڕمان بی. منی کە تووشی سەرسووڕان کرد. نزیك بە مانگێك دواتر، چومە ماڵی باوکم لە ویلتشایر(١٩٤). زۆر خاڵی ئەمنی و پاراستن هەبوو کە دەبوایە لێی ئاگادار بم بۆئەوەی ئەگەر جارێکی دیکە دوویشك ویستی لە تەڵەم باوێ، ئەوا بەرگریی لەخۆم بکەم.

ئێستا ئاوی ناو قوورگی قووت دا.

– باوکت لەوێ بوو.

---

194 -Wiltshire

- چی؟
- من زووتر لە کاتی دیاریکراو گەیشتبوومێ. کاتێك چوومە ژوورەوە، باوکت دەیویست ئەوێ جێبهێڵێت. ئەو لەگەڵ باوکم یەکتریان بینیبوو.
- بەلام ئەمە کە....
- بەڵێ، دەزانم. واپێدەچی خەون بێت، بەلام لەوە دوودڵ نیم کە خۆی بوو. ئەو خێرا منی ناسییەوە.
- *ئەحواڵتان چۆنە؟*
- *باشم، زۆر سوپاس.*
- *خۆشحاڵم لەوەیکە توانیم یارمەتیت بدەم. ئاگاتان لە خۆتان بێت.*
- ئەمە رێك ئەو قسانە بوون کە باوکت بە منی وت. هەموو وشەکانیم لەبیرە. دوایی سواری ئۆتۆمبێلەکەی بوو و رۆیشت.
- کەواتە، باوکی من ....

جێمز ئەدێر لەسەر کورسی هەستا و وتی:

- بێشك خاتوو جۆنز دەتوانێ هەموو شتێکت بۆ بگێڕێتەوە. بەلام باوکم داوایکرد پێت بڵێم کە ئێمە هەموومان قەرزداری تۆین و تۆ کارێکی گەورەت کردووە. باوکت گیانی منی رزگار کرد، ئەوە هیچ شك و گومانێکی تێدا نییە. من ئێستا ژیانی هاوسەریم پێکهێناوە و دوو منالم هەیە. رەنگە خراپ نەبێ بزانی کە ناوی کوورە گەورەکەم جۆنە و ناوی باوکتم لێیناوە. ئەگەر سەبارەت بە باوکت نەبوایە، باوکم هیچکات خاوەنی کوور و نەوە نەدەبوو. نازانم لەبارەی باوکتدا چیان پێ وتووی، بەلام جۆن رایدەر زۆر بەغیرەت بوو.

جێمز ئەدێر سەرێکی بەرامبەر بە خاتوو جۆنز راوەشاند و لە ژوورەکە چووە دەرەوە و دەرگاشی لەپشت خۆی پێوەدا. بێدەنگییەکی زۆر ژوورەکەی گرتەوە.

ئەلێکس وتی:

- تێناگەم.

خاتوو جۆنز وتی:

- باوکت مرۆڤکووژ نەبوو. ئەو بۆ دووپشك کاری نەدەکرد. بۆ ئێمە کاری دەکرد.

- پۆلیسی نهێنی بوو؟

ئالان بلێنت وتی:

- پۆلیسێکی نهێنی ئایدیال. ئێمە هەر دوو برا "ئیان و جۆن"مان پێکەوە دامەزراند. ئیان پۆلیسێکی نهێنی باش بوو، بەڵام جۆن زۆر لە ئەو باشتر بوو.

- بۆ ئێوە کاری دەکرد؟

- بەڵی.

- بەڵام ئەو خەڵکێکی زۆری کووشت. خاتوو رۆدمەن ئەمەی بە من نیشان دا. ئەو لە زیندان بوو.

خاتوو جۆنز وتی:

- ئەو شتەی کە خاتوو رۆدمەن لەبارەی باوکت دەیزانی، هەڵە بوو. هەڵبەت راستە ئەو لەناو سوپادا بوو. لە شەڕی فالکلەندیش بەشداری کردبوو، بەڵام رووداوەکەی دیکە، یانی شەڕ لەگەڵ شوفێری تاکسی و سزادران بە زیندان، ئەمە پیلانی ئێمە بوو و ئێمە بۆمان دروست کرد.

ناومان نا "نهێنی گەورە"، ئەلێکس. دەمانویست جۆن رایدەر ببێتە ئەندامێکی باندی دووپشك و ئەوانیش لای خۆیان دایانمەزراند.

- بۆچی؟

- سەبارەت بەوەیکە دووپشك لە هەموو دونیادا خەریکی بەربلاوکردنی پلانەکانی بوو. خەریك بوو هەموو جیهان دابگرێت. دەبوایە ئەمە بزانین کە چی دەکەن، چ کەسانێك هاوکاریان دەکەن و کێ دادەمەزرێنن، رادەی تەشکیلاتیان چەندەیە. جۆن رایدەر پسپۆری چەك و چۆڵ بوو. ئەو شەڕکەرێکی بێ وێنە بوو. بە باوەشی کراوە وەردەگیرا.

- لە تەواوی ئەم ماوەیەشدا راپۆرتەکانی بەئێوە رادەگەیاند؟

- زانیاری و راپۆرتەکانی ئەو گیانی زۆر کەسی لە مردن رزگار کرد.

- بەڵام ئەمجۆرە نییە. خاتوو رۆدمەن وتی کە ئەو پێنج شەش کەسێکی کووشت. یاسین گرگوروویچیش ئەوی دەپەرست. ئەو جێ برینێکی نیشان دام و وتی باوکم گیانی رزگار کردووە؟

- باوکت وای دەنواند کە تاوانکارێکی مەترسیدارە و هەربۆیەش ناچار بوو کە کەسانێك بکووژێت. یەکێ لە قوربانییەکانی ئەو دەلاڵی ماددە هۆشبەرەکان لە دارستانی ئامازۆن بوو. جارێکیش سیخۆڕێکی دوولایەنەی ئەمریکی کووشت و سێیەمیان پۆلیسێکی فکەندەڵ و تاوانبار بوو. من ناڵێم ئەم کەسانە شایستەی کووژران بوون. دونیا بێ ئەوان بێ کێشەتر دەبوو. بەداخەوە، باوکت هیچ چارەیەکی دیکەی نەبوو.

- ئەی ئەوانیتر؟

- بلێنت وتی:

- دوو كەسی دیكەش بوون. یەكێكیان قەشەیەك بوو كە لە شەقامەكانی ریۆ دیٚ ژانیرۆ[195] كاری دەكرد و ئەویتریان ژنێك لە سیدنی بوو. ئێمە وامان دەرخست كە ئەوان كووژراون. بەلاّم ئەمە كووشتنێكی ساختە بوو. رێك وەكوو كووژرانی باوكت.

- ئالبێرت بریج....

خاتوو جۆنز وتی:

- بەرِادەی پێویست باوكت لەبارەی دووپشك زانیاری بە ئێمە گەیاندبوو. دەبوایە ئەو لە دووپشك و رووداوەكانی دوور بخەینەوە. دوو هۆی هەبوو. یەكەمیان ئەوەیكە دایكت تۆی ببوو. باوكت دەیویست بۆ ناو بنەماڵەكەی بگەرِێتەوە.. دەیویست لەگەڵ تۆ و دایكت بێت. بەلاّم زۆر مەترسیدار بوو.

ئەلێكس وەبیر قسەكانی جولیا رۆدمەن لە هوتێل كەوتەوە.

*من باوكتم زۆر خۆش دەویست. ئەو پیاوێكی زۆر جوان بوو.*

- ئەو بە منی وت باوكم لە مالتا دەستبەسەر كراوە.

خاتوو جۆنز وتی:

- نا، ئەویش ساختە بوو. جۆن رایدەر نەیدەتوانی دووپشك جێبهێڵێت. ئەوان ئەم رێگەیان پێنەدەدا. كەواتە كاتێك ئەویان بۆ ماڵتا نارد بۆئەوەی كەسی شەشەم بكووژێت، ئێمە لەوێ چاوەرِوانی بووین. شەرِێكی چەكدارانە رووی دا. ئێمە دەزانین لە چ كارێكدا لێهاتووییمان هەیە، ئەلێكس. یاسین لە ماڵتا بوو، بەلاّم لێكەرِاین ئەو رابكات. دەمانویست ئەو بە جولیا رۆدمەن بلێت كە چی رووی داوە. دوایی ئێمە جۆن رایدەرمان

---

[195] -Rio De Janeiro

دەستبەسەر کرد. وامان بیر کردەوە کە بڵێین ئەو زیندانی هەتاهەتایی بۆ بڕاوەتەوە یا لەدار دراوە.

ئەلێکس هێشتا بە تەواوەتی نەیدەزانی چی رووی داوە.

- بۆچی ئالبێرت بریج؟

بلێنتیش خۆی هاویشتە ناو قسەکانەوە:

- بارودۆخێکی دژوار بوو. تۆ سێر گراهام ئەدێرت بینیوە. ئەو پیاوێکی زۆر بەدەسەڵاتە. ئەو یەکێك لە هاوڕێیانی کۆنی منیشە. کاتێك دوویشك کووڕەکەیان رفاند، بیرمان لەوە کردەوە کە ئیتر هیچ کارێکمان لەدەست نایات.

خاتوو جۆنز بەردەوام بوو:

- ئەوە رای باوکت بوو. ئەویش سێر گراهامی دەناسی. دەیویست یارمەتی کردبێ. دەبێ ئەم بوارە درك بکەی. باوکت ئەمجۆرە پیاوە بوو. رۆژێك دەبێ بە تێروتەسەلی باس لە تایبەتمەندییەکانی باوکت بکەم. ئەو دەیویست دونیا شوێنێکی باشتر بێت.

خاتوو جۆنز هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.

- باوکت پێشنیاری دا کە لەگەڵ کووڕی سێر گراهام بیگۆڕینەوە. ئەو دەیزانی خاتوو رۆدمەن چ هەستێکی لەبارەیدا هەیە. دەیزانی کە ئامادە دەبێ بۆ وەرگرتنەوەی چاوپۆشی لە هەموو شتێك بکات. بەڵام باوکت دەیویست بەجۆرێك دوویشك فریو بدات. تفەنگدارێکمان لە شوێنێك دانا، بەڵام گوللەکانی مەشقی بوون. جۆن تەرەقەی لەناو پشتی کۆتەکەیدا جێسازی کرد. کیسەیەك خوێنیشی لەژێر کۆتەکەی دانا. کاتێك تەقە کرا، جۆن بۆخۆی تەرەقەکەی تەقاندەوە بۆئەوەی کۆتەکەی کوون بکرێ. ئەو خۆی هاویشتە ئەردەوە و وای نواند کە مردووە. ئێمە هیچکات تەقەمان

له باوکت نەکرد، ئەلێکس. هەربۆیەش بوو کە ویستمان جێمز ئەدێر ببینی. دەمانویست کارێك بکەین کە ئەو زۆر بەئاسانی و ئاسایی خۆی ون بکات.

ئەلێکس بە هەردوو دەستی سەری خۆی گرتبوو. سەدان پرسیاری هەبوو کە بیانپرسێت. دایکی، باوکی، جولیا رۆدمەن، پردەکە. هەوڵی دا کۆنترۆڵی خۆی بەدەست بێنێتەوە.

- دوو پرسیاری دیکەم هەیە.

- بپرسە، ئەلێکس.

- رۆڵی دایکم لەم بەرنامانەدا چی بوو؟ ئایا دایکم دیزانی باوکم چی دەکات؟

- بەڵێ، ئەو دەیزانی کە مێردەکەی پۆلیسێکی نهێنییە. باوکت هیچکات درۆی لەگەڵ نەکرد. ئەوان زۆر لەیەکتر نزیك بوون، ئەلێکس. بەداخەوە، من هیچکات دایکتم نەبینی. ئێمە بەپێی کار و پیشەکەمان هیچ حەزمان لە هاتووچۆ و نزیك بوونەوەی زیادە نییە. دایکت بەر لەوەی لەگەڵ باوکت ژیانی هاوسەری پێکبێنێ، پەرەستار بوو. ئایا ئەمەت دەزانی؟

ئیان رایدەر بە ئەلێکسی وتبوو کە دایکی نێرس (پەرەستار) بووە. بەڵام ئەو هیچی بەرووی خۆی نەهێنا. خۆی کۆنترۆڵ کرد تا هەستیارترین و ئەستەمترین پرسیاری خۆی بکات؟

- باوکم چۆن مرد؟ هەروەها دایکم؟ ئایا ئەوان هێشتا زیندوون؟ ئەوان چیان بەسەر هات؟

خاتوو جۆنز سەیری بلێنتی کرد بۆئەوەی وەڵامی بداتەوە.

- دوای رووداوەکەی ئالبێرت بریج بەم ئەنجامە گەیشتین کە باوکت بۆماوەیەکی زۆر دوورودرێژ پشوو وەربگرێت. دایکیشتی لەگەڵ چوو.

کارێکمان کرد کە هەردووکیان بە فڕۆکەیەکی تایبەتی بۆ باشووری فەرەنسا بنێرین. بڕیار بوو تۆش لەگەڵیان بچی، ئەلێکس. بەڵام لە دوایین کاتدا گوێت چڵکی کرد و ئەوان ناچار بوون تۆ لای پەرستارێکی منداڵ دابنێن. وابڕیار بوو هەرکات بارودۆخت باشتر بوو، لەگەڵ پەرستارەکەت بچییە لایان.

سێر بلێنت نەختێك بێدەنگ بوو. وەکوو هەمیشە حاڵەتی چاوەکانی هیچیان دەرنەدەخست. بەڵام داخ و ئازار لە دەنگییەوە دەباری.

– جولیا رۆدمەن بەجۆرێك پێیزانی کە فریوی خواردووە. ئەوەیکە ئەو چۆن ئەمەی زانی شتێکە کە نایزانین و هیچکاتیش نایزانین. بەڵام دووپشك تەشکیلاتێکی بەهێزە. تۆش ئەمە باش دەزانی. ئەو زانی باوکت زیندووە و دەیەوێ بۆ فەرەنسا بچێت. لەم روویەوە توانی بۆمبێك لە ئەمباری فڕۆکە دانێتەوە. باوکت و دایکت هەردووکیان لە رووداوی تەقینەوەی بۆمبێك لەناو فڕۆکەدا کووژران.

رووداوێکی هەوایی.

شتێك بوو کە هەمیشە بە ئەلێکسی وتبوو.

درۆیەکی دیکە.

ئەلێکس لە جێگەی خۆی بەرز بۆوە. رێك نەیدەزانی چ هەستێکی هەیە. لەلایەکی دیکەوە، خۆشحاڵ بوو کە باوکی پیاوێکی خراپ نەبوو و بەپێچەوانە زۆریش پیاوێکی باش بووە.

ئەوەی جولیا رۆدمەن پێی وتبوو، درۆ بوو. لەلایەکی دیکەوە، هەستێکی پڕ لە خەم بەسەریدا زاڵ ببوو. وەکوو ئەوە دەچوو بۆ یەکەمجار تازیەباری دایك و باوکێتی.

خاتوو جۆنز وتی:

- شوفێرێکمان گرتووە بۆئەوەی بۆماڵەوە بتباتەوە، ئەلێکس. هەرکات هەستت کرد ئامادەییت پەیداکردووە، ئەوا لەمبارەوە زیاتر قسە دەکەین.

- بۆچی باسی ئەم رووداوەتان بۆ من نەکردبوو؟ ئەوەندەی نەمابوو بتکووژم. ئێوە وەکوو باوکم منتان نارده لای دووپشك. پێتان نەوتم جولیا رۆدمەن باوکمی کووشتووە. بۆچی پێتان نەوتم؟

خاتوو جۆنزیش لەسەر کورسییەکەی هەستابوو.

- بۆ دۆزینەوەی دیشەکان پێویستیمان بە یارمەتی تۆ هەبوو. هەموو شت بە بێ شك و دوودڵی پەیوەندی بەتۆوە هەبوو. بەلاّم نەماندەویست کەڵکی نابەجێت لێوەربگرین. بەلاّم ئەگەر راستییەکەمان پێ وتبای و تۆمان بۆلای دووپشك ناردبا، ئەوکات بە خراپترین شێوە کەڵکی نابەجێمان لێوەرگرتبووی. تۆ رێك بەهەمان هۆ چوویتە لای دووپشك، کە باوکت چووبووە سەر پردی ئالبێرت بریج.

- بەلاّم من بە دەمانچەوە بۆ ماڵی ئێوە هاتم.

- من هیچکات لە مەترسیدا نەبووم. جگە لە دیوارە شووشەییەکە، دەمزانی ناتوانی خۆت رازی بە کووشتنم بکەی.

بۆماوەیەکی زۆر کەس هیچ قسەیەکی نەکرد.

ئەلێکس گەڕایەوە.

- دەبێ لەگەڵ خۆم تەنیا بم.

- هەڵبەت.

خاتوو جۆنز دەستی ئەلێکسی گرت.

- هەرکات ئامادە بووی، بگەڕێوە، ئەلێکس.

- بەڵێ، ئەمکارە دەکەم.

ئەلێکس بۆلای دەرگا ڕۆیشت و کردییەوە. بەڵام وەکوو ئەوەی بیری لە شتێک کردبێتەوە.

– دەتوانم دوایین پرسیارم بکەم، خاتوو جۆنز؟

– بەڵێ، بێشك.

– پرسیارێکە هەمیشە لەمێشکم دایە.

ئەلێکس نەختێك وەستا.

– ناوی بچووکی ئێوە چییە؟

ئالان بلێنت سەری بڵند کرد.

– ناوم تیولیپ[196]ە. باوك و دایکم باخەوان بوون.

ئەلێکس سەری راوەشاند. مانادار بوو.

ئەلێکس لە ژوورەکە هاتەدەر و دەرگای لەپشت سەری خۆی پێوەدا.

---

[196] - Tulip

## پەیوەندییەکی دایکانە

دووپشك هیچکات لەبیری نەدەکرد.

دووپشك هیچکات نەدەبوورا.

پارەی دابوو بە تاك تیرهاوێژێك کە تۆڵە بستێنێتەوە، ئەوە کارێك بوو کە دەیکرد. ئەگەر شکستی خواردبا، ئەوا ژیانی خۆی لەدەست دەدا. ئەو دەیزانی کە تا چەند خوولەکی دیکە کوڕێکی چواردەساڵە لە بینایەك دێتەدەرێ کە واپێدەچوو بانکی نێونەتەوەیی بێت و لەڕاستیشدا بانك نەبوو. ئایا بۆی گرنگ بوو ئامانجەکەی کوڕێکی مێرمنداڵە؟ ئەو خۆی رازی بەوە کردبوو کە هیچ جیاوازییەکی بۆ ئەو نییە. کوشتنی مرۆڤێك کارێکی مەترسیدار بوو. بەڵام ئایا جیاوازی هەبوو کە پیاوێکی بیست و حەوت ساڵە بکووژرێ تا هیچکات بە تەمەنی بیست و هەشت ساڵی نەگات، یا منداڵێکی چواردەساڵە بکووژێت کە نەبێتە پازدە ساڵە. تاك تیرهاوێژ بەم ئەنجامە گەیشتبوو کە کوشتن، کوشتنە. جیاوازیشی نییە. بۆ ئەمکارە پەنجا هەزار پاوندی وەردەگرت.

وەکوو هەمیشە، ئەو نیشانەی لە دڵ دەگرت. ئەمجارە ئامانجەکەی نەختێك بچووکتر بوو، بەڵام ئەو کاری خۆی دەکرد. ئەو هیچکات شکستی نەخواردبوو. کاتی ئەوە هاتبوو خۆی ئامادە بکات. دەبوایە هەناسەی کۆنترۆڵ بکات. دەبوایە هێوری و ئارامی بە هەستی خۆی بەخشیبا.

سەیری ئەو تفەنگەی کرد کە لەناو دەستیدا بوو. تفەنگەکە دوو تایبەتمەندی گرنگی هەبوو. یەکەمیان ئەوەیکە سووك بوو و دووهەمیان ئەوەیکە رێکوپێك بوو. دەیتوانی بە کردنەوەی دوو برغوو لولە و ماشە لەیەکتر جیا بکاتەوە.

رووی لولەی تفەنگەکەی لەم دەرگایە گرتبوو کە کوورە مێرمنداڵەکە بڕیار بوو لێی بێتە دەرەوە. ئەو چێژی لەوە وەردەگرت کە تفەنگێکی بەدەستەوەیە.
بکووژەکە رەزامەندانە خۆی ئامادە کردبوو. کاتێك پەنجەی دەنایە سەر پەلاپیتکەی تفەنگەکە، گوللە بە خێرایی سێ سەد و سی و یەك مەتر لە چرکەدا لە لولە دەهاتەدەر. ئامانج گرنگ نەبوو. تەنانەت ئەم پارەیەی کە سەبارەت بە کووشتنەکە وەریگرتبوو، ئەویش بەلایەوە گرنگ نەبوو. گرنگ کووشتن بوو. لە هەموو کارێکی باشتر بوو.
چاوەڕوان مایەوە. ئەو لەسەر سك لەسەرووی بینایەکی ئیداری لەملای شەقامەوە راکشابوو. زۆر بەلایەوە سەیر بوو کە ئاوا بەئاسانی ترانیبووی بگاتە سەر ئەم بینایە. بینای رووبەڕووی ئەو، بنکەی چالاکیی تایبەتی (ئێم ئای٦) بوو کە واپێدەچوو بیناکانی دەوروبەر لەژێر چاوەدێریدا بوون.
دەرگا کرایەوە و ئامانج هاتە دەرەوە.
ئەم ئامانجە ناوێکی هەبوو: ئەلێکس رایدەر. بەڵام بکووژەکە بەلایەوە گرنگ نەبوو. ئەو تەنانەت ئەلێکسی وەکوو کوورێك وەبەرچاو نەدەگرت. ئەو دڵێك و دوو سیی و کۆمەڵێك دەمار و ماسوولکەی هەبوو. بەڵام دوای ماوەیەکی کوورتی دیکە لەناو دەچوو. بکووژەکە هەر بۆ ئەم مەبەستەش بۆ ئەوێ هاتبوو. هاتبوو بۆئەوەی نەشتەرگەرییەك بکات، ئەویش نە بە چەقووی نەشتەرگەر، بەڵکوو بە فیشەکێك.
لێوەکانی گەست و زۆر بە وردی سەیری ئامانجەکەی کرد. پەنجەی لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگەکەی بوو و ئارامی و هێوری پەیدا کرد. لە چێژوەرگرتن و ئارامی تەواودا ئامادەی تەقەکردن بوو.

ئەلێکس رایدەر پێی نایە ناو شەقام. کاتژمێر پێنجی دوانیوەڕۆ بوو و چەند کەسێك لەناو شەقامدا بوون. بیری لەو قسانە دەکردەوە کە لەناو ژووری بەڕێز بلێنت پێیان وتبوو. هێشتا دەبوایە لە زۆر شت تێبگات. باوکی مرۆڤکووژ نەبوو. ئەو پۆلیسێکی نهێنی بوو کە بۆ (ئیم ئای٦) کاری دەکرد. جۆن رایدەر و ئیان رایدەر. هەردووکیان پۆلیسی نهێنی بوون و ئێستاش ئەلێکس رایدەر. لانیکەم پەیوەندیان بە بنەماڵەیەکەوە بوو.

هێشتاش....

خاتوو جۆنز پێی وتبوو کە خۆی هەڵبژێرێت. بەڵام ئەو بڕوای وانەبوو کە هەمیشە ماڤ هەڵبژاردنی هەیە. بەڵێ، ئەو هەڵیبژارد کە ئەندامی دووپشك نەبێ. بەڵام ئەوە بەم مانایە نەبوو کە تەمەنێك بۆ (ئیم ئای٦) کار بکات. ئالان بلێنت بێشك دەیویست دیسان دووبارە کەڵکی لێوەربگرێت. لەوەدا هیچ شك و گومانێك نەبوو. بەڵام رەنگە هێز و توانایی ئەوەی پەیدا دەکرد کە ئەم داواکارییە رەت بکاتەوە. رەنگە زانینی راستییەکان بۆ ئەو بەس بوو.

جۆرەها بیرکردنەوەی گێژکەرەوە بە هزریدا دەهات. بەڵام ئەو پێشاوپێش بڕیارێکی دابوو. دەیویست لە ماڵەوە و لای جەك بێت. حەزی دەکرد ئەرکەکانی قووتابخانە لەبیر بکات و بچێت و سەیری فیلمێکی سینەمایی بکات. بچێتە رێستۆرانتێك و خواردنی شەو بخوات. وتبووی کە تا کاتژمێر شەش بۆ ماڵەوە دەگەڕێتەوە. بەڵام رەنگە دەیتوانی تەلەفۆن بۆ جەك بکات و لە شوێنێکی ناو شەقام بیبینێ. رۆژی شەممە بوو. رۆژی پشوو بوو. ماڤ ئەوەی هەبوو نەختێك بیگوزەرێنێت.

هەنگاوێکی نایەوە و وەستا. شتێکی بە سینگی کەوتبوو. بەوە دەچوو کە کەسێك بە مست لێیدابێ. سەیری لای چەپ و راستی خۆی کرد، بەڵام کەسی لێ نزیك نەبوو. چەندە سەیر بوو.

ئێستا ڕووداوێکی دیکە ڕووی دا. شەقامی لیڤەرپول واپێدەچوو سەراوبن بووبێت. ئەو دەیزانی کە ئەم شەقامە ساف و ڕێکە، بەڵام بێشك ئێستا ئەمجۆرە نەبوو. تەنانەت بیناکانیش بۆلایەك خوار ببوونەوە. ئاگاداری ئەوە نەبوو کە چی ڕووی داوە. هەوای ئاسمان دەگۆڕا. کاتێك بەباشی سەیری کرد، بینی دونیا لە ڕەنگاوڕەنگ بۆ ڕەش و دوایی بۆ سپی گۆڕا.
هەروەها سوورایی خوێن. سەیرێکی خوارەوەی کرد. پێش جلەکانی سوور ببوو. لەژێر جلەکانی ڕووداوێکی تایبەت ڕووی دابوو. دەنگی ترایفلایت بێدەنگ بوو. واپێدەچوو شتێك ئەوی لەم دوونیایەدا کێشابێتە دەرەوە و ئێستا لە مەودایەکی دوور ئەم ڕووداوە دەبینێت. چەند کەس وەستابوون و سەیری ئەویان دەکرد. جوڵابوونەوە. ژنێك دەیقیژاند، بەڵام ئێستا قیژەکەی دەنگی نەبوو. واپێدەچوو شەقام سەراوبن بووە. ژمارێك لە خەڵك لە دەوری کۆ ببوونەوە. سی چل کەسێك دەبوون و ئاماژەیان بەئەو دەکرد. بۆچی تا ئەوڕادەیە حەزیان لەئەو بوو؟ باشە بۆچی ئیتر ناتوانێ خۆی بجووڵێنێ؟ دەمی کردەوە بۆئەوەی داوای یارمەتی بکات، بەڵام دەنگێ لەدەمی نەهاتەدەرێ.
ترس ئەلێکسی داگرت. ژانی نەبوو. بەڵام وای هەست دەکرد شتێکی دەگمەنی بەسەر هاتووە. لەسەر پیادەڕۆ ڕاکشابوو، بەڵام نەیدەزانی بۆچی لەوێ ڕاکشابوو. بازنەیەکی سووری لە دەوری بوو کە هەر دەهاتوو گەورەتر دەبوو. هەوڵی دا خاتوو جۆنزی بانگ بکات. دووبارە دەمی کردەوە و بانگ کردنی کەسێکی دیکەی گوێ لێبوو، بەڵام لەوری دوور بوو.
دوایی دوو کەسی بینی و زانی هەموو شت ڕاست و دروستە. ئەوان لە حاڵەتێکی پڕ لە پەژارە و خەم و درك سەیریان دەکرد. واپێدەچوو هەمیشە چاوەڕوانی ڕووداوێکی ئەمجۆرەیان هەبوو، بەڵام ئێستا لە ڕوودانی ئەم ڕووداوە بەداخ بوون. هێشتا ڕەنگێکی کەم بە ڕووخساری

خەڵکەکەوە مابوو، بەڵام ئەم دووە بە تەواوی ڕەش و سپی بوون. پیاوەکە زۆر جوان بوو. ئۆنیفۆرمی سەربازی لەبەر بوو و ڕووخسارێکی زۆر جددی هەبوو. زۆر بە ئەلێکس دەچوو، هەرچەند پێدەچوو سەرەتای سی ساڵی خۆی تێدەپەڕێنێت. ئەم ژنەی کە لەلای وەستابوو، کورتەباڵاتر بوو و ناڕەحەتتر و خەماویتر دیار بوو. مووەکانی درێژ بوو و چاوەکانی پڕ لە پەژارە بوون. ئەلێکس وێنەی ئەم ژنەی بینیبوو و ئێستا کە دیدیت لەوێ وەستاوە، بەلایەوە زۆر سەیر بوو. ئەو دەیزانی کە سەیری دایکی دەکات. هەوڵی دا بەرز بێتەوە، بەڵام نەیتوانی. ویستی دەستی بگرێت، دەستی توانای ئەم کارەی نەبوو. ئیتر هەناسەی نەدەکێشا، بەڵام هەستی بەوە نەدەکرد.

ژن و پیاوەکە لەناو دڵی جەماوەرەوە هاتنە دەرێ. پیاوەکە هیچی نەوت. هەوڵی دەدا هەستی خۆی کۆنترۆڵ بکات. بەڵام ژنەکە لە تەنیشتی چۆکی دادا و دەستی بۆلای درێژ کرد. ژنەکە بە دەستەکانی لەمسی کرد و پەنجەی لەسەر ئەم شوێنە دانا کە کوونێکی بچووک لەوێ لەسەر کراسەکەی پێک هاتبوو.

هیچ ژانێك لەئارادا نەبوو. هەرچی بوو، هەستێکی پڕ لە ماندوویی بوو. ئەلێکس رایدەر بزەیەکی هاتێ و چاوەکانی پێکەوەنا.

کۆتایی

قارەمانێکی کامڵ......"چیرۆکێکی بێ وێنە لە سەدەی بیست و یەکەمدا" (دیلی تێلگراف)

"ئایا کەس هەیە لە سەرکێشییەکانی ئەم جێمزباندە گەنجە بەوپەڕی چێژ نەگات؟" (دیلی میل)



ئەلێکس رایدەر، چواردە ساڵە، سیخوڕی هەمیشە نارازی... تووشی مەترسیدارترین ململانێ بووەتەوە.
ژەنەڕاڵی رووسی "زاروف" لە دوورگەیەکی تایبەتی نزیک کوبا، خەریکی پلانێکی تەقینەوە بۆ نوێکردنەوەی مێژوویە.
بەڵام ئەلێکس، تاک و تەنیا، تەنیا بە سوود وەرگرتن لە ئامێری دەستکرد و سەرەتایی، دەبێ لە دواین چرکەساتدا پێش لە ناوچوونی دونیا بگرێت و فریوی بدات.

# Scorpia

ANTHONY HOROWITZ

T: MUHAMAD SHAHDI

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ئاوێر ژمارە (٧٢)

چاپخانەی رۆژهەڵات/هەولێر

بەرگ: ئاکار جەلیل کاکەوەیس